

# گۆڤاری ئەکادیمیای کوردی

ژمارە (٢٥) ساڵی ٢٠١٣

## لەم ژمارەیەدا

### بەشی کوردی



### بەشی عەرەبی – القسم العربي

# ڕێنماییەکانی بڵاوکردنەوە
# لە گۆڤاری ئەکادیمیای کوردی

١- گۆڤـاری ئەکادیمیـای کـوردی، کە گۆڤارێکـی زانسـتیی وەرزییە، باس و توێژینەوەی زانستی لە بارەی کورد و کوردستان، دوای ئەوەی هەڵسەنگاندنی زانسـتییان بـۆ دەکرێت، بـڵاو دەکاتەوە، بۆیـە دەبێ هەمـوو مەرجەکانی ڕێبازی لێکۆڵینەوەی زانسـتییان تێدا ڕەچاو کرابێـت. لێکۆڵینەوەکەش، کە مەرجە لە بارەی کێشەیەکی زانستییەوە بێت و بیرۆکە و لێکدانەوەی نوێی تێـدا بـێ، دەبێ لە هیچ شـوێنێکی تر بڵاو نەکرابێتەوە، یـا بۆ بڵاوکردنەوە وەرنەگیرابێت.

٢- زمانـی کوردی زمانـی سـەرەکی بڵاوکردنەوەیە لە گۆڤـاری ئەکادیمیای کـوردی ، بەڵام ڕێگـەش دەدرێ لێکۆڵینـەوەی بە نرخ بە هـەردوو زمانی عەرەبی و ئینگلیزی بڵاوبکرێنەوە..

٣. هـەر بابەتێـک کـە بۆ گۆڤـاری ئەکادیمیای کـوردی دەنێردرێ ، پێویسـتە ناوونیشانی باس، ناوی نووسەر، شوێنی کارەکەی، پلە و پایەی زانستی لە سەر لاپەڕەی یەکەمی لێکۆڵینەوەکە نووسرابێت.

٤. دەبـێ پوختەیەکـی باس، بە هـەردوو زمانەکەی دی، لە کۆتایی باسـەکەدا بنووسـرێت. ناشبێ پوختەکە لە ١٥٠ وشە زیاتر بێت و پێویستیشە توێژەر لەو پوختەیەدا گرنگی و ئەنجامەکانی باسەکە بخاتە ڕوو.

٥- هەر کاتێ باس، لە لایەن هەڵسەنگێنەرانی زانستییەوە، بە ئەرێنی گەڕایەوە، ئەوا دەسـتەی نووسـەران ڕەزامەندینامەی بڵاوکردنەوە بـە توێژەرەکەی دەدات.

٦- هەموو باسـەکان بیر و بۆچوونی نووسـەرەکانیانن و مەرج نییە بیروڕای دەستەی نووسەران بن.

٧- بـۆ ئـەوەی بابەت لەگەڵ ڕێنمایی و شـێوازی بڵاوکردنـەوەی گۆڤارەکەدا کۆکبێ، دەستەی نووسەران مافی سەرلەنوێ داڕشتنەوە و لابردنی هەندێ دەربڕین و دەستەواژەی هەیە، ئەوەش بە مەرجێ واتاو بیرۆکەی سەرەکیی توێژینەوەکە نەگۆڕێت.

٨. ئەگەر باسەکە لە بارەی پەیدۆزیی (تحقيق)ی هەر دەستنووسێکەوە بێت، ئەوا بنەماو ڕێبازە زانستییەکانی ئەم بوارە پەیڕەو دەکرێن و شەش لاپەڕەی کۆپیکراو لە دەستنووسەکە لەگەڵ باسەکەدا هاوپێچ دەکرێن.

٩. پەیڕەوکردنی ڕێبازی لێکۆڵینەوەی زانستی لە هەڵبژاردنی ناوونیشانی باس، توێژینەوەی بابەت، شێوازی بەکارهێنانی سەرچاوە و ڕێکخستنی پەراوێزەکان مەرجی بڵاوکردنەوەیە. هەر باسێک ئەم بنەما زانستییانەی تێدا فەرامۆش کرابێت، لە گۆڤاری ئەکادیمیای کوردیدا بڵاوناکرێتەوە.

١٠. باسەکە، لە پاڵ دانەیەکی سەر CD، بە سێ دانە لە سەر کاغەزی (A٤) چاپ دەکرێت بە مەرجێ ژمارەی لاپەڕەکانی، بە وێنە و نەخشە و لیستی سەرچاوەکانییەوە، لە (٢٥ ) لاپەڕە زیاتر نەبن و بە فۆنتی (١٥)بن و بە Ali-K- Sahifa نووسرابن.

١١. ئەگەر بابەتەکە وەرگێڕدرا بوو، دەبێ پەیوەندی بە لایەنێکی کولتووری کوردییەوە هەبێت (زمان، ئەدەب، مێژوو، ... هتد). مەرجیشە کە وەرگێڕانەکە لەو زمانەوە بێت کە لە بنەڕەتدا بابەتەکەی پێ نووسراوە. پێویستە دەقە ئەسڵەکەش هاوپێچ بکرێت.

١٢. لەکاتی پێویستدا گۆڤاری ئەکادیمیای کوردی بەشێکی تەرخان دەکات بۆ خوێندنەوە و هەڵسەنگاندنی ئەو کتێبانەی لەبارەی کورد و کولتووری کوردییەوە نووسراون چ بە کوردی یان بە هەر زمانێکی دیکە، بە مەرجێک نووسەر ڕەچاوی پێوەرو ڕێبازی لێکۆڵینەوەی زانستی تیایدا بکات.

# چیرۆکە هەواڵ
# لە نێوان بۆتە و زماندا

پ. د. محەمەد مەعرووف فەتاح

## پێشەکی

ئەم لێکۆڵینەوەیە کە ئەم ناونیشانەی سەرەوە لە خۆ دەگرێ لە بنچینەدا دەچێتە بواری شیکردنەوەکانی ماکرۆ پراگماتیك، ناونیشانی بابەتەکە وا دەکات کە شیکردنەوە و لێکدانەوەکان لە دوو گۆشەنیگاوە دەست پێ بکات. ١. لایەنی بنەماکانی چیرۆك وەك ڕیزبوونی کات و ڕووداوەکان و داڕشتن و گەمەکردن بە وشەو تەمومژاوی کردنی هەواڵەکان و ڕەواندنەوەیان لە ترۆپکی ئەو گرێیەی خوێنەر خاوی دەکاتەوە. ٢. لایەنی میدیاکاری و بنەماکان و بەزاندنی بنەما پراگماتیکییەکان. میدیا خۆی لە خۆیدا لە شیکردنەوەی پراگماتیکی ژێر سایەی پراگماتیکی فراوان لەپاڵ ڕەوانبێژی کەلتوور و ڕوونبێژی هەواڵەکاندا بۆتەیەك لە بەرگی زمان و زمانەوانی بۆ چیرۆکە هەواڵ دادەڕێژێ.

ئەم لێکۆڵینەوەیە بەسەر چەند تەوەرەیەکدا دابەش دەبێت گرینگترینیان ئەمانەن:

١. چیرۆکە هەواڵ، ناساندن و تایبەتییەکان، بۆتەکانی چیرۆکە هەواڵ.

٢. زمانی هەواڵنووسی لەنێوان منێتی و بابەتیدا.

٣. ئەگەرەکانی زمان و نواندنی دنیای ڕووداوەکان.

سەبارەت بەو نموونانەی لێرەدا شی کراونەتەوە، وەرگیراوی ڕۆژنامە و گۆڤارەکانی کوردستانی نوێ – برایەتی –ڕووداو – لڤین – هاولاتی.......

ئەوەی ماوە لێرەدا باسی بکەین کەوا ئەو لێکۆڵینەوەی مامۆستای گەورەمان خوالێخۆشبوو بەر لە کۆچی دوایی خۆی و بەر لەوەی بواری بڵاوکردنەوەی هەبێ، ڕادەستی بەڕێز (د. شێرکۆ حەمەدەمین)ی کردبوو بۆ ئەوەی

سوودی لێ وەرگرێت بۆ نامەی دکتۆراکەی، بەڕێزیان زۆر وەفادارانە بەئێمەی گەیاندەوە تا بلاّوی بکەینەوە.

**پ. ی. د. سەباح ڕەشید**

**١/ چیرۆکە هەواڵ:**

ئەو هەواڵانەی ڕۆژنامە و گۆڤارەکانە کە بە زۆری.

(١) گرنگترین زانیاری لە دێرەکان و بەندەکانی پێشەوەدا دەدەن بە دەستەوە، تەنانەت ئەگەر چیرۆکی لەغزیش بن لە پێشەوە لەغزەکە چارە دەکەن و لە بەندەکانی دواتردا ڕوونی دەکەنەوە چی و چۆن ڕووداوەکە سەری هەڵدا، یان ئەگەر چیرۆك بێت لەبارەی تاوانەوە دیسان بە ئەنجام دەست پێدەکات.

(٢) هەموویان هەوڵ دەدەن وەلاّمی چەند پرسیارێك بدەنەوە وەك کێ، چی، کەی، لەکوێ، بۆ و چۆن.

(٣) خاوەنی چەند تایبەتییەکن وەك: هەنووکەیی (هەواڵەکە بەم زووانە ڕوودەدات یان تازە ڕووی داوە، یان لە کۆندا ڕووی داوە بەلاّم سالاّنەیەتی) وەلاّمە بۆ پرسیارێکی وەك: بۆ ئێستە ئەم ڕووداوە دەگێڕێتەوە؟ (ب) نزیکی لە شوێنی ڕووداوەکەوە بە جۆرێك کە سەرنجی خەڵکی ناوچەکە ڕابکێشێ و بەلایانەوە گرنگ بێت (ج) سروشتێکی نائاسایی هەبێت، واتا لەبارەی ڕووداوێکەوە بێت کە سەیر بێت و بە دەگمەن ڕووبدات یان وەها بێت کە شایانی ئەوە بێت ببێتە هەواڵ (د) کەسەکانی ڕوویەکی کۆمەلاّیەتی بن، واتا ناسراو یان ناوداربن، ئەوانەی کە ناوبانگیان هەیە لەبەر هەر هۆیەك بێت، کارامەیی، خراپی یان چاکی (و) نزیکی لە مرۆڤایەتی، واتە لە بارەی ئازار و خۆشی و ناخۆشی و کارامەیی و دەستکەوتی مرۆڤەوە بێت، ئەوانەی کە دەیانەوێ خراپەکانی کۆمەڵ چاك بکەن یان بەسەر کۆسپێکدا سەرکەون (ن) گێژەن، واتە لەبارەی خیلافاتی خەڵکەوە بێت لەناو خۆیاندا یان لەگەڵ دەسەلاّتێکدا، بە تایبەتی ناوچەیی. (ی) کاریگەری، واتە هەواڵەکە دەبێ کاردانەوەیەك لە ناو خوێنەرەکانیدا دروست بکات.

(٤) جگە لەو تایبەتییانەی سەرەوە چیرۆکە هەواڵ دەشێ خاوەنی چەند تایبەتییەکی لاوەکی بێت وەك (١) خۆشی هێن، واتە خەڵك ژیر بکات یان

یاریدەیان بدات خۆشی لە ژیان یان پشوو ببینن (٢) سوود گەیەنی، واتە خەڵك فێری شتێكی بە كەلك بكات یان سوودی هەبێت لە ڕووی تەندروستی یان ئابووری.

(٥) چیرۆكە هەواڵ خاوەنی پێكهاتەیەكی تایبەتییە، بەزۆری پێكهاتووە لە چەند بەشێك، كە گرنگترینیان ئەمانەن:

١. **سەردێر:** ئەو دێرەی كە لە پێشەوە دێ و كورتەی هەواڵەكە ڕادەگەیەنێ لە چەند وشەیەكدا یان بەڕستەیەكی سادە، لە هەندێ ڕۆژنامەدا بەدوای ئەمەشدا كورتەیەك دێ كە وردەكارییێكی زیاتر لەسەردێر دەدات بە دەست ( Deck head)

٢. **سەرەتا:** سەرەتای هەواڵەكەیە ئەو قولاپەیە كە هەواڵی پێدا هەڵدەواسرێ سەرەتای باش سەرنجی خوێنەر ڕادەكێشێ و هانی دەدات هەواڵەكە تا دوایی بخوێنێتەوە و بڕوات لە گەڵیدا، ئەمیش دیسان ڕەنگە لە یەك ڕستە یان دێر پێك بێت، كە گرنگترین زانیاری لە بارەی هەواڵەكەوە پێیە.

٣. **ڕاڤە:** ئەو زانیارییەیە كە دوای سەرەتادا دێت، پشتگیری لێ دەكات و دەبێتە بەڵگە بۆی. لە ڕاڤەدا هەموو ئەو بەڵگە و قسە و گەواهانە دێت كە پشت لە (سەرەتا) دەگرن و ڕوونی دەكەنەوە.

٤. **كاردانەوە:** هەندێ ڕۆژنامە چەند دێرێك یان بەندێك بۆ كاریگەریی هەواڵەكە لەسەر خەڵكی یان كاردانەوەی لەناو خەڵكدا تەرخان دەكات.

٥. **دانەپاڵ:** لێرەدا هەواڵنووس سەرچاوەی یان سەرچاوەكانی زانیارییەكەی ڕوون دەكاتەوە، وەڵامە بۆ پرسیاری وەك چۆنت زانی؟ چۆن بزانم ڕاست دەكەیت؟ كێ وا دەڵێ؟ كێ دەڵێ وەهایە؟

٦. **زەمینە:** لەم بەشەدا هەواڵنووس لە مێژووی یان زەمینەی ئەو هەواڵانە دەدوێ كە پێشتر سەرەتایەكیان هەبووە كە دەبێ خوێنەر بیزانێ تا لە چیرۆكە هەواڵەكە بگات یان سەرنجی ڕاكێشێ.

٧. **كۆتایی:** ئەو بەشەی چیرۆكە هەواڵەیە كە كۆتایی بە هەواڵێك دێنێ بە دێرێك یان چەند دێرێك كە بریتییە لە قسەیەك یان ڕوونكردنەوەیەك كە جارێكی تر

کورتەی هەواڵەکەیە، بێ ئەوەی زانیارییەکانی پێشتر دووپات بکاتەوە یان ڕوونکردنەوەی زیاتر بدات.

* دەکرێ بگوترێ چیرۆکە هەواڵ لە سێ بەشی سەرەکی پێك دێ: سەردێر و تەن و کۆتایی، بە مەرجێ بزانین کە تەن لە خۆیدا بەشێکی فرەکەرتە سەرەتا و کاردانەوە و دانەپاڵ و ڕاڤە و زەمینە دەگرێتە خۆی.
* مەرج نییە هەموو چیرۆکە هەواڵێك هەموو ئەو بەشانەی تێدا بێت: دەشێ یەکێك یان زیاتر لەم بەشانە لە چیرۆکە هەواڵێکدا دەرنەکەون. بەلاَم چیرۆکە هەواڵی نموونەیی هەموو ئەو بەشانەی تێدا دەردەکەوێ.

### ٢/ بۆتەکانی چیرۆکە هەواڵ:

هەواڵنووس دەبێت چیرۆکە هەواڵەکەی بەجۆرێك ڕێك بخات کە لە خزمەتی خوێنەردا بێت: واتە زانیارییەکانی ناو هەواڵەکە دەبێ بەشێوەی مەنتیقی ڕیز بکرێن، بەجۆرێك کە هەر بەشێك لە زانیارییەکان ڕێگە بۆ ئەویتر خۆش بکات واتە بێت کە بەسەر یەکدا بکەون و سەر لە خوێنەر بشێوێنن. هەواڵنووس چیرۆکەکە لە هەر بۆتەیەکدا ڕێك بخات دەبێ خوێنەری لەبەر چاوبێت و چەق و گێژەن و زەمینە و چارەسەری بخاتە بەردەست. چیرۆکە هەواڵ لە چەندین شێوەی جیاجیادا دەبینرێ کە بلاَوترینیان ئەمانەی خوارەوەن.

**(١) هەرەمی هەڵە و گەڕاو:**

بلاَوترین بۆتەیە، لەسەرەتایەك پێك دێ کە چەقی هەواڵەکە ڕادەگەیەنێ و بە دوایدا بەڵگەنامە و زانیاری پشتگیری دێ، کە بەپێی گرنگی لە خوارەوە تا سەرەوە ڕیز دەکرێن. لەوانەشە کۆتایی هەبێت بەم شێوەیەی خوارەوە:

سەرەتا ⟵ بەڵگەکان ⟵ کۆتایی.

**(٢) بۆتەی ڕۆژنامەی وەڵتریت جیرناڵ:**

ئەم بۆتەیە لەسەر بنەمای لە تایبەتییەوە بۆ گشتی دەڕوات. بەزۆری بەسەرەتایەك دەست پێدەکات کە گێڕانەوەی ڕووداوێکە کە ڕۆشنایی دەخاتە سەر کەسێك یان ڕووداوێك کە کێشەکە ڕوون دەکاتەوە لەشێوەی وێنەیەکی کورتدا. تەنی هەواڵەکە بەپێی بابەت ڕێکدەخرێ بەجۆرێك کە هەر خاڵێکی ڕێگە

بۆ ئەویتر خۆش دەکات. کۆتایی ئاسایی بازنەکە تەواو دەکات، واتا دەگەڕێتەوە بۆ سەرەتا. ئەم بۆتەیە بۆ ئەو چیرۆکانە دەشێ کە مۆدە و سیما و کێشەی هەنووکەیی و هەواڵی لاوەکی دەست دەدات. (هەرچەندە ئەم بۆتەیە لە زۆربەی رۆژنامەکاندا بەکاردێ، ناوی ئەو رۆژنامەیەی وەرگرتووە، چونکە بەو ناوبانگی دەرکردووە کە لەلاپەڕەی یەکەمیدا ئەم بۆتەیە بەکاردێنێ)

بۆتەکە دەکرێ بەم شێوەیە بنووسرێ: سەردێر ⟵ سەردێری کورت ⟵ سەرەتا راڤە ⟵ کۆتایی (گەڕانەوە بۆ سەرەتا)

**(٣) بۆتەی کاتژمێری لم:**

وەك بۆتەی هەرەمی هەڵەوە گەڕاو بەسەرەتایەك دەست پێدەکات کە گرینگترین زانیاری تێدا دەکەوێتە ڕوو. بەدوایدا ڕووداوەکان بە پێی کات ڕیز دەکرێن. لە نێوان سەرەتا و گێڕانەوەی ڕووداوەکە زۆرجار دانە پاڵ پێویست دەبێت وەك (سەرچاوەیەکی ئاسایش دوێنێ لە هەولێر ڕای گەیاند کە.... ) بۆنەکە لەم فۆرمەدا دەردەکەوێ: سەردێر ـ دانەپاڵ ـــ ڕووداوەکان (بەپێی کاتی ڕوودان).

**(٤) بۆتەی ژماردن ( لیستە):**

گرینگیی ئەم بۆتەیە لەو چیرۆکە هەواڵانەدا دەردەکەوێ کە چەندین خاڵیان تێدایە کە دەبێ گرینگییان پێبدرێ و زیاتر بەکەڵکی هەواڵە فەرمییەکان دێت وەك کۆڕ و کۆبوونەوە و هەواڵی کەسی بەتایبەتی کە چەندین زانیاری تێدا بێت پێویستی بەوە بێت بژمێرێن یان بکرێن بە لیستەیەك. هەرکاتێ ژماردن بۆ تەن یان کۆتایی چیرۆکە هەواڵ بەکارهات، دەکرێ بەسەرەتایەکی کورت. دەست پێ بکات و کۆتایی بەژمارکردنی ئەو خاڵانە بێت کە خاڵە سەرەکییەکانی ڕووداوەکە کۆدەکەنەوە (سەرەتا ⟵خاڵەکان بە ژمارە ١ـ ٢ـ ٣ـ )

**(٥) بۆتەی کەرتکردن:**

تەکنیکی دابەشکردنی هەواڵە چیرۆك بۆ چەند کەرتێك بۆ ئەو هەواڵانە دەست دەدات کە زانیارییەکی زۆر ورد لە بارەیانەوە لەبەر دەستدا بێت ـــ واتە ژێرۆکە هەواڵی درێژ. تایبەتی سەرەکی ئەم بۆتەیە لەوەدایە کە هەر بەشێك لە هەواڵەکە وەك یەکەیەکی سەربەخۆ و ترازاو لە بەشەکانی تر سەیر دەکات کە هەریەکە سەرەتاو تەن و کۆتایی سەربەخۆی خۆی هەیە. بەشەکانی هەواڵەکە لەسەر چەند

بنەمایەك جیا دەكرێتەوە وەك جیاوازیی تێڕوانین، یان بەپێی كات، لە ئێستەوە بۆ زەمینەی پێشتر و گەڕانەوە بۆ ئێستە و ئایندە.

هەر بەشێك لە بەشەكانی ئەم بۆتەیە ئەم شێوەیە وەردەگرێ:

سەرەتا ←—— تەن ←——كۆتایی.

**٣/ زمانی هەواڵنووسی لەنێوان منێتی و بابەتیدا :**

زمان لە بەكارهێناندا ( شێوەی قسەكردن بێت یان نووسین) بە بنەمای منێتی كار دەكات، قسەكەر (نووسەر) هەرلەبەر ئەوەی خۆی قسە دەكات (دەنووسێ) خۆی دەكات بە تەوەرەیەك یان خاڵێك كە لێیەوە دەڕوانێتە دەوروبەر، خەڵك یان شت. كات و شوێن و پلەو پایەی بەرامبەرەكەی و (گوێگر/خوێنەر) رووكاری جوولە و ڕووداوەكان هەموویان لە چاوی خۆیەوە دەبینێ یان تەماشایان دەكات. لەڕووی هزریشەوە دیسان بیروبۆچوونی خۆی بەسەر دەوروبەردا دەسەپێنێ. خۆی بڕیار لەسەر زانیاری هاوبەش و زانیاری كەلتووری و زەمینە زانیارییەكان دەدات (وەرە ئێرە، بڕۆ ئەوێ، كاكە وەرە،...هتد)

كەواتە هەواڵنوس ئەگەر زمانی ئاسایی ڕۆژانەی لە نووسینەوەی هەواڵێكدا بەكارهێنا، ئەوە لە تێڕوانینی خۆیەوە ڕووداوەكان دەبینێ و دەگوێزێتەوە. ئەم زمانە ڕۆژانە ئاساییە لەبەر ئەوەی بەندە بە بیروبۆچوون و هزری هەواڵنووسەوە ڕەنگە زۆربەی جار لەگەڵ ڕووداوەكان جووت نەبێت. بەكورتی لەم كاتانەدا زمانی هەواڵنووس لە بەرژەوەندی ڕاستیی ڕووداوەكان كار ناكات، بەڵكو بۆ بەرژەوەندی خۆی دەبێت، ئینجا لەبەر ئەوەی هەواڵنووس خۆشی بۆ دەسەڵاتێك دەنووسێ، زۆر جار تەوەرەكە كە هەواڵنووسە لەگەڵ ئەو دەسەڵاتەی بۆ دەنووسێ دەبنە یەك و ڕاستی ڕووداوەكە بزر دەبێت یان تێدەچێت. بەم جۆرە گێژەنێك لە نێوان منێتیی هەواڵنووس و دەسەڵات و بابەتێتی دێتە كایەوە.

نووسینی بابەتی ئەوەیە كە لە ڕوانگەی منێتییەوە نەنووسرابێت، واتا تێكەڵ نەبووبێت بە بیروبۆچوون و تێڕوانینی نووسەرەكەی یان ئەو دەسەڵاتەی بۆی دەنووسێ یان ئەو دەزگایانەی دەسەڵات دەنوێنێ و لە بەرژەوەندی ئەماندا نەبێت

بابەتێتی دروستکردنی زمانێکی بێلایەنە کە تەنیا لە ڕووداوەکانەوە دەڕوانێتە ڕووداوەکان وەك کامێرایەکی ورد دەیانگوێزێتەوە. لە زمانی بابەتیدا بیروبۆچوون هەست و نەستی نووسەر جێگەی نابێتەوە. ئەو جۆرە نووسینەیە کە دەکرێ پاساو بدرێتەوە، بدرێتە بەر لێکۆڵینەوە، دروستی و نادروستی دەرکەوێ. ئەو جۆرە نووسینەیە کە ڕەنگدانەوەی ڕووداوەکانە نەك کاردانەوەی خۆی بۆ ئەو ڕووداوانە یان کاردانەوەی خاوەن یان سەرنووسەری ڕۆژنامەکەیان تیڕوانینی ئەو دەزگا و دەسەڵاتەی کە تەمویلی ڕۆژنامەکە دەکات.

**٤/ ئەگەرەکانی زمان و نواندنی دنیای ڕووداوەکان:**

بۆ ئەوەی هەواڵنووس بە زمانێکی بێ لایەنی بابەتی بنووسێت دەبێت ئاگاداری ئەگەرەکانی بەکارهێنانی زمان بێت، بابەتی چۆنیەتی ڕێکخستنی کەرەسەکانی ڕستەکە بریتین لە بکەر و بەرکار و تەواوکەر و کار و سەربار و ئەو شوێنانەی لە ڕستەدا داگیری دەکەن یان پێیان دەسپێرێ.

دەبێ تێبینی ئەوە بکەین کە گرنگترین شوێن لە هەموو ڕستەیەکی هەواڵگەیەنی کوردیدا ئەو شوێنەیە کە دەدرێ بە بکەری ئاشکرا، واتە پێشی ڕستە. وا دەردەکەوێ کە واتا بە چڕی و بە پڕی لەم شوێنەدا پەنگ دەخواتەوە و هەموو شوێنەکانی تری بۆ بەلاوە دەنرێ. بە واتایەکی تر ئەم شوێنە بۆ گەیاندنی شتی نوێ و نەزانراو تەرخان دەکرێ و شوێنەکانی تر بۆ زانیاری کۆن و زانراو دادەنرێن. بەم پێیە هەموو زانیارییەکی نوێی دەبێ لە پێشەوە بگوترێ یان بنووسرێ بۆ نموونە لە ڕستەی:

(١) بەعسییەکان کەرکوکیان تەعریب کرد.

تیشکی چڕ لەسەر بکەرەکە زانیاری گرنگ و نوێی هەڵگرتووە و بەرکار و کارەکە کە لە دوایەوە دێن لە کوردیدا هەڵگری زانیاری کۆن یان زانراون. هەروەها لەم ڕستانەی خوارەوەشدا هەست بە گرنگی و چڕیی واتای بکەر دەکرێ، هەرچەندە بکەرەکانیان کارا نین، واتە خۆیان کارەکە بەڕێوە نابەن.

(٢) ا. شاری فەلووجە ئاگری گرت.

ب. عیراق نەوتێکی زۆری هەیە.

کاتێك گرنگیی بکەر و شوێنەکەی دەردەکەوێ کە لەکاری دەخەین و دەیدەین بە کەرەسەی تر وەك لەم دەستکارییانەی خوارەوە دەبینرێ.

(۳) ا. ئەمریکاییەکان ئاگر لە فەلووجە بەردەدەن.

ب. نەوتێکی زۆر لە عیراقدا هەیە.

هەرچەندە ڕستەکانی ۲ی ا و ب و سێی ا و ب هەمان ڕاستی دەردەبڕن و لە یەك ڕووداو دەدوێن، لە دوو ڕوانگەی جیاوازەوە دەڕواننە ڕووداوەکە. لە (۲ أ)دا کە (شاری فەلووجە) بکەرە و کارەکەی تێنەپەڕە کەس بەرامبەر ئاگرەکە بەرپرس نەکراوە، بەڵام لە (۳ أ) کە (ئەمریکاییەکان) بکەرە و کارەکە تێپەڕە، ئەمریکاییەکان بەرپرس کراون لە ئاگرەکە. هەروەها لە ڕستەکانی (۲ ب) کە (عیراق) بکەرە و کارەکەی (هەبوون) تیشك لەسەر وشەی (عیراق)ە، بەڵام لە ڕستەی (۳ ب) هەر لەبەر ئەوەی (نەوتێکی زۆر) چۆتە پێشی و شوێنی بکەری پڕکردۆتەوە، تیشکەکە و چڕی واتاکە لە زۆری نەوتەکەدایە، نەك عیراق.

لە نموونەکانی سەرەوەدا گرنگی بکەر خۆی و گرنگی سەرەتای ڕستە تێکەڵ بە یەکتر بوون و ڕەنگە بە هەڵە وا تێبگەین کە ئەم دووانە هەر یەك شتن، بەڵام ڕستەی تر ئەم هەڵەیە ڕوون دەکاتەوە بەوەدا کە دەکرێ شوێنی بکەر (سەرەتا) بدرێ بە کەرەسەی تر بێ ئەوەی بکەر لە کاربخرێ. لەم بارانەدا تیشك دەکەوێتە سەر (سەرەتا) بەڵام بکەر گرنگیی خۆی دەپارێزێ. ئەم بارە بە تایبەتی بە پێشخستنی سەرباری کات و شوێن و هۆ دێتە دی وەك لەم ڕستانەدا دەبینرێ:

(٤) أ. دوێنێ ڕژێمی فاشستی تورکیا دوو گوندی کوردستانی کاول کرد

ب. بەداخەوە چەند منداڵ لەناو کوژراوەکاندا هەبوون.

ج. لە هەولێر قوتابییەکی زانکۆ تیرۆر دەکرێت.

د. ماوەیەکی زۆرە گفتوگۆ لەسەر گۆڕینی پرۆگرامەکانی خوێندن دەکرێت.

وەك بەم ڕستانەدا دەردەکەوێ گوێزانەوەی سەربار بۆ سەرەتای ڕستە کار لە جۆری کار ناکات، واتە سروشتی کارەکە ناگۆڕێ، کەواتە هێنانی سەربار بۆ پێشەوە لەگەڵ هەموو جۆرە کارێکدا دەڕوات، تێپەڕبێت (٤ أ، د) یان تێنەپەڕ بکەر دیار بێت (٤ ب) یان نادیار (٤ ج)، کاری بوون بێت یان هەبوون (٤ ب). بەڵام گوێزانەوەی بەرکار بۆ سەرەتای ڕستە لە چەندین لایەنەوە کار لە کەرەسەکانی

تری ڕستە دەکات. یەکەم: کارەکە دەگۆڕێ بە نادیار. دووەم: بکەر لەناو دەبات یان دەیباتە دواتر. سێیەم: بەرکار خۆی نەك هەر سەرەتا دەگرێ، بەڵکو دەبێتە بکەر. کەواتە بکەر نادیاری شۆڕشی بەرکارە بەسەر بکەردا، چونکە بە دوورخستنەوە یان لەناوبردنی بکەر دوایی دێ و لەهەمان کاتیشدا بەرزبوونەوەی بەرکارە بۆ سەرەتا و زەوتکردنی هەموو دەسەڵات و تواناکانیەتی، لە ناویاندا دەسەڵاتی دەرکەوتن و چڕی واتایی وەك بە بەراوردکردنی ئەم ڕستانەدا دەردەکەوێت:

(٥) أ. کۆلێژی ئەدەبیات فیلمێکی سینەمایی پێشکەش کرد.

ب. فیلمێکی سینەمایی لە کۆلێژی ئەدەبیات پێشکەش کرا.

ج. فیلمێکی سینەمایی لە کۆلێژی ئەدەبیات پێشکەش کرد.

هەندێ جار هاتنە پێشەوەی بەرکار بە تێداچوونی تەواوی بکەر دوایی دێ، بە تایبەتی لە زمانی کوردیدا کە برەو دەدات بەو ڕستە بکەر نادیارانەی کە بەبێ بکەرن. بڕوانە ئەم ڕستانەی خوارەوە:

(٦) أ. کۆلێژی ئاداب قوتابیان لە دوای تەواوبوونی وانەکانیان لە کۆلێژ دەردەکات.

ب. قوتابیان لە دوای تەواوبوونی وانەکانیان لە کۆلێژ دەردەکرێن.

ج. قوتابیان لە دوای تەواوبوونی وانەکانیان لە کۆلێژ لەلایەن کۆلێژی ئادابەوە دەردەکرێن.

شایانی ئاماژە پێکردنە کە ئەم برەو پێدانە بە ڕستەی بکەرنادیاری بێ بکەر دەبێتە هۆی بزربوونی زانیارییەکی زۆر گرنگ کە کارای ڕستەکەیە. هەر لەبەر ئەمەشە کە زۆر جار بە مەبەستی زانیاری شاردنەوە لە سەردێری هەواڵەکاندا بەکاردێ:

(٧) أ. گرووپی لاوکۆ دادەمەزرێت.

ب. دەرماڵەی وانە وتنەوە زیادکرا.

ج. ئاهەنگی دەرچووانی زانکۆی سەلاحەددین دوادەخرێت.

پەکخستنی بکەر و پەراوێزکردن و بەلاوەنانی بە چەندین ڕێگەی تریش لە کوردیدا ئەنجام دەدرێ: یەکەم: بەکارهێنانی کاری نێوان (نەتێپەڕ و نەتێنەپەڕ)

کە سەرەتا دەدات بە کەرەسەیەك کە بکەری ڕێزمانییە، بەڵام کارا نییە، واتە بە کارەکە هەڵناستێت وەك سووتا، برژا، کوڵا

دووەم: بەکارهێنانی چاوگ بە یاریدەی ئامرازی بەند: بە کوشت چوو، بە بڕین دەچێ، لە/ بۆ کڕین، لە ژماردن، لە باسکردن نایەت/ ناشێت، بۆ خواردن ئەمانە هەموویان لە سنوورێکی تەسکدا بەکاردێن، واتە بۆ چەند دیاردەیەك دەبن.

سێیەم: لەمانە گرنگتر و بلاوتر بە جێناو ڕاگرتنی بکەرە کە بەها و گرنگی بکەرەکە دەسڕێتەوە چونکە لە کەسێکی یان دیاردەیەکی ناسراوەوە دەیکات بە کەسێکی بێناو یان دیاردەیەکی نادیار:

(٨) أ. دارا لە کاوە بەتەمەنترە.

ب. دارا لەو بەتەمەنترە.

ج. دارا لێی بەتەمەنترە.

د. دارا بەتەمەنترە.

هەروەك لەم ڕستانەدا دەردەکەوێ ناوی تایبەتی دەرکەوتوویی زیاترە لە جێناو و جێناوی سەربەخۆش لە جێناوی لکاو دیارترە. لە هەموویان بێناوتر بە ڕێگەی کرتاندن ئەنجام دەدرێ.

چوارەم: ڕێگەیەکی تر بۆ سڕینەوەی دەوری بکەر بەوە دەکرێ کە بکرێت بە ناو. ئەمە لەو کاتانەدا دەبێت کە بکەرەکە خۆی لە شێوەی ڕستەدا بێت لەکاتی وادا کاری ڕستەکە دەبێت بە چاوگ و بە ئیزافە بە بەرکارەکەوە دەنووسێ. بۆ نموونە بکەری ئەم ڕستانەی خوارەوە بە ڕێگەی بەناوکردنەوە دروست بوون و هەریەکەیان ڕستەیەکی کار تێپەڕیان شاردۆتەوە کە دەرکەوتوویی زیاترە:

(٩) أ. تەعریبکردنی کەرکوك نەتەوەی کوردی زەرەرمەند کرد.

ب. قایمکردنی سنوورەکان ڕێگە لە کاری تیرۆریستی دەگرێ.

ج. کیمیاباران کردنی هەڵەبجە کوردی تاسەبار کرد.

لە (٩ أ) بکەرە بە ناوکراوەکە زانیارییەکی زۆری شاردۆتەوە و لە ڕستەیەکەوە هاتووە کە بکەرە بنچینەییەکەی لادراوە. ڕستەکە بە لێکدانی دوو ڕستە ئەنجام دراوە، بە کرتاندنی بکەری ڕستەی یەکەم کە هەڵگری زانیارییەکی گرنگە وەك بەم شیکردنەوەیەدا دەردەکەوێ:

(١٠) أ. بەعسییەکان کەرکووکیان تەعریب کرد.

ب. ئەمە نەتەوەی کوردی زەرەرمەند کرد.

٥/ هەندێ جار بکەر بەهۆی هاتنە پێشەوەی باسەوە گرنگیی خۆی دەدۆڕێنێ. باس ناوێکە کە لە بنەڕەتدا تەواوکەری بکەرە، بۆ خۆ دەرخستن دێتە سەرەتای ڕستە و بکەرەکە دەخاتە دوای خۆی بێ ئەوەی بکەرەکە مافی بکەری خۆی بدۆڕێنێ، بە واتای ئەوەی کە هەر ئەم نەك باس لەگەڵ کاری ڕستەکە لە ژمارە و کەسدا ڕێك دەکەوێ، وەك لەم ڕستانەدا دەبینین:

(١١) أ. چیمەنتۆ نرخی لە بازاڕدا زیاد دەکات.

ب. نرخی چیمەنتۆ لە بازاڕدا زیاد دەکات.

(١٢) أ. دارەکە گەڵاگانی زەرد بوون.

ب. گەڵای دارەکان زەرد بوون.

وە نەبێ ڕێزمانی کوردی هەر ڕێگە بە بێ هێزبوون و بەلاوەنانی بکەر بدات، بەڵکو بەلای کەمەوە دوو ڕێگەی تێدایە بۆ یەکجار بەهێزکردن و چڕکردنەوەی بکەر:

یەکەم: بەکارهێنانی پێش کاری (بوون) و لاڕستەیەکی گەیەنەر وەك بە بەراوردکردنی ئەم ڕستانەدا دەردەکەوێ:

(١٢) أ. شا عەبدولا بۆ یەکەم جار دەست ماچکردنی قەدەغە کرد.

ب. شا عەبدولایە بۆ یەکەم جار دەست ماچکردنی قەدەغە کرد.

ج. شا عەبدولا بوو بۆ یەکەم جار دەست ماچکردنی قەدەغە کرد.

شایانی تێبینی کردنە کە ئەم ڕێگەیە، واتە ڕستەی پچڕاو، نەك هەر بۆ چڕکردنەوەی واتای بکەر بەکاردێ، بەڵکو هەموو کەرەسەیەکی تری ڕستەی پێ بەهێزدەکرێ بەکاربێت یان سەربار جگە لە کاری ڕستە:

(١٣) أ. فیفا نایجیریا ئاگەدار دەکاتەوە.

ب. فیفا بوو کە نایجیریای ئاگەدار کردەوە

ج. نایجیریا بوو کە فیفا ئاگەداری کردەوە.

دووەم: بە بەکارهێنانی ڕستەی پچڕاوئاسا کە هەمیشە لە کوردیدا بە (ئەوە) یان (ئەو کەسە/ شتە) دەست پێدەکات کە بە ئیزافە بە ڕستەیەکی گەیەنەرەوە

دەبەستریٚ ناوە چڕکراوەکە لە دواوە دیٚ و بەمەش قورساییەکی زیاتر دەکەوێتە سەر. ئەمەش بە بەراوردکردنی ئەم ڕستانەی خوارەوەدا دەردەکەویٚ:

(١٣) أ. ئازادی پێویستە بۆ مرۆڤ.

ب. ئەوەی پێویستە بۆ مرۆڤ ئازادییە.

ج. ئەو شتەی پێویستە بۆ مرۆڤ ئازادییە.

ئەم جۆرە ڕستەیە هێڵێك دەکێشیٚ لە نێوان زانیاری نویٚ و زانیاری کۆنتر، واتە زانیاری نویٚ دەباتە دواوە و بەمە قورساییەکی دەخاتە سەر، بەڵام ڕستەکە خۆی هەر لەو جۆرەیە کە لە بکەر و تەواوکەر و کاری بوون پێك دیٚ. شایانی تێبینییە کە بە بەکارهێنانی کاری (کردن) لەم جۆرە ڕستەیەدا، قورسایی دەکەوێتە سەر کارەکە:

(١٤) أ. ئەوەی تۆ کردت، تێکدانی هەموو شتەکە بوو.

ب. ئەوەی جەعفەری دەیکات، دژایەتی کوردە لە کەرکووك.

## ئە نجام:

ئەوەی کە زۆر گرنگە لە زمانی هەواڵنووسیندا، ئەوەیە کە چۆن سەرەتای ڕستە و ئەو شوێنەی کە بکەر پڕی دەکاتەوە بەکاربێت تاوەکو هەواڵنووسین بتوانێت بابەتییانە و ڕاستگۆیانە ڕووداوەکە بگوێزێتەوە بۆ خوێنەر لە باری ئاساییدا، واتە لە ڕستەی هەواڵ گەیەندا، سەرەتا و بکەر پێکەوە کاردەکەن و بەمە قورساییەکی زۆر و واتایەکی پڕ دەدرێ بە بکەر. لەو کاتانەدا کە هەواڵنووس بیەوێ قورساییەکی زیاتر و ڕۆشناییەکی بەهێزتر بخاتە سەر بکەر ئەوا لە ڕووی سینتاکسەوە دەبێ یان ڕستەی گەیەنەری پچڕاو یان ڕستەی گەیەنەری پچڕاوئاسا بەکاربێنێ. دەبێ ئەوەش بزانێت کە ئەم دوو ڕێگەیە کەرەسەی تریشیان پێ قورس دەکرێ. لەو کاتانەشدا کە هەواڵنووس بیەوێ یان گیانی بابەتی وای لێ بکات کە بکەر لەکار بخات یان هەندێ لە گرنگی کەم کاتەوە لە ڕووداوەکاندا، ئەوا دەتوانێ پەنا بەرێتە بەر چەند ڕێگەیەکی وەك: فڕێدان، جێگیرکردن بە جێناو، دەست پێکردن بە باس، بەناوکردنی بکەر، بەکارهێنانی کاری بکەرنادیار... هتد. کەواتە ئەو لایەنەی سینتاکس کە پەیوەندی پتەوی بە هەواڵنووسینەوە هەبێت بەکارهێنانی بە ئاگایانەی سەرەتای ڕستە و شوێنی بکەرە.

**ئەو سەرچاوانەی سوودیان لێ وەرگیراوە**

* Benoit, W (1995) A theory of Image Resoration Strategies, University of New York press.
* Fowler, R and others (1979) Language and Control: London.
* Lakoff R. (1990) Language of politics in
Our likes talking
Basic books.
* Levinson،S.(1983) pragmatics COM bridge university press.

**ڕۆژنامەکان:**

کوردستانی نوێ، برایەتی، ئاوێنە، ڕووداو

گۆڤارەکان: لڤین، ستاندار و،....

**ملخص البحث**

هذا البحث الذي يحمل عنوان ( الاخبار المقصصة بين البودقة واللغة) يدخل في الاساس في اطار التحليلات التداولية الموسعة، عنوان البحث يلزمنا الولوج في زوايا ووجهات نظر مختلفة كالقواعد التحليلية المرتبطة بالقصص من حيث تعاقب الاوقات والاحداث التى تتبختر اتضاحا والصياغات التي تجعل النصوص الاخبارية بين الغموض والافتضاح. وكذلك القواعد التي تحكم مجالات الصحافة والاقحامات التي تتعرض لها قواعد التداولية المساعدة. يتوزع البحث محاور عدة منها: بودقات الاخبار المقصصة، ولغة كاتب الاقاصيص بين الذاتية والموضوعية، والاحتمالات الواردة بين اللغة ودنا الاحداث ويختتم البحث بعرض النتائج وتصفيف المصادر.

## Abstract

This paper which is entitled (news story between crucible and language) is basically part of macro-pragmatics. Obviously, the title of the research necessitates that we enter into various angles and standpoints such as the analytic rules related to fiction such as time sequence and event the fundamental basis of the story, then how we derived the news in the media. the paper falls into several topics such as the language of the news writer، the possiblities of the language، and the representation of the world of events. We took our examples from 'KURDISTANI NWE' and 'BRAYATI ' and some others newspapers، the paper ends with the conclusions and the list of references.

# لاگیری لە سروشتی گوتاری هەواڵدا
# شیکردنەوەیەکی ڕەخنەیی گوتاری ڕۆژنامەنووسیی کوردییە

**د. سەباح رەشید**
**زانکۆی سەلاحەددین – کۆلێژی پەروەردە**

**د. رەحیم قادر سورخی**
**زانکۆی سەلاحەددین _ کۆلێژی زمان**

**کورتە**

ڕۆژنامە و پەیامنێرەکان بەوە ناسراون کە خوێنەرەکانیان بە زانیاریی بابەتی، بێلایەن و باوەرپێکراو دابین دەکەن. گەیاندنی زانیاری بە شێوەیەکی دادپەروەرانە، بەو واتایەیە کە رێگە دەدەن زانیارییەکان خۆیان بدوێن. ڕۆژنامەنووسان ئەوەی دەزانن، بژاری وشەیەك یان دەستەواژەیەك دەتوانێ بریار بدا لەسەر ئەو دەوروبەرەی هەواڵەکەی تێدا دێت. سەرەرای ئەوەش زۆرجار لاگیری بەشێوەی نائاگایانە لەلایەن ڕۆژنامەنووسەوە روو دەدات. **گریمانەی ئێمە** ئەوەیە کە سروشتی دەستکردانە و دامەزراوەییانەی هەواڵ لە پرۆسەی بەرهەمهاتنیدا بە پێی نواندنی پێوەندییەکانی دەسەلات، ئایدۆلۆژی، لێکدانەوەکانی بەکارهێنەکانی، پێشبرکێی لەگەڵ میدیاکانی تر، ئامانجی بازرگانی و لێکەوتە سیاسیی کۆمەڵایەتییەکانی پەیامی میدیا دەکەوێتە داوی لاگیرییەوە. ئەم لاگیرییانەش لە بژار و لادانەکانی ڕۆژنامەنووس، وشە و رستەکانیدا خۆ دەنوێنێ. **ئامانجی لێکۆڵینەوەکە** ئەوەیە، ئەو هۆکارە نازمانییانەی (وەك پێوەری کۆمەڵایەتی، ئابووری و پیشەیی و دامەزراوەیی) گرێدراوی رۆنانی کۆمەڵایەتین و لە دەرکەوتنی گوتاری ڕۆژنامەنووسیدا وەك گوتارێکی "لاگیر"دەوریان هەیە بخاتە روو و بیانناسێنێ. پێوەندیی ئەو هۆکارانە بە راستی و بژاری هەواڵ و زمانی دارشتنیەوە لە روانگەی **شیکردنەوەی رەخنەیی گوتارەوە** بخاتە روو. بۆ ئەم کارە دوو ڕۆژنامەی **"ڕووداو"** و **"هاوڵاتی"** هەڵبژێردراون. چونکە ئەم

رۆژنامانــە ســەر بــە دوو شــوێنی جیــای کوردســتان و دوو ناوەنــدیی جیــاوازن لــە پێوەندییــەکانی دەســەڵاتە هــەرێمی و ناوچــەیییەکان و هــەر رۆژنامــەی بەشــێکی بەرچاوی نوخبەکانی دەوروپشتی دەسەڵاتەکانن لە کوردستاندا.

**پرسیاری لێکۆڵینەوەکە** ئەوەیە، هۆی پشت لاگیرییەکانی ئەم رۆژنامانە چین؟ چی وا دەکات ئەم رۆژنامانە بەرانبەر بەیەك رووداو بۆچوونی دژبەیەکیان بێت؟ یان لاگیری لایەك بن؟

**وشــە ســەرەکییەکان:** **رۆژنامەنووســی، لاگــیری، ئایــدۆلۆژیا، دەســەڵات، شیکردنەوەی رەخنەیی گوتار**

## بەشی یەکەم: بنەما تیۆرییەکان

### پێشەکی

**ئەم لێکۆڵینەوەیە، لە دوو بەش و ئەنجام و سەرچاوەکان پێك دێت. بەشی یەکەم تایبەتە بە بنەما تیۆرییەکانی لێکۆڵینەوەکە پشتی پێیان بەستوون: ڕۆنانکاری و پاش ڕۆنانکاری و تیۆری گوتاری فۆکۆ، تیۆر و پێڕەوی لێکۆڵینەوەی شیکردنەوەی ڕەخنەیی گوتار.**

**بەشی دووەم، بە ناونیشانی تێگەیشتن لە هەواڵە. لەم بەشەدا پێوەرەکانی بەهەواڵبوونی ڕووداوێك، بەهاکانی هەواڵ، لاگیری و سروشتی دامەزراوەیی هەواڵ لە ڕوانگەی شیکردنەوەی ڕەخنەیی گوتارەوە دەخرێتە بەرباس.**

### تیۆری ڕۆنانکاری و پاش ڕۆنانکاری

تیۆری ڕۆنانکاری خاڵێکی دەستپێکی گرنگ بۆ پەرەپێدانی تێگەیشتنێکی دروستی گوتار لە زانستی کۆمەڵایەتیدا دەستەبەر دەکات، چونکە ئەم تیۆرە لێکچوونێکی ئاشکرا لە نێوان زمان و پێوەندییە کۆمەڵایەتییەکاندا گریمانە دەکات (Howarth 2000)[1]. "خاڵی دەستپێکردنی شیکردنەوەی گوتار لە ڕوانگەکانی شیکردنەوەی گوتاردا هەمان ئەو ئیدیعایانەی فەلسەفەی زمانیی ڕۆنانکاری و پاش ڕۆنانکارییە، واتە ئەمەی کە بەردەوام لە ڕێی زمانەوەیە دەستمان بە واقعییەت رادەگات. ئێمە لە ڕێگای زمانەوە چەند نواندنەوەیەك لە واقعییەت دەئافرێنین کە بەهیچ جۆر نواندنی ئەو واقعییەتە نین وا لەپێشدا هەبووە، لە ڕاستیدا زمان ڕۆڵی لە بنیاتنانی واقعییەتدا هەیە. ئەمە بەم واتایە نییە کە واقعییەتێك لە ئارادا نییە. واتا و نواندنەوەکان واقعین. دیاردە فیزیکییەکانیش لە ئارادا هەن، بەڵام تەنیا لە ڕێگای گوتارەوە واتا دەدەن. (Jorgensen and Phillips, 2002: 8 - 9 ).

دیارە هەموو ڕوانگەکانی شیکردنەوەی گوتار بە ئاشکرا لە پاش ڕۆنانکارەکان نین، بەڵام هەموویان لەسەر هەموو ئەم خاڵانەی خوارەوە هاوڕان:

١. زمان دانەوە[2]ی واقعییەتی لە پێشدا هەبوو نییە.

٢. زمان لە قالبی نموونە یان گوتارەکاندا ڕۆنراوە – تەنیا سیستەمێکی گشتی لە واتاکان نییە، وەك ئەوەی ڕۆنانکارییە سۆسێرییەکان پێیان وابوو. بەڵکو

زنجیرەیەکە لە سیستەم یان گوتارەکان وا بەهۆی ئـەوەوە لـە گوتارێکـەوە بـۆ گوتارێکی دیکە دەگۆڕێن.

٣. نموونەکانی گوتار بە هۆی کردارە گوتارییەکانەوە دەپارێزرێن و دەگۆڕێن.

٤. ئەم پاراستن و گۆڕانی نموونانە دەبێ لە ڕێگەی شیکردنەوەی ئـەو دەوروبـەرە تایبەتانەوە کە زمـان تێیانـدا ئـیش دەکـا تـاووتوێ بکـرێ. ( Jorgensen and Phillips, 2002: 12).

أ) **تیۆری گوتاری فۆکۆ**

تیـۆری گوتـاری فۆکـۆ بەشـێك بـوو لـە "***دێرینەناسـی***"[٣] یەکـەی. ئـەو لـە توێژینەوە "دێرینەناسی"یەکانیدا بەدوای ئەو یاسایانەوە بوو کە دیارییـان دەکـرد کامانە گوزارە[٤] لە قۆناغێکی تایبەتیی مێژووییـدا وەك گـوزارەی واتـادار و راسـت وەرگیرێن. فۆکۆ گوتار بەم شێوەیە پێناسە دەکات:

*کاتـێ کۆمەڵـێ گوزارە بە گوتـار نـاو دەبـەین کـە سـەر بەیـەك پۆلبەنـدی[٥]ی گوتاری بن [گوتار...] پێکهاتووە لە ژمارەیەکی سنووورداری گوزارەکان کـە بکـرێ کۆمەڵـێ مەرج بۆ بوونیان پێناسە بکرێ. گوتار لەم واتایەدا فۆرمێکی ئایدیال و بێ کـات نییـە [...] گوتـار لـە سـەرەتا تـا کۆتـایی مێژووییـە – پارچـەیەکە لـە مێـژوو[...] کـە سـنوور، دابەشـکردن و شـێوە تایبەتـەکانی کاتبەنـدیی خـۆی دەسـەپێنـێ (Foucault 1972: 117)*[٦]. *واتـە بـەلای فۆکـۆوە، "گوتـار بـەواتای جۆرێك کردەی دامـەزراوەیی (کـردەی گوتاری)یـە کـە لـە هەنـدێ یاسـای تایبـەت پەیڕەوی دەکات"* . ئـەم کردانـە لـە لایـەن کارگێڕەکـانی پێڕەوێکـی کۆمەلایـەتی، زانسـتی، دەسـتووری، یـان هزرییـەوە پێکـدێت و هەمووشـیان بـە شـێوەیەك پێوەندییان بە زمان و ئاخاوتنەوە هەیە (لە خالقی، ١٣٨٢: ٢٦٥ وەرگیراوە.).

***فۆکـۆ*** لەگـەڵ ئـەو پێشـگریمانە گشـتییەی بنیاتنـەریی کۆمەلایـەتی[٧] هاودەنگـە کـە دەڵـێ زانسـت هـەر بەتـەنیا دانـەوەی واقعییـەت نییـە. راسـتی بنیـاتنراوێکی گوتارییـە و ڕێژیمـە جیاوازەکـان[٨]ی زانیـنن کـە دیـاری دەکـەن چـی دروستە و چی چەوت.

فۆكـۆ لـە بەرهەمـە دێرینەناسـییەكانیدا تیـۆرێكی لـەبارەی (دەسـەڵات / زانین)ەوە هێنایە ئاراوە. ئـەو لـە جیـاتی ئـەوەی كاراكـان و ڕۆنانـەكان بـە پـۆلی سەرەكی دابنێ جەخت لەسەر دەسەڵات دەكاتەوە. دەسەڵاتیش وەك گوتار سـەر بەیــەك كــارای تایبــەت وەك تاكــەكان یــان دەوڵــەت و گرووپــەكانی خــاوەن بەرژەوەندیی تایبەت نییە، دەسەڵات لە نێوان كرداره گوتارییـە جۆراوجۆرەكانـدا بڵاو بووەتەوە:

ئـەوەی وادەكـات دەسـەڵات بـاوەڕپێكراو بێـت، ئـەوەی دەسـەڵات شـایانی پەسندكردن دەكات ، ئەو واقعییەتەیە كە دەسەڵات تـەنیا كۆسـپێك لەبـەر دەمـی ئێمەدا نییە كە پێمان دەڵێ نـا، بـەڵكو لەمـە زیـاتر پـێ رادەكێشـێ و دیاردەكـان بەرهەم دێنێ، چێژ بەدی دێنێ، مەعریفە بەدی دێنێ و گوتار بەرهەم دێنێ. دەبـێ دەسـەڵات بـە رایەڵەیـەكی بەرهـەمهێن دابنـرێ كـە لـە سەرانسـەری جەسـتەی كۆمەڵایەتیدا راییە، شتێكی زۆر زیاتر لەوەی نموونەیەكی نەرێنی[٩]یە كە ئەركەكی سەركوتە. (Foucault 1980: 119)[١٠].

دەسەڵات هەم بەرپرسیاری خوڵقاندنی جیهـانی كۆمەڵایـەتیی ئێمەیـە و هـەم بەرپرسـیاری شـێوەی پێكهـاتنی تایبـەتی ئـەم جیهانــە و شـێوەی دەرفــەتی گفتوگۆكردن لەبارەوەیەتی. دەرفەتی پێكهاتنی شێوە بەدیلـەكانی تـری بـوون و گفتوگـۆكردن لەبارەیــەوە رەت دەكاتــەوە. كەواتــە دەســەڵات هــەم هێزێكــی بەرهەمهێنە و هەم هێزێكی پێشگر.

تێگەیشتنی فۆكۆ لە دەسەڵات/ زانست هەندێ دواهاتی بۆ ئەو لـە ***راستی*** هەبوو. فۆكۆ ئیدیعای كرد كە دەستڕاگەیشتن بە راسـتییەكی رەهـا نـاكرێ هـەبێ. چونكە ناكرێ لە دەرەوەی گوتار شتێك بگوترێ. ناكرێ لە چنگ نواندنـەوە رزگـار بـی. وتارەكـان (هەسـتی راسـتی) بـەدی دێـنن. چـونكە "راسـتی لـە دەرەوەی دەسەڵات یان بـەبێ دەسـەڵات نییـە".. راسـتی بـە پێـی شـێوە جۆراوجۆرەكـانی سـەپاندن بەرهــەم دێـت و كاریگەرییـە یاسـامەندەكانی دەسـەڵات دەپـارێزێ "(خالقی، ١٣٨٢: ٢٦٣).

**ج) تیۆر و میتۆدی شیکردنەوەی ڕەخنەیی گوتار**

ئامانجی ئەم لێکۆڵینەوەیە شیکردنەوەیەکی رەخنەییانەی زمانی ڕۆژنامەنووسییە. تیۆر و ڕێبازێکی لێرەدا بەکار دێ لە **"زمانەوانیی ڕەخنەیی**[11]**"**یەوە هاتووە کە ئێستا بە **" شیکردنەوەی رەخنەیی گوتار**[12]**"** ناوی دەرکردووە."شیکردنەوەی رەخنەیی گوتار بیرکردنەوەیە لەبارەی دەقەکان، گفتوگۆ و نواندنی وێنەیی کە گرنگە بۆ پێوەندیی نێوان گوتار و باوەڕەکانمان، لەبارەی خۆمان، خەڵکانی دیکە و شتەکانی وا دەورەیان داوین. ئەمەش بە لەقاودانی لایەنگرییە کۆمەڵایەتی و سیاسییەکان دەکرێت. کەواتە، لەم دەوروبەرەدا، وشەی ***رەخنەیی***[13] بە واتای ئاشکراکردنی دەوری گوتار لە بەدیهێنان، وەسفکردن و چارەسەرکردنی کێشە کۆمەڵایەتییەکان، بەکارهێنان و سوودوەرگرتن لە دەسەڵات و پاساوە ئامادەکراوەکانە بۆ گۆڕین یان پاراستنی بارودۆخی ئێستا**"** (Christopher j. hall& …… [et. al],(2011: 88.

**گوتار**[14]، لە ژیانی ڕۆژانەماندا دەورەی داوین، زۆرجار هێندە ئاسایی دێتە بەرچاو بە زەحمەت پێی دەزانین: لە لێکدانی دەق و وێنەکانی ناو کتێبە دەرسییەکاندا، لەسەر بەستەی خۆراك و هێماکانی سەر جادەکان، چاك و چۆنی نێوان دۆستان و نێوان بێگانەکان، بۆ نووسینی ئیمەیل و وتارە ئەکادیمییەکان. ئەم جۆرە نموونانە وادەگەیەنێ کە، وشەی *گوتار* ئاماژە دەکات بە زمانی گوتراو نووسراو (لەگەڵ لێکدانی وێنەکاندا) وا بۆ گەیاندنی واتا تایبەتەکان بەکار دێت (ibid, 2011: 77)[1]. "گوتار نواندنەوەی بوارەکانی ژیانی کۆمەڵایەتییە لە ڕوانگەیەکی تایبەتەوە"(Fairclough: 2004:111).

بە بۆچوونی فێرکلاف، لە شیکردنەوەی گوتاردا دوو ئاستی جیاواز دەستنیشان دەکرێ، ئاستی کۆنکرێت و ئاستی ئەبستراکت: واتە ڕووداوەکان و دەقەکان لە لایەك، کردە کۆمەڵایەتییەکان و ریزبەندییەکانی گوتار لە لایەکی دیکە. ئەو بوونێکی کۆمەڵایەتی واقعییانەی گریمانە دەکات کە ڕۆنانە کۆمەڵایەتییەکانیش بەشێکن لە واقعییەتی کۆمەڵایەتی. ڕۆنانە کۆمەڵایەتییەکان شتە ئابستراکتەکانن کە شێمانەکان دیاری دەکەن، واتە کۆمەڵەی ئەگەرەکان. بەڵام، پێوەندیی ئەو شتەی لەرووی ڕۆنانەوە دەشێ ببێ و ئەوەی بە واقعی

روودەدات، (لە نێوان ڕۆنان و ڕووداودا) پێوەندییەکی ئالۆزە. ڕووداوەکان، هەروا بە سادەیی و ئاسانی، ئەنجامی ڕۆنانە کۆمەڵایەتییە ئابستراکتەکان نین. پێوەندییەکەیان دەلالی دەکرێ: دەلالییان لە نێواندایە، فێرکلاف ئەم دەلالە بە "کردەی کۆمەڵایەتی" ناو دەبات. کردە کۆمەڵایەتییەکان دەکرێ وەك شێوەکانی کۆنترۆڵکردن دابنرێن لە بژاری ئەگەری بوونی ڕۆنانێکی دیاریکراودا و بێبەشکردنی ئەوانەی دیکە، هەروەها پاراستنی ئەم بژارانە بۆ هەمیشە، لە بواری تایبەتی کۆمەڵایەتیدا. زمان توخمێکی کۆمەڵایەتییە لە هەموو ئاستەکاندا:

- ڕۆنانە کۆمەڵایەتییەکان: زمانەکان
- کردە کۆمەڵایەتییەکان: ڕیزبەندییەکانی گوتار
- ڕووداوە کۆمەڵایەتییەکان: دەقەکان.

زمان، وەك ئاماژەی پێکرا، دەکرێ لە زومرەی ڕۆنانە کۆمەڵایەتییە ئەبستراکتەکان دابنرێ. زمان ئەگەر یان ئەگەرە دیاریکراوەکان دەستنیشان دەکات. و ئەوانەی دیکە دەردەهاوێژێ. بەڵام دەقەکان وەك توخمێکی ڕووداوی کۆمەڵایەتی بە سانایی ئەو ئەگەرە دەرکەوتووانە نین کە بە هۆی زمانەوە دەستنیشان کرابن. هۆکاری دامەزراوەیی نێوانگری دیکەش هەن لە جۆرێکی تایبەتی زمانیدا: لەنگەرە زمانییەکانی تۆڕەکانی کردەی کۆمەڵایەتی! واتە ڕیزبەندییەکانی گوتار. بەڵام فێرکلاف پێی وایە "توخمەکانی ڕیزبەندییەکانی گوتار، ناوەکان و ڕستەکان (پێکهێنە ڕۆنانییەکانی زمان) نین، بەڵکو گوتارەکان وا بە هۆی زمانەوە دەستنیشان کراون بژار دەکەن و ئەوانەی دیکە دەردەهاوێژن: ئەمانە جۆراوجۆریی زمانی کۆنترۆڵ دەکەن بۆ بوارە تایبەتەکانی ژیانی کۆمەڵایەتی. هەر بۆیەش ڕیزبەندییەکانی گوتار دەکرێ وەك ئەو هۆیانە وا ڕێکخستنی کۆمەڵایەتی و کۆنترۆڵی جۆری زمانی دەکەن، سەیر بکرێن. (Fairclough,2004:115).

**د) پێشینەی شیکردنەوەی ڕەخنەیی گوتار:**

پێشینەی شیکردنەوەی ڕەخنەیی گوتار دەگەڕێتەوە بۆ ڕۆژئاوا. بەناوبانگترین بیردۆزەکانی گوتار شیکاریی ڕەخنەیی بە ڕوانگەی جیاوازەوە، بریتین لە *هاج* و *کرێس* و *فاولێر* و *ترو* (١٩٧٩) لە کتێبی "***زمان و کۆنترۆڵ***"دا،

فێرکلاف (١٩٨٩) لە کتێبی "*زمان و دەسەڵات*"دا، ڤاندایك (١٩٨٨) لە کتێبی "***گوتار وەك هەواڵ***"دا، وۆداك (١٩٩٦) لە کتێبی "***بنی نەزمی گوتارەکان***"دا، ڤەنلیووێن (١٩٩٦) لە کتێبی "***دەق و کردەکان***"دا و ریچارد سۆن (٢٠٠٧) لە کتێبی "***شیکردنەوەی رۆژنامەکان: روانگەیەك بۆ شیکردنەوەی رەخنەیی گوتار***"دا و کەسانی دیکە."

یەکێ لە چالاکییە سەرەکییەکانی شیکردنەوەی رەخنەیی گوتار، شیکردنەوەی دەقەکانی هەواڵ بووە بۆ ئاشکراکردنی لاگیریی رۆژنامەنووسی لە بواری وەك رەگەزپەرستی (ڤاندایك ١٩٩٣)، فێرکلاف (١٩٩٥) نواندنەوەی خراپی موسوڵمانان (Richardson, 2004)، (دژی ـ کۆچبەری ( wodak and Reisigl, 1999) و ئایدۆلۆژییە سیاسییەکانی دیکە (kress,1983) و .... *لە زمانی کوردیدا نامەیەکی دکتۆرا، لەلایەن (رەحیم قادر سورخی)یەوە بە ناونیشانی " شیکردنەوەیەکی رەخنەیی گوتاری رۆژنامەنووسیی کوردی (١٩١٨ – ١٩٣٢) "لە زانکۆی سەلاحەدین لە ساڵی ٢٠١١ دا کراوە (چاپ نەکراو).*

### دەوروبەری مێژوویی بابەتی لێکۆڵینەوەکە

بە پێی بۆچوونی (وۆداك و لودویك ١٩٩٩: ١٢)، "گوتار بەردەوام مێژووییە". ئەمە بەم واتایەیە کە گوتار"لەرووی مێژوویی و ئێستاییەوە پەیوەست دەبێ بە رووداوەکانی دیکەی گەیاندن[١٥] وا هاوکات خەریکن روودەدەن، یان پێشتر روویان داوە (لە sheyhulilami, 2007: 97 وەرگیراوە). هەروەها، "نەك هەر تاکەکان، بەڵکو دامەزراوە و گرووپە کۆمەڵایەتییەکانیش واتا و بەهای تایبەتییان هەیە، کە لە زماندا بە شێوەیەکی پێڕەومەند دەری دەبڕن. (kress, 1989)[١٦] "لەبەر رۆشنایی ئەم بۆچوونەدا، ئاماژەبە دەوروبەری مێژوویی و پێوەندیداری ئەو داتایانەی لە گوتاری رۆژنامەکانی بابەتی لێکۆڵینەوەکەدا بەرهەم هاتوون و خەریکین تاوتوێیان دەکەین، پێویستە.

کێشەی کورد لەگەڵ دەوڵەتی ناوەندی مێژووییە. بەڵام بەشێکی ئەم کێشەیە دەگەڕێتەوە بۆ پێکهاتنی دەوڵەتی نوێی عێراق لە پاش رووخانی رێژیمی دیکتاتۆری بەعس، بە سەرۆکایەتی سەدام حوسێن. لەپاش پێکهاتنی ئەم

دەوڵەتە نوێیە، کورد پشکی هەبوو لە دامەزراندنەوەی ئاسایش لە عێراقدا. لە پاش بە دەسەڵات گەیشتنی، نووری مالیکی، سەرۆکوەزیرانی عێراق هەوڵی دا دەسەڵاتەکانی کورد لە پێوەندی لەگەڵ نەفت و بەڕێوەبردنی هاوبەشی ناوچە دابڕێندراوەکان کەم کاتەوە. هێزی پێکهێنا و لە کۆبوونەوەی لەگەڵ فەرماندە لەشکرییەکانی عەرەبدا ئاماژە بە لێدانی کورد دەکات ئەگەر فرۆکەی ئێف. شازدەکانی لە ئەمریکاوە پێ بگات. ئەمە بوو بە مایەی نیگەرانیی کورد و بەتایبەتی سەرۆکی هەرێمی کوردستان کاك مەسعود بارزانی. بۆیە لەگەڵ ململانێی دەسەڵات لە نێوان هێزە عێراقییە عەرەبەکان لەگەڵ مالیکی، کوردیش ململانێی لەگەڵی دەست پێ کرد. بەڵام مالیکی بە هێنانە بەر باسی حکومەتی زۆرینە عەرەبەکانی پەراوێز خست و هەروەها سەرەڕای ئەوەی بەڵێنی راگرتنی پێکهێنانی بە مام جەلال تاڵەبانی سەرۆکی کۆماری عێراق دابوو، فەرمانەدەیی ئۆپۆراسیۆنی دیجلەی پێکهێنا و هەڕەشەی هەڵگیرسانی شەڕی (کورد – عەرەبی) راگەیاند، سێ جاریش سزای لەسێدارەدانی بۆ تارق هاشمی، جێگری سەرۆك کۆمار دەرکرد. هەر بۆیە کێشەکان قووڵتر بوونەوە و تا ئێستا بە چارەسەر نەکراوی ماونەتەوە.

## بەشی دووەم: تێگەیشتن لە هەواڵ

### أ) هەواڵ وەك ژانرێکی ڕۆژنامەنووسی:

"هەواڵ، ڕاگەیاندنێکی بابەتییانەی واقعییەتەکانە کە یەك یان چەند بەهایەکی هەواڵی تێدا بێت و لەوانەیە، لەژێر کاریگەریی هۆکاری ڕێکخراوەیی و ناڕێکخراوەییدا پێك هاتبێت."(محسینیان راد ١٣٧١، لە عباسی ١٣٨٦: ٢٨ وەرگیراوە). هەواڵ وانییە کە بەردەوام بە بینینی ڕاستەوخۆی ڕووداوە هەواڵێکەوە بەند بێت " زۆربەی هەواڵەکان لەسەر گوتاری دیکەی وەك دەق و ئاخاوتنی سەرەکی دامەزراون، کە لەوانەیە بۆ خۆیان ڕووداوێکی هەواڵی بن...دەوروبەرەکانی کۆکردنەوەی هەواڵ گرێدراوی ئامانجی تایبەتین، وەك نواندنەوەی ڕووداوەکان لە ڕوانگەیەکی شاراوەی بەرهەمهێنانیانەوە لە گوتاری هەواڵدا. بەم واتایە کە، مۆدێلێك پێکدێت، دەکرێ وەك بنەماکانی پرۆسەی بەرهەمهێنانی گوتار بەکار بێت."(van dijk,1988: 111- 112)" هەواڵ، گوتارێکە لەبارەی کردەیەکی کۆمەڵایەتییەوە کە هەمیشە لە دەرەوەی دەوروبەری ئەو کردەیە و لەناو دەوروبەری کردەیەکی تردا ڕوو دەدا. ئەم پرۆسەیە کردەیەکی کۆمەڵایەتی لەناو کردەیەکی تردا دەگرێتەوە، دەوروبەرسازییەکی دووبارە[١٧]یە.

### ب) هەواڵ لە نێوان ڕاستی و لاگیریدا

**ڕوانگەیەکی باو هەیە کە پێی وایە "*ئەرکی ڕۆژنامەنووسە بەدوای ڕاستیدا بچێت،* واتە ڕۆژنامەنووس چاو و گوێی خەڵکە" یان " میدیاکان *دروستکراون* بۆ *نواندنی ڕاستی*" . *مایکلگرەید* (٢٠٠٥) دەڵێ: " ئەرکی بی.بی.سی. ئەوەیە، لە ڕاگەیاندنی هەواڵدا بنچینەیەکی پتەو دابنێ لە گەیاندنی *ڕاستی، بێلایەنی* و بەدیهێنانی *تێگەیشتنێکی باشتر*"** (بڕوانە: Machin.D, 2008 :63).

**"چونکە دامەزراوەکانی پەخش و پێشکەشکردنی هەواڵ بە شێوەی کۆمەڵایەتی، ئابووری و سیاسی جێکەوتوون، هەموو هەواڵەکان بەردەوام لە گۆشەنیگایەکی تایبەتەوە ڕادەگەیەنرێن."(fowler, 1991: 10). ئەمە هاوپێچی ئەو واتایەیە کە دیارە هەواڵ مەترسیی لاگیریی[١٨] لێ دەکرێ." لاگیریی، *ڕوانگەیەکی یەکلایەنەیە، کە کەسێك لەوانەیە هەیبێ لەبەر هەندێ هۆ یان پاڵنەر بۆ بینینی شتەکان بە شێوەیەکی تایبەت. ڕۆژنامەنووسان لەوانەیە لە گێڕانەوەی***

*ڕووداوێکـدا بـەپێی شـارەزایی، و هەسـت و بـاوەڕ و ئایـدۆلۆژیا لاگـیری لـە شتێك/کەسێك، لایەنێك یان بۆچوونێك بکەن.*

**ت) پێوەرەکانی بە هەواڵبوونی ڕووداوێك:**

**١. بژارەکانی ڕۆژنامەنووس :**

ڕۆژانـە لـە زۆر شـوێنی جیهـان، زۆر شـت ڕوو دەدەن، تەنانـەت ئەگـەر زۆربەیان گرنگ بن، (دانانیان لە توێی لاپەڕەی ڕۆژنامەکاندا)، بولّتەنـەکانی هـەواڵ زۆر درێژ دەکاتەوە. ڕۆژنامە تـەنیا دەتـوانێ زۆربـەیان بگەیـەنێ. هـەر بۆیـە ئێمـە پشت بە ڕۆژنامەنووسان دەبەستین بۆ هەڵبـژاردنی ئەوانـەی کـە بۆمـان گـرنگترن، بیانزانین. " لە نێوان هەزاران ڕووداودا کە لەژێر ڕووکەشی دەسەڵاتدا هەڵدەقوڵێن، ئەوە ڕێپۆرتەرە کە هەڵدەبژێرێ چـی وەسـف بکـات، و چـی پشـت گـوێ بخـات." (& hall jamieson 2003: p .95Waldman). کەواتە، ڕۆژنامەنووس ڕووداوەکـان بۆ بەهەواڵبوون یـان نـەبوون بـژار[١٩] دەکـات. ئـەوەش بـەپێی ئـەو پۆلـە لـە بـەها دیاریکراوەکان دەکات **وا لای بوونەتە کلێشەی زەینی و ڕووداو و کەسەکانی تێدا پـۆلین دەکـات. (بڕوانـە:**1991 ,17fowler**)** بێجگـە لـەوەش ***هەڵسـەنگاندن*** و ***نرخاندنی*** تاکەکەسییانەشی ناکرێ لەبەر چـاو نـەگرین، کـە دەکـرێ بـەهۆی بـەها ئایدۆلۆژییەکانەوە بێت.

**دەسەڵات، ئۆپۆزسیۆن لە مەرج دەخات**

**یەکێتی و پارتی بەناوی "هەڵوێستی نیشتمانییەوە" لایەنەکان لە بەرەیەکدا کۆ دەکەنەوە (هاوڵاتی، ژ. ٩٣٧، ٢٠١٢/١٢/٢٨)**

لــەم هەواڵــەدا هــیچ گــوتنێکی مەرجــداری تێــدا نییــە، وتەبێــژەکانی ئۆپۆزسیۆن کە لەم دەقە هەواڵییەدا ڕایان وەرگـیراوە، مـەرجی چاکسـازییان ڕەت کردووەتــەوە و بــە "پرســێکی نیشــتمانی"یان دانــاوە. بــەڵام ڕۆژنامــەنووس چوارچـێوەیەکی دروسـتکراوی هـەواڵی پێداوەتـەوە. واتـە لـە ڕوانگـەی خۆیـەوە دایڕشتووەتەوە.

**٢. دروستکردنی کۆمەڵایەتی/ کلتووری و دامەزراوەییانەی هەواڵ**

***یـانگ*** (Cohen and Young, 1981: 393–421). پێــی وایــە ئاژانســەکان و دامــەزراوەکانی هــەواڵ دەســتکاریی هــەواڵ دەکــەن. ئــەو ئــەم دەســتوەردانە

ئاگایانەیەی ئاژانس و ڕێکخراوەکانی هەواڵ – بە کاریگەرییەکانی دواتری لەسەر بەهاکانی هەواڵیشەوە – لەلایەن خاوەندارە تایبەتەکان یان دەسەڵاتی بازاڕی سەرمایەدارییەوە بە پیلانێکی بەرنامە بۆ داڕێژراو دەزانێ.

***ستوئارت هال***[٢٠] بەها هەواڵییەکان بە بەهای فۆرمی[٢١] و بەهای "ئایدۆلۆژی "[٢٢] دابەش دەکات. ئەو بەهایانەی وا لەلایەن گالتۆنگەوە دیاری کراون، بە بەهای *فۆرمی* ناو دەبات و وەك زانینێکی تەوافوقی[٢٣] لە بارەی جیهانەوە دایدەنێ کە دەبێتە چوارچێوەیەك هەواڵ تێیدا بەرهەم دێت. ***هال*** پێیوایە، سێ لایەنی "***بەستراوەیی***"[٢٤](بابەتە هەواڵەکە بە ڕووداوەکانی پێش خۆی و ئەو ڕووداوانەی خەریکن ڕوودەدەن لەلایەك) و، **تازەیی/دوایەتی**[٢٥](ڕووداوەکە ئەم دواییانە ڕووی داوە) و ***شایانی هەواڵبوونی ڕووداو/ کەسەکان***[٢٦] ئەم لایەنی فۆرمی بوونە بەهێز دەکەن. هەربۆیە ئەمە وەك پیلانێکی پێشوەختی خاوەندارەکان یان ڕۆژنامەنووسەکان نییە، بەڵکو بەم هۆیانەی خوارەوەیە:

- **پەستانی کات لە ژوورەکانی هەواڵدا**، دەبێتە مایەی متمانەی زیاتر بەو ڕووداوانەی پێشتر ڕوویان داوە.
- **ڕەچاوکردنی چەمکی بێ لایەنی، هاوتەریبی، و بابەتیبوون**، ئەمەش دەبێتە مایەی متمانەی زیاتر بە ***سەرچاوە باوەڕپێکراوەکان***[٢٧]وا مەیلیان لێیە پێکهاتەکانی دەسەڵاتی ئێستا بەرجەستە بکەن و بپارێزن. ئەمەش بە نۆرەی خۆی بەرجەستە نواندنی بژاردەکانی دەسەڵاتی لە بەرهەمی هەواڵدا لێ دەکەوێتەوە. ئەمەش دەبێتە هۆی مانەوەی بەردەوام و گەشەپێدانی بژاردەکانی دەسەڵات. ئەم بژاردانەی دەسەڵات دەبنە "**دیاریکەرە سەرەکییەکان**[٢٨]"ی گوتاری هەواڵ و ئاژانسە هەواڵییەکان. لە ئەنجامدا ئەو بژاردانە بەو دەسەڵاتەی هەیانە دەبنە ڕێکخەری ئەو دەوروبەرانەی کێشەکان تێیاندا دەردەبڕێن و گفتوگۆیان لەبارەوە دەکرێ.

واتە زەبری پێکهاتەیی زیاترە لەوەی پیلانێکی ئاشکرا بێت کە وا لە ڕۆژنامەنووس بکات دەستوەردانی هەواڵ بکات. ئەمەش لەم ڕووانەی خوارەوە خۆی دەردەخات:

- **بژار**[٢٩]دەستوەردانی جیاواز لە پەخش و ڕاگەیاندنی ڕووداوەکە.

- **رەمزاندن**[٣٠]، بەکارهێنانی جۆرێکی تایبەتی زمانی و وێنەیی. (بڕوانـە: Paul Brighton and Dennis Foy 2007: 9 -11).

بە گشتی لە هەموو قۆناغـەکانی بەرهـەمهێنانی هەواڵدا چـەند تـوخمێکی باڵادەست هـەن پرۆسـەکە کـۆنترۆڵ دەکـەن، لەوانـە، ئایـدۆلۆژی، پێوەندییـەکانی دەسەڵات، پرستیژ، ململانێ و زانستی پیشـەیی ڕۆژنامەنووسـان (فـردوس آقـاگـل زاده و همکاران، ١٣٩٠: ٣٠). بۆ نموونـە بڕوانـە ئـەم دەقـە هەواڵییـە لـە ڕۆژنامـەی هاوڵاتی و ڕووداو:

- ***[بارزانی] لەگەڵ سوننە و شیعە دەستی پێکرد و لەگەڵ کورد مایەوە***

بارزانی لە چڕبوونەوەی ململانێکان جگە لە پشتیوانی کـورد، *بەتـەنیا مایـەوە*، هەرچەندە هاوشانی سوننە و شـیعە پێکـەوە دژایـەتی مالیکییـان دەسـت پێکـرد، ئەوەش لە کاتێکدایە *گرژی و ئاڵۆزی پێشمەرگە و سوپا لە ترۆپکەدایە*.

مــاوەی دوو هەفتەیــە ناکۆکییــەکانی نێــوان هــەرێم و بەغــدا چــڕبووەتەوە، بەجۆرێك هەردوو لا لە *ناوچە جێ ناکۆکەکان* هێزیان بەرامبەر یەك کۆکردووەتـەوە و سەنگەریان لێداوە، کە ئەوەش بە بەشێك لە درێژکراوەی ململانێکان ناودەبرێـت کە لە ئایاری ڕابردووەوە لە سەندنەوەی متمانە لە نوری مالیکیدا چڕ بووەتەوە.

***ململانێکان***

لایەنە سەرەکییەکانی لێسـەندنەوەی متمانـە لـە مـالیکی، کـە *بـە نـەیاری* ئـەو ناودەبران، بریتی بوون لە هاوپەیمانی کوردستانی، *زیاتر لـە کەسـایەتی مەسـعود بارزانیدا نوێنەرایەتی دەکرا....*

**چڕبوونەوەی ململانێکان و تۆڵەکردنەوە**

مــالیکی لــە مــانگی تــەمووزی ڕابــردوو دوای دەربــازبوونی لــەو هەوڵانــە [لێســـەندنەوەی متمانـــە] ئۆپەراسـیۆنەکانی دیجلـەی لـە ناوچـە جێناکۆکـەکان بەتایبەت لە کەرکوك و دیالە پێکهێنا....(هاوڵاتی، ژ. ٩٣٦، ٢٠١٢/١١/٢٧).

لـەم هەواڵـەدا ململانـێ و دووبـەرەکی نێـوان ***دەوڵـەتی عێـراق*** و ***هـەرێمی کوردستان بەکەسی***کراوە و لە ململانێی نێوان (***بارزانی و مالیکی***)دا چڕبووەتەوە، چونکە بارزانی بە نەیاری مالیکی دانراوە. واتە، کێشەی نێـوان سـەرۆکی هـەرێمی کوردستان، مەسعود بارزانی و سـەرۆك وەزیرانـی عێـراق، نـوری مـالیکی هاوتـا و

هاوشان کراوە لەگەڵ کێشەکانی نێوان سەرۆك وەزیران و نەیارە عەرەبەکانی تری مالیکی وەك ئەیاد عەلاوی و موقتەدا سەدر.

داڕشتنی هەواڵەکە لە رووی رۆنانەوە وایە کە لە رووداوەکەدا بارزانی دەستی پێدەکا و تۆڵەسەندنەوەی مالیکی لێ دەکەوێتەوە. واتە دروستکردنی زەینییەتێکی مەنتیقی لای خوێنەر کە کارێکی وا (**سەندنەوەی متمانە**) کاردانەوەیەکی وا (**ئۆپەراسیۆنی دیجلە**)ی لێ دەکەوێتەوە، و کەسێکیش کە دەستی پێکردبێ بەرپرسیاری یەکەمە. رۆژنامەکە لێرەدا پرۆسەی سیاسی لە عێراق و کێشەی مێژووی کورد لەگەڵ دەوڵەتە سەرەڕۆکانی عێراقی لاداوە، و هەوڵەکانی مالیکی بۆ لادانی نەیارە عەرەبەکانی و پاوانکردنی دەسەڵات لە دەست خۆیدا پشتگوێ خستووە، بۆ ئەوەی کێشەکە بخاتە ئەستۆی سەرۆکی هەرێم.

ئێستا هەر ئەم رووداوە کە بووەتە بابەتێکی بەردەوامی رۆژنامەیی و هەواڵی لە روانگەی رۆژنامەی (رووداو)ەوە دەخوێنینەوە:

***"تاڵەبانی لە مالیکی توورەیە"***

وەك **دەربڕینی ناڕەزایی** بەرامبەر بڕیارەکانی نووری مالیکی، سەرۆك وەزیرانی عێراق، جەلال تاڵەبانی ماوەیەکە بەغدای بەجێ هێشتووە و گەڕاوەتەوە سلێمانی. گوتەبێژی یەکێتی دەڵی:" مالیکی لەو ماوەیەدا هەنگاوی هەڵەی ناوە...... دەبێ ئەو هەڵانە چاك بکرێن".

تاڵەبانی، پاش گەڕانەوەی لە *گەشتی* چارەسەری لە ئەڵمانیا، بە پەلە کەوتە ئامادەکاری بۆ کۆبوونەوەی نیشتمانیی بەرفراوان لە نێوان لایەنە عێراقییەکان و چارەسەرکردنی قەیرانی سیاسی و گەیشتنە ئەنجام، بەڵام وەك لە لێدوانی بەرپرسانی باڵای یەکێتی و هەڵسوکەوتی سەرۆك وەزیرانەوە دەردەکەوێ پێوەندی نێوان یەکێتی و ئیئتیلافی دەوڵەتی یاسا بە سەرۆکایەتی مالیکی کە هاوینی رابردوو لە لایەن تاڵەبانییەوە لە تەڵەی لێسەندنەوەی متمانە رزگار کرا، لە دۆخێکی زۆر باشدا نییە. ...بە پێی قسەی بەرپرسانی یەکێتی بێزاری تەواو لە مالیکی بە تاڵەبانییەوە دیارە. بەرپرسێکی یەکێتی کە نەیویست ناوی بڵاوبێتەوە و ئاشکرا بێت. بە (رووداوی) راگەیاند گەڕانەوەی ئەم ماوەیەی تاڵەبانی بۆ

سلێمانی، بۆ ناڕەزایی دەربڕینە بەرامبەر هەڵسوکەوتەکانی مالیکی. تاڵەبانی لە مالیکی تووڕەیە.

فەرید ئەسەسەرد، ئەندامی سەرکردایەتی یەکێتیش بە (رووداو)ی راگەیاند" مالیکی بەڵێنی بە تاڵەبانی دابوو کە پێکهێنانی هێزی دیجلە دوابخات، کەچی هەر پێکیهێنا و تائێستا بەردەوامە....."**تاڵەبانی دەتوانێ بەیەك لێدوان قەیرانی عێراق چارەسەر بکات**"، ئەمە قسەی فەرهاد ئەترووشییە.....(ژ.٢٣٥ ، رووداو) دووشەممە ٢٠١٢/١١/١٢، ل.٣٠).

لەم دەقەدا سەرەتا سەفەری تاڵەبانی بۆ چوون بۆ چارەسەری، بەناوی *گەشت* هاتووە. کە ئەمەش گەیەنەری ئەم واتا هاوپێچەیە، سەفەرەکە زیاتر گەشت و گوزارە تا ئەوەی چارەسەری بێت. پاشان جەخت کراوەتە سەر وەرگرتنی قسەی راستەوخۆی کەسانی دەسەڵاتداری ناو یەکێتی، بۆ ئەوەی کە بزانرێ کێشەکانی نێوان (مالیکی و تاڵەبانی) / (یەکێتی و ئیئتیلافی یاسا) بە کوێ دەگات:

*لە لێدوانی بەرپرسانی باڵای یەکێتی و هەڵسوکەوتی سەرۆك وەزیرانەوە دەردەکەوێ پێوەندی نێوان یەکێتی و ئیئتیلافی دەوڵەتی یاسا بە سەرۆکایەتی مالیکی کە هاوینی رابردوو لە لایەن تاڵەبانییەوە لە تەڵەی لێسەندنەوەی متمانە رزگار کرا، لە دۆخێکی زۆر باشدا نییە.*

واتە پێوەندیی باشی نێوان دوو حیزب بووەتە هۆی ئەوەی متمانە لە مالیکی نەسێندرێتەوە. بۆیە لە کۆتاییدا بە گوتنێکی ئەندام پارلەمانێکی نزیك لە رۆژنامەکە دەڵێ: "تاڵەبانی ***دەتوانێ*** بە یەك لێدوان قەیرانی عێراق چارەسەر بکات". واتە چارەسەری کێشەکە لە دەست تاڵەبانیدایە و نایکات. گوتنەکە وا دەنوێنێ کە تاڵەبانی نابێ هەر "تووڕە"بێ یان"ناڕازی"، بەڵکو دەبێ راستەوخۆ بەرەو رووی مالیکی بێتەوە. ئەگەر دەڵێ "**دەتوانێ**" ئەم واتایەش هاوپێچ دەکات کە وا دەگەیەنی مەیلی لێ نییە بیکات. بە تایبەتی ئەم لاگیرییە ئەوکاتە زۆر بەرچاو دەبێ کە بەرپرسانی پارتی و هاوبەش لە دەسەڵاتی حکومەتی ناوەندیدا دەخرێنە پشتەوە، وەك ئەوەی هیچ بەرپرسیارێتییەکیان نەبێ. (لەوانە وەزیری دەرەوەی عێراق، جێگری سەرۆك وەزیران و جێگری سەرۆکی پارلەمان).

هەردوو رۆژنامەکە سەرەڕای ئەوەی ململانێیەکی سیاسی و فیزیکی نێوان دەوڵەتی عێراق و حکومەتی هەرێمدا دەخەنە روو، هەرچەند ئەمان زیاتر وەك شتێکی کەسی یان حیزبی نێوان لایەنە سیاسییەکانی بەشدار لە بەڕێوەبردنی وڵاتی عێراقدا ئامـاژەی پـێ دەکـەن، نـەك کێشـەیەکی بـەرفراوانتری مێـژووی کوردستان و دەسەڵاتی ناوەندیی لە بەغدا. ئەمـەش بـە شـێوەی هـاوپێچ دەربـڕی ئەوەیـە کـە ململانێیـەکی شـاراوە لـە نێـوان ئایدۆلۆژی زاڵ بەسـەر رۆژنامـەکان و پێوەندییـەکانیان بـە دەسـەڵاتەکانی هـەرێمی کوردسـتانەوە هەیـە. تەنانـەت لـە دۆخێکـی قـەیراناوی وەك لەشکرکێشـیی دەوڵـەتی ناوەنـدیی عێـراق بـۆ سـەر کوردسـتان ئـەم ململانێیـە بەردەوامـە و بـە بەرپرسـیارданانی یـەکتر تـاوانی لەشکرکێشییەکانی دەوڵەتی ناوەندی عێراق بۆ سەر کوردستان سووك دەکەن.

**ج) بەهاکانی هەواڵ**

یەکەم کەسەکان کە جۆرەکانی بەهاکانی هەواڵیان وەسف کرد ***"گاڵتونگ و رۆژ"*** (١٩٦٥) بوون . کە دیاریان کرد کامانە رووداوی دیاری نێودەوڵەتی و نـەك ئەوانەی دیکە وەك هەواڵ بژار بکرێن. [٣١] کە بە پێی گرنگییان بریتی بوون لە:

١. **مـەیین/ ژمـارەی رووداوانـەکانی** [٣٢]، برگەیـەکی پێویسـتی کـاتیی بـۆ ئـەوەی رووداوێك خۆی دەربخات و واتادار بێت.

٢. **رادەی بـەرفراوانی** [٣٣] پانتـایی بـەرفراوانی لـە ئاسـتێکی نائاسـایی و چاوەڕواننەکراویدا بۆ ئەوەی ببێتە هەواڵ.

٣. **روونـی** [٣٤]: کـەمترین نیشـانەی لێڵـی تێدا بێـت، رووداوەکـە زۆر خرابێتـە بـەر سەرنج.

٤. **پرواتـایی** [٣٥] ، پێوەندییـەکی کولتـووری و هاوئاهـەنگی یـان ناهاوئاهـەنگی کۆمەڵایەتی لەسەر یەك رووداو.

٥. **شیاوی پێشبینی** [٣٦] چاوەڕوانی یان ئارەزووی روودانی رووداوێك، و ئەوەی کـە دەبێتە هەواڵێك.

٦. چاوەڕوان نەکراوی [٣٧]، شتێکی کە بەتەواوی نا ئاسـایی بێـت، و شـایانی ئـەوە نەبووبێ پێشتر پلانی بۆ دانرابێت.

٧. **پێکهاتوو لە رووی هونەری**[٣٨]، ئایا بە شێوەیەکی تایبەتی گونجاوە بۆ ئەوەی رووی دەرچوونی لە راگەیەنە یان زۆرترینی فرۆشی رۆژنامەکانی هەبێ.

٨. **بەردەوامی**[٣٩]، کاتێ رووداوێك دەبێتە هەواڵ تێن و تاوی تایبەت بەخۆی وەردەگرێ.

**٩. ئاماژە بۆ بژاردە نەتەوەییەکان**

**١٠. ئاماژە بۆ تاکی بژاردە**

**١١. ئاماژە بۆ تاکەکان**

١٢. **ئاماژە بۆ شتە خراپەکان** [هەواڵە ناخۆشەکان] [٤٠]

" چەمکی *بەهاکانی هەواڵ* زۆرجار بۆ روونکردنەوەی بژاری یەکە هەواڵییەکان، دەرفەتەکانی چاپ و بڵاوبوونەوەیان، یان پۆلینکردنی واقعییانەی هەواڵ بەکار هاتووە (van dijik,1988: 119). ***"ئەو پێوەرانەی کە بەتەنیا یان هەندێ جار بە پێکهاتنیان لەگەڵ یەکتر رووداوێك دروست دەکەن و لە سروشتی رووداوەکە خۆیدا هەن، بەهاکانی هەواڵن" (عباسی، ١٣٨٦: ٣٥).***

"بە پێی سەرچاوەکانی رۆژنامەنووسی بەهاکانی هەواڵ لە دوو روانگەوە سەیر کراون: لە روانگەی پیشەی رۆژنامەنووسەوە، بە دابڕاوی لە تایبەتمەندییەکانی رووداوێك وا هەواڵەکەی دروست کردووە، بۆ ئەوەی شایانی بە هەواڵبوون و راگەیاندن بێت. روانگەکەی تر وابووە بەرفراوانتر بڕوانێ و بوارە جیاجیاکانی وەك ئایدۆلۆژی، باری کلتووری، جەبری تەکنۆلۆژی و... هتد لێکدات، و روانگەی سێیەم ئەو گۆڕانانەی ناو میدیا بەتایبەتی و پێوەندییەکانی نێوان بەرهەمهێن و بەکارهێنەکانی هەواڵیش لەبەرچاو دەگرێ." (Brighton and Foy 2007: 7).

وەك ***ماکس هاستینگز*** سەرنووسەری رۆژنامەی (دەیلی تێلگراف) دەڵێ:

" خوێنەران بیرۆکەیەکی بەڵگەداریان نییە لەوەی چی دەکەن یان چییان دەوێ لە رۆژنامەکانیان ـ ئەوان سەرنووسەرەکانیان بە وەکالەت داناوە بۆ ئەوەی بڕیاریان بۆ بدەن. (Hastings,2002: 100).

بۆیـە، لەئـەنجامی ئـەو لێکدانـەوە تیۆرییـەی سـەرەوەدا بـە پێویسـتی دەزانین ئەم چەمکە سەرەکییانەی خوارەوە کە کۆی چالاکیی میدیایی پێکدێنن و خوێندەواریی ئەم بوارەش بنیات دەنێن، بخەینە بەرباس.

### ٣. میدیاکان دروستکراون:

بەرهەمی میدیا بە وردی کاریان لەسەر دەکرێ و دەستکردن، بـە ئامـانج و لە روانگەی تایبەتەوە و لە ڕێی بەکارهێنانی فۆرم و تەکنیکی تایبەتەوە بەرهەم دێن. ئەو پەندە کۆنەی کوردی کە دەڵێ: "زمان هەرگیز درۆ ناکات" و ئەم پەنـدە کۆنەی دەڵێ: "کامێرا هەرگیز درۆناکات"، ئاماژە بەو شێوەیەیە کە ئێمە ناچـارین پێوەنـدیی نێـوان "واقعییـەت"[٤١] و "نواندنـەوەی واقعییـەت" کـە میـدیاکان دروستیان کردووە، قـەبووڵ کـەین. تەنانەت"دانـەپاڵی گوتنێـك بـە سەرچـاوەیەك گرنگە بـۆ ئاسـتی ئەو"واقعییـەت"ەی دەکـرێ بـۆ بابەتـە هـەواڵێك ئیـدیعا بکـرێ (Joanna Thornborrow, 2004:64)."بۆ نموونـە ڕووداوێـك دەکـرێ بـە شـێوەی جیـاواز بخرێتــە ڕوو، دیـارە ئەمــەش پێوەنـدیی چـۆنێتی هەڵســەنگاندنەکانی ڕۆژنامەنووس، سیاسەتی ڕۆژنامەکە و پێوەندییەکانی دەسەڵاتەوە هەیە:

- ***لێژنە سەربازییەکەی هەرێم پێش دانووستاندن شکستی خۆی ڕادەگەیەنێت*** ***(هاوڵاتی، ژ. ٩٣٥، ٢٠١٢/١١/٢٦).***
- ڕۆژنامەی ڕووداو لە زمان سەرچاوەیەکی نزیك لە ڕۆژنامەکەوە ئامـاژە دەکـات: ***مالیکی دەرگای گفتوگۆکانی داخست (ڕووداو، ژ٣، ٢٠١٢/١٢/٢٣٨ ).***

کەواتــە، " هــەواڵ، *پەخشــکردن یــان چوارچێوەســازییەکی دووبــارەی* ڕووداوێکە. ڕەوشی هەر بابەتێك بەندە بەوەی، کێ هەڵی بژاردووە بۆ لێکدانـەوە و بۆچوون و پێناسەکانی کێ بەدواداچوونی بۆ کراوە.

ڕۆژنامەنووسان کۆمەڵێ پێوەر بۆ دیاریکردنی ئـەوەی شـایانی ڕاگەیاندنـە پێڕەو دەکەن. کەواتە هەواڵ نواندنەوەیەکی بابەتییانەی واقعییەت نییە – هـەواڵ پێکهـاتێکی کەلتوورییـە، بـەها چەسـپاوەکان دەڕەمزێنـێ. ئـەم بەهایانـە کۆمـەك دەکەن بە ڕۆژنامەنووسان بۆ دیاریکردنی ئەوەی شـایانی گەیاندنـە و لـە ئەنجامـدا ئـەوەی ڕادەگەیـەنرێ."(Caldas-Coulthard, C. R: 2003: 273 ). هـەروەك

داگلاس کاتێر دەڵێ: " لە نێوان هەزاران رووداودا کە لە ژێر چەرمی دەسەڵاتدا دەردەکەون، ئەوە پەیامنێرە هەڵدەبژێرێ چی وەسف بکات و چی پشتگوێ بخات." ئەم بۆچوونانە دەمانگەیەننە ئەو راستییەی کە بڵێین، هەواڵ دەکرێ لەلایەن رۆژنامەنووسەوە دەستکاری بکرێ و لە پێناو بەرژەوەندییەکی تایبەتدا بەکاربێت.

بەڵام **فێرکلاف** (63: 2008)، پێی وایە ئەوە هەر رۆژنامەنووس نییە دەستکاری هەواڵ دەکا، بەڵکو هەواڵ سروشتێکی دامەزراوەیی هەیە و دەقی هەواڵەکان"بەرهەمی کردەی پیشەیی و دامەزراوەیی تایبەتن، ئەگەر ئێمە دەمانەوێ لەو شتەی ئەوانە دەینوێننەوە، چۆن دەینوێننەوە، و ئەوەی ناینوێننەوە تێبگەین، پێویستە ئەوانە لە دەوروبەری ئەم کردە دامەزراوەیی و پیشەیی[٤٢]یانەدا درك پێ بکەین. (چیرۆکە) هەواڵەکان نابێ وەك پەنجەرەیەکی ساکار بەرەو جیهان درك پێ بکرێن و نابێ بەو پێیە کە گوایە ئەوە دروست[٤٣]ە یان لاگیر[٤٤]ە هەڵسەنگێندرێ، چونکە ئەمە سەرنجنەدانە بەو شێوە بنەڕەتییەی کە دامەزراوەی رێکخستنی هەواڵ و شێوەکانی کۆکردنەوەی هەواڵ بەهەمان رادە شێوە دەدەن بەو شتەی دەبێتە هەواڵ کە رووداوەکان خۆیان شێوەی پێ دەدەن. جۆرەکانی دەستکاری[٤٥] کە ئێمە بە "لاگیری"[٤٦] ناوی دەبەین، لەو دەوروبەرەدا کە هەواڵەکە دەستکاری دەکرێ بەڵگەنەویستە. لە راستیدا بیرکردنەوە لەبارەی هەواڵ بەپێی "راستی"و لاگیری" لە بنەڕەتەوە خزمەت دەکات بە لارێکردنی سەرنجمان لە ماهییەتی دامەزراوەیی هەواڵ." لێرەدا دەمانەوێ بۆ هەڵوەشاندنەوەی ئەو بەرهەمانە کار بکەین، لەبارەیانەوە بە جیا بدوێین بۆ ئەوەی پێشانی بدەین چۆن دروست دەبن و دەگەڕێین بەدوای ئەو بڕیار و هۆکارانەی لە پشت دروستبوونیانەوەن.

### ٤. میدیاکان واقعییەتە دروستکراوەکە دەنوێننەوە:

ئەم بنەمایە، گرێدراوی بەدیهاتنی ئەوەیە کە پێوەندییەك لە نێوان ئەو شێوەیەی میدیا جیهان دەنوێنێ و ئەو شێوەیەی ئێمە وەك بەکارهێنەکانی میدیا جیهان درك پێدەکەین، لە ئارادایە. کاتێ ئێمە پێوەندییەکی راستەوخۆ یان



هاوڵاتی

ماليكی بودجەی هەردوو كۆلێژی سەربازیی قەڵاچوالان‌و زاخۆ دەبڕێت

ئەگەر چاكسازی نەكرێت؛ ئۆپۆزسیۆن دەكشێتەوە

ئەزموونێکی خێرامان لـە تـاك، دامـەزراوە، بابەت، کەس یـان شـوێنی نوێنـدراو نییـە، میدیا بۆ دەلاڵیکردنی نێوان ئێمـە و ئەوانـە ئامادە دەبن.

لـــە هـــاوڵاتی ژ. ٩٣٧، ڕێکـــەوتی ٢٠١٢/١١/٢٨دا دوو ڕووداوی لێـك جیـاواز دەکرێنــە مانشــێت و وێنــەی ســەرۆکی هەرسێ لایەنی ئۆپۆزسیۆنیش (گۆڕان، یەکگرتوو و کۆمەڵ) لە نێوانیاندان:

مانشێتی سەرەوەی وێنەکە/ یەکـەم، پێوەنـدیی بـە گوشـارەکانی مالیکییـەوە هەیە:

***<u>مالیکی بودجەی هەردوو کۆلێژی سەربازیی قەڵاچوالان و زاخۆ دەبڕێت.</u>***

- مانشـێتی ژێـر وێنەکـە/ دووەم: ***ئەگـەر چاکسـازیی نـەکرێت، ئۆپۆزسـیۆن دەکشێتەوە.***

لە ڕاستیدا مانشێتەکان و دەقەکە بە واتـای زەقـت بـۆ سـەر دەسـەڵاتی هەرێمـەوە تۆکمە کراون. دوو ڕووداوی لێکجیاواز دەقێکی هەواڵییان بەرهەم هێنـاوە کـە وێنـە و زمان تێیدا هاوبەشن.

- ***بەرپرسێکی کورد لە ڕووسیا زانیاریی لەسەر گەندەڵییەکە هـەبووە*** (هـاوڵاتی، ژ. ٩٣٥، ٢٠١٢/١١/٢٦)

ئەم سەردێڕە دەری دەخات کە ئێمە وەك خوێنەر، تەنیا لە ڕێی میـدیاوە دەسـتمان بـە هەنـدێ هـەواڵ لـەبارەی ڕووداوێکدا ڕادەگـات، وا پێوەندییـەکانی دەسەڵات دەیانەوێ شاراوە بێت. سەرەڕای واتا شاراوەکانی ڕۆژنامەکە بـۆ بـژاری ئەم هەواڵە کـە دەیـەوێ بەرپرسـی کـوردیش هاوبەشـی گەندەڵییـەکانی دەوڵـەتی مالیکی بکات.

### ٥. پەیامی میدیاکان هەڵگری بەها و ئایدۆلۆژین:

ئایدۆلۆژی لە ڕوانگەی فێرکلافەوە بریتییە لە: " واتا لـە خزمـەت دەسـەڵاتدا (Fairclough, 1995: 14)" بەواتایەکی دیکە ئایدۆلۆژی لە ڕوانگـەی ئـەوەوە ئـەو

واتا بنیاتنراوانەن کە کۆمەك دەکەن بە بەرهـەمهێنان، بەرهەمهێنانـەوە و گـۆڕینی پێوەندییـەکانی سـوڵتە (Fairclough, 1995: 87). بـە ئاشـکرا یـان بـە شـێوەی شـاراوە، میـدیای بـاو و زاڵ پـەیامی ئایـدۆلۆژیاوی، چـەمکە بـەهادارەکان، هێـز و دەسەڵات دەگەیێننە وەرگر. لێرەدا ئەوەی گرنگە ئێمـە وەرگـران بیـزانین ئەوەیـە کە، (چی) یان (کێ) بزرە کە لەوانەیە گرنگتر بێت لەوەی (چی) یان (کێ) لـە دەق و پەیامی میدیادا دەرخراوە. "یەکێ لە گـرنگترین و سەرنجڕاکێشـترین لایەنـەکانی دەسەڵاتی شاراوەی میدیا لەو تێڕوانینە زمانییەوەیە کە خەڵك و ڕووداوەکانی پـێ ڕادەگەیـەنرێ "(Joanna Thornborrow, 2004 :58) [٤٧]." هـەواڵ ڕووداوەکـە نییە، بەڵکو ڕاپۆرتێکی مەبەسـتدار و ئایـدۆلۆژیکیی دروسـتکراوە لـە ڕووداوەکـە. بەڵام، خەڵك بۆیە هەواڵـەکان سـەیردەکەن یـان دەخوێننـەوە چـونکە پێیـان وایـە هەواڵەکان لەبارەی واقعییەتەکانەوەن. واتای هاوپێچـی ئەمـە، ئەوەیـە کـە ئەگـەر ئاگـــاداری هەواڵـــەکان بـــی لـــەبارەی واقعییەتـــە کۆمەڵایەتییەکانـــەوە ئاگادارتری."(Caldas-Coulthard, C. R: 2003: 273).

زۆرجار ئەم ئایدۆلۆژی و بەهایانەن، دەبنە هۆی جیاوازیی نێـوان گوتارەکـان و لە ڕاستیدا نێوان "ئێمە" و "ئەوان" و سنووری ناسنامە بەپێی ئەم واتـا و بـەها ئاشکرا و شاراوانە دەردەکەوێ. بۆنموونە بڕوانە ئەم نموونانەی خوارەوە:

- مـالیکی ڕۆژی ٢٠١٢/١٢/١دا لـە کۆنگرەیـەکی ڕۆژنامەوانیـدا لـە بەغـدا گـوتی ئەگەر ئەمجارە شەڕ دروست بێتـەوە، وەك سـەردەمی بـەعس نابـێ کـە دژی دەســەڵات دەکــرا، بــەڵکو دەبێتــە شــەڕی نەتــەوەیی نێــوان **کــورد** و **عەرەب**"(ڕووداو، ژ٢٣٨، ٢٠١٢/١٢/١٢).
- ***مالیکی بۆ هاوڵاتی:*** ***<u>دەبێت</u> سەردانەکانی <u>هەرێم</u> بۆ دەرەوە*** لە <u>ڕێگەی ئێمـەوە</u> ***بێت (هاوڵاتی، ژ٩٣٣، ٢٠١٢/١١/٢٢)***

***لەم دەقەدا وشەکانی (دەبێت)، لە ڕێگەی و (ئێمە) دەربڕی پێگەی دەسەڵاتی قسەکەرن کە لە ڕووی هێزەوە دەدوێ.***

- ***<u>بەناو ماڵێکی ڕێکنـەخراو</u>، <u>بـە بـێ وورەکـەی جـاران و دۆسـتەکانی پێشـوو</u> (پێشمەرگە دەخرێتە شەڕەوە) (هاوڵاتی، ژ. ٩٣٣/ ٢٠١٢/١١/٢٢).***

لەم دەقـەدا رۆژنامەکـە پێچـەوانەی نـاوەرۆکی ئـەو قسـانەی لـە زمـان بـەرپرس و کەسـانی سیاسـی دەسـەڵاتداری وەك پارلـەمانتار وەری گرتـووە، دەکەوێتـە هەڵسەنگاندنێکی تایبەتی خۆی لە رووداوەکان، ناومـاڵ (هـەرێمی کوردسـتان) بـە رێکنەخراو وەسف دەکات و پێشمەرگە بە ورە دابەزیو (بە بێ ورەکـەی جـاران) و ئێرانیش بە(دۆست) دەنرخێنێ.

- هاوڵاتی: (ژ ٩٣٣) ٢٠١٢/١١/٢٢

***هاوڵاتی وردەکاری هەماهەنگی ئێستای نێوان سوپای عێراق و پێشمەرگە ئاشکرا دەکات***

***لە بەغدا و هەولێر شەڕە و لە ناوچە جێ ناکۆکەکانیش هەماهەنگن (ل ٠ ٣/ لای راست)***

رۆژنامەکـە (هەماهـەنگیی) نێـوان هێـزی پێشـمەرگە و سـوپای عێـراق بـە هەبوونی ٢٠ بازگەی هاوبەشیی نێوانیان لە وشـەی بـە (*پاساوی ئـاڵۆزیی ئـەمنی*) وەك پیلانێکی دروسـتکراوی دەسـەڵاتەکانی نێـوان هـەرێم و بەغـدا لێکدەداتـەوە، بۆیـە لـە کۆتـایی سـەر سـەردێرەکەدا وشـەی (*ئاشکرا دەکات*) بـەکار دێنـێ. بەتایبـەتی، لـە دەسـتەواژەی (**دەنگـۆی** ئـاڵۆزیی ئـەمنی)دا نـاواقعیبوون و ناجیـدیبوونی کێشـەکە بـە خوێنەرەکـەی دەگەیـەنێ. کاتـێ لـە زمـان ئەنـدام پەرلەمانێکی کە لە ئایدۆلۆجیای رۆژنامەکەوە نزیك دەگێڕێتەوە:

***"هەڤاڵ کوێستانی، ئەندام پەرلەمانتاری گۆڕان لە بەغدا، پێی وایە هـەرێم و ناوەند دەیانەوێت لە رێگەی دروستکردنی قەیرانە نـاوخۆیی و دەرەکییەکانـەوە "شکستەکانیان"، لە گەندەڵی و نادادپەروەری، بشارنەوە*** لـە چارەسـەرنەکردنی کێشە ناوخۆییەکان".

رۆژنامەکەش هەر ئەم تێگەیشتنە دەکاتـە بنـەمای هـەڵێنجانی سـەردێڕەکە. لەم دەقەدا باکگراونـدی پرۆسـە سیاسـی و هەماهەنگییـەکانی پێشـوو، هاوبەشـی هەردووك لا لە ئیدارەی ناوچەکە دەخاتە پشـتەوە و هەنووکـەیی بـوونی کێشـەکە دەخاتە بەرەوە. بەتایبەتی قسەی ئەو کەسانە دەکرێتـە بەڵگـە کـە لـە تێڕوانینـی رۆژنامەکـە بـۆ رووداوەکـەوە نـزیکن، و لایەنـەکانی بەرانبـەری ئـەم تێڕوانینـە لـە وەرگرتنی رایان لادراون.

هەمان رووداو لە رۆژنامەی (رووداو، ژمارە ٢٣٤ رێکەوتی ٢٠١٢/١١/٥)دا هەیە.

*عەبدولئەمیر زەیدی:*

***هەماهەنگییەکی باش لە نێوان دیجلە و پێشمەرگەدا هەیە***

*فەرماندەی فەرماندەیی ئۆپەراسیۆنەکانی دیجلە رایگەیاند کە "هەماهەنگییەکی زۆرباش" لە نێوان ئەوان و هێزی پێشمەرگەدا هەیە و گوتیشی "دەمانەوێ ئاستی هەماهەنگییەکە بەرزتر کەینەوە"، ئەوە لەکاتێکدایە کە بەرپرسانی کورد لە دژی پێکهێنانی ئەو هێزە لێدوانی ئاگرین دەدەن.....*

*فەرماندەیی ئۆپەراسیۆنەکانی دیجلە بە فەرمانی مالیکی، لە کۆتایی مانگی ئایاری ئەمساڵدا پێکهات. بەرپرسانی کورد وەك هەنگاوێکی "ئیستفزازی" لەو هەنگاوە دەڕوانن و زەیدیش بە "ئەنفالچی" ناودەبەن.*

*زەیدی سەرسوڕمانی خۆی لەو ناڕەزاییە دەربڕی کە بەرپرسانی کورد بەرامبەر پێکهێنانی ئەو فەرماندەیە پیشانی دەدەن و گوتی "ئەسڵەن هەماهەنگییەکی زۆرباش لە نێوان ئێمە و پێشمەرگەدا هەیە" لەو بارەیەوە نموونەی بە مەحموود سەنگاوی هێنایەوە و گوتی: "تەنانەت کاك مەحموود سەنگاوی کاتێك پەلاماری بنکەیەکی سوپا درابوو، ئینجا هەڵاتبوون بۆ گەرمیان، من خۆم پەیوەندیم پێوە کرد و گوتم ئەو کەسانە لای ئێمە داواکراو و تۆمەتبارن، ئەو خۆی زۆری هاوکاری کردین و فەرمانی دا ...رادەستیان کردینەوە" .....مەحموود سەنگاوی ..گوتی "راستە دوو عەرەبی تیرۆریستمان لە رێگەی ملازمێکی کوردەوە رادەستی هێزی دیجلە کردووە...."*

هەردوو رۆژنامەکە بە پێشگریمانەی شەڕەوە روانیویانەتە رووداوەکە. بەڵام لەمەیاندا رووی رووبەڕوو بوونەوە یان هەماهەنگییەکە لە نێوان دوو لایەنی زەیدی (وەك فەرماندەی دانراوی مالیکی) و سەنگاوی (ئەندامی مەکتەبی سیاسی یەکێتی) سەیر کراوە. واتە رۆژنامەنووس لە دروستبوونی کێشەیەکی ئاوادا دەیەوێ رووداوی پێشبینیکراو و پێشگریمانەکراوی خۆی دروست کات و بیکاتە هەواڵ. واتە ئەم رووبەڕوو بوونەوەیە لایەنێکی واقعییانە بە خۆ بگرێ.

**٦. پەیامەکانی میدیا دواهاتی کۆمەڵایەتی و سیاسییان هەیە:**

ئەم بنەمایە لە پێوەندیی نێوان وێنە و کاریگەریی، ناوەرۆك و دواهاتەوە بەدی دێت. لەشوێنێ کە بەکارهێنان و ماڵپەرستی زاڵە چۆن منداڵەکان بۆ بەها و

بایەخە مەعنەوییەکان هان بدەین؟ چۆن لەکاتی هەڕەشە و مەترسییەکاندا باس لە گیانی لەخۆبوردەیی بکەین. لە ئەنجامی بەکارهێنانی میدیاوە بۆ پێوەندییە تاکی و سیاسی و کۆمەڵایەتییەکان لەوانەیە بەرەورووی سزای خێزان، کۆمەڵ و حکومەت ببنەوە.

- **هەرێم بەرگری لە ٥٠٠ پۆلیسی کورد ناکات (هاوڵاتی، ژ. ٩٣١)**

ئەم مانشێتە پێچەوانەی ناوەڕۆکی دەقەکەیەتی، چونکە لە دەقی هەواڵەکەدا ئاماژە بە هەوڵدانی هەرێم بۆ جێگیرکردنی پلەی پۆلیسەکان دەکات، هەرچەند لاوازیش بێت. کە ڕۆژنامەکە بە(لاوازی وەسف دەکات). ئاماژەش بە نامەیەکی (کەریم سنجاری وەزیری ناوخۆی هەرێم) دەکات، بەڵام هیچ زانیارییەك لە دەقی نامەکە ناخاتە ڕوو. هەواڵەکە بەم جۆرە دەست پێدەکات:

*"٥٠٠ پۆلیسی کورد لە کەرکووك، هەڕەشەی دەست لەکارکێشانەوە دەکەن. لەبەرامبەر جێگیر نەکردنی پلەکانیان لە لایەن حکومەتی ناوەندی و داگرتنیان لە مفەوەزەوە بۆ پۆلیس، هەوڵەکانی هەرێمیش بۆ بەرگریکردن لێیان بە لاواز دادەنرێ".*

ئەم مانشێتە کردەی جیاوازیدانەرانەی دەوڵەتی مالیکی و عێراقی خستووەتە پشتەوە و بەرپرسیارێتی پۆلیسەکانی لە بەرانبەر پرسێکی چارەنووسسازی وەك پرسی کەرکووکی لە بەرانبەردا داناوە. واتە ئەرکە نیشتمانییەکە لە کات و ساتێکی وادا کە پۆلیسێك بەرانبەر هەڕەشە بۆ سەر نیشتمانەکەی هەیەتی دەخاتە دواوەی زیادکردنی پلەکانیان، کە ئەوەش لەلایەن دەوڵەتی عێراقەوە و لەبەر کوردبوونیان کراوە.

**٧. وەرگران واتای تایبەت بە خۆیان دەگەیەنن:**

وەرگران لە بەرانبەر پەیامی میدیاکاندا بێدەسەڵات نین. ناوەڕۆك و پەیامی میدیاکان لە فیلتەری زانین و باوەڕ و ئەزموون و سیستەمی بەهاکانی خۆیان دەدەن.

**٨. میدیاکان ئامانجی تیجارییان هەیە:**

زۆربەی بەرهەمە میدیاکان جۆرێك بزنسن. کەواتە بەدوای سوود و قازانجەوەن. سەرەڕای ئەوەش پیشەسازی میدیا سەر بە تۆڕی کۆمپانیا

دەسەڵاتدارەکانن وا دەسەڵاتیان بەسەر ناوەڕۆك و دابەشکردنی میدیاکاندا بە کار دێنن. لێکۆڵینەوە لە خاوەندارەکان و کونترۆڵی میدیا پێویستە چونکە بە شێوەیەکی ڕێژەیی کۆنترۆڵی ئەو تاکانەی بەرهەمی میدیاییەکان دەبینن، دەبیستن و دەخوێننەوە، بە سەر میدیادا کەمە.

وەك، ریکلامکردنی بازرگانی و پشت بەستنی میدیاکان بە دەسەڵاتی سیاسی لە بەردەوامبوونیان بۆ دەرچوون. نیوەی دووەمی داوێنی لاپەڕەی کۆتایی رۆژنامەی هاوڵاتی و نیوەی لاپەڕەی یەکەمی رووداو ریکلامی بازرگانییان تێدایە. هەندێ جار هەواڵی پێوەندیدار بەوانەشەوە بڵاو دەکەنەوە. وەك: ***"ئاسیا سێل سوپاسنامەیەکی لە کۆمکاری کەمئەندامانی عێراقەوە پێگەیشت. (رووداو، ژ. ٢٣٤، ل.٢)".***

**گوتار و پێکهێنانی ناسنامە:.**

ناسنامە ئەوەیە کە ئێوە کێن و چین... ئێوە"کێ" و "چی"ن، [کورد و عەرەب] بەندە بە دەوروبەر، هەلومەرج، و ئامانج، و ئەوەی کە بەردەوام گرێدراوی پرۆسە هێماییەکانی نواندنەوەن [زۆر جار ئەم دوو هێما جیاکەرەوەیە لە هێمای *عێراقییەکان*دا کۆدەبنەوە و دەسرێنەوە]: هێماکان، گێڕانەوەکان، ژانرە دەقییەکان وەك فۆرمە ستانداردەکان و سیڤییەکان. لە راستیدا ناسنامە بە تەواویی هێماییە، و هەر کردەیەکی هێمایی کردەیەکی ناسنامەییە کە ئەو زانیارییانەی لەبارەی خۆمانەوەن تێیدا دەخەینە روو ( Blommaert 2005: 203-4). "یەکێ لە ئاشکراترین واتا زمانییەکانی بنیاتنانی ناسنامەی تاکەکان لە رێی ناودانان و ناوبردنەوەیە. ئێمە لە رێی ناوەکانمانەوە لە ئەندامانی گرووپێکی تر جیا دەکرێینەوە [*سوپای عێراق و پێشمەرگە*]/ [*..دەبێت سەردانەکانی **هەرێم** بۆ دەرەوە لە رێگەی ئێمەوە بێت.*]/ [*لە بەغدا و هەولێر شەرە*]. [*"ئەسڵەن هەمامەنگییەکی زۆرباش لە نێوان ئێمە (هێزی دیجلە)و پێشمەرگەدا هەیە*]. ئەو وشانەی هەڵیاندەبژێرین بۆ ئەوەی بەرانبەرەکانمانی پێ بانگ بکەین، شێوەیەکی گرنگن لە خستنە رووی ئەوەی کە چۆن *خۆمان* لە بەرانبەر *ئەوان* دادەنێین، [*...دوو عەرەبی تیرۆریستمان لە رێگەی ملازمێکی کوردەوە رادەستی هێزی*

*دیجلـە کـردووە....*] ئەمانـەش لـە رووی دروسـتکردنی دووری یـان نزیکـی کۆمەڵایـەتی، نیشـانەکانی رێزگـرتن، پابەنـدی یـان بـێ رێـزی بـەپێی نـەریتی سیسـتەمی بـانگکردنی زمانێکـەوە دروسـت دەبـن. لـەو شـوێنانەی پێکـدادانی کۆمەڵایەتی هەیە، پێکدادانی زمانیش دێتـە ئـاراوە [*...بەرپرسـانی کـورد لـە دژی پێکهێنانی ئەو هێزە لێدوانی ئـاگرین دەدەن*] بـۆ ئەوانـەی وشـەکان بـەکاردێنن، و ئەوانـەی زاراوەکانیـان بـۆ بـەکار دێـت لەلایـەن ئـەو گرووپانـەی کـە خۆیـان و دژبەرەکانیان پێ دەناسێنن [*ئەنفالچی*]. ناسنامەی کۆمەڵایەتیتان ئەو شتە نییـە کە بۆ خۆتان بەتایبەتی دەتوانن بەردەوام بڕیاری لەسەر بدەن. لـە راسـتیدا، درك پێکردنی ناسنامە وەك بابەتێکی تۆخی تاکەکەسی ئەستەمە. تێگەیشتن لە خۆتان وەك تاکەکەس تەنیا لە پێوەندیی لەگەڵ ئەوانی دیکە و پێگەتان لە ناو گرووپێکی کۆمەڵایەتیـدا دەکـرێ. ئـەم پێگەیـە لـە رێـی بـەکارهێنانی زمانـەوە بـە شـێوەی جۆراوجۆر بنیات دەنـرێ (Thornborrow, 2004: 164- 165). بـۆ نموونـە بڕوانـە ئەم خۆناساندنە [بێگومـان ئێمـە وەك کـورد و لایەنـە عێراقییـەکانیش بـێ بـەدیل نین]. لـە روانگـەی گوتارشـیکارانی دەروونییـەوە "زەین و خـود و شوناسـەکان[٤٨] لەکارلێککردنی کۆمەڵایەتیدا پێکدێن، لەسەریان دەکەونە دیالۆگ و رێـك دەکـەون، و دووبـارە شـێوەیان پـێ دەدەنـەوە." (Jorgensen and Phillips 2002: 108). بەم پێیە، ئەگەر زمان سیستەمێکی هێماییيە، ئـەوا گوتـار(ی رۆژنامەنووسـی)ش جۆرێك پێوەندیی جەماوەرییە کە هێما زمـانی و دیدارییـەکان هـەردووکیان تێیـدا بەشدارن.

## سروشتی دامەزراوەیی هەواڵ لە شیکردنەوەی رەخنەیی گوتـاردا

تـا ئێسـتا بۆمـان روون بووەتـەوە، چـاپەمەنی هـەم رووداوەکـان رووماڵ دەکات، واتە چی بژار بکات بۆ ئەوەی رایبگەیەنێ و چۆن رایبگەیەنێ و هەم شێوە دەدات بە ئەنجامەکانیان. روانگەیەکی باو هەیە لەسەر ئەوەی رۆڵی رۆژنامـەنووس ئەوەیە بە دوای راستیدا بچێت، واتە چاو و گوێی خەڵکەکەیە. میشل گرەید[٤٩]، لە ساڵی (٢٠٠٥)دا لە وتارێکدا لـە کۆلێـژی پێوەندییـەکانی لەنـدەن گـوتی: " BBC

ئەرکێتی ستانداردیکی زێڕین دابنێ لە راگەیاندنی هەواڵدا، لە راگەیاندنی دروستی، لە بێلایەنیدا، لە داهێنانی تێگەیشتنێکی باشتر."[٥٠]

جۆرەکانی دەستوەردان کە ئێمە زۆرجار بە "لاگیری" ناو دەبەین، لەو دەوروبەرەی هەواڵ تێیدا دروست دەبێ، کەمن. لە راستیدا، بیرکردنەوە لەبارەی هەواڵ بە پێی "راستی" و "لاگیری" بە شێوەیەکی بنەڕەتی سەرنجمان لە سروشتی دامەزراوەیی هەواڵ دەپەڕێنێ. فێرکلاف (a :p.63 ١٩٩٥)، لە شرۆڤەکردنی ئەوەی کە چ جۆر روانگەیەکە شیکردنەوەی رەخنەیی گوتار بنیات دەنێ، ئاماژە دەکات بە گرنگیی تێگەیشتن لە پرۆسەکانی بەرهەمهێنان وا لە پشت دەقەکانەوەن بۆ تێگەیشتن لە سروشتەکەیان، ئەو دەڵێ ئەگەر ئێمە دەقەکان بە بێ رەچاوکردنی دەوروبەری بەرهەمهێنانیان شی بکەینەوە، ئێمە تەنیا دەقمان شی کردووەتەوە نەك گوتار. بە واتایەکی دیکە ئێمە پێویستە رووبەری کردە گوتارییەکان و دەقەکان بەشێك لەوانەن بزانین. تەنیا بە رەچاوکردنی بەرهەمهێنانەوەیە، دەکرێ دەقەکان وەك بەشێك لە پێوەندییە کۆمەڵایەتییەکان تێبگەن.

"*شیکردنەوەی رەخنەیی گوتار* دەبێ رووداوە کلتووری و کۆمەڵایەتییەکان کە دەقەکە بەشێکە لەوانە بناسێ". (Fairclough,1995: 57) لەم پێناوەدا رووداوەکانی پشتەوەی بەرهەمهێنانی هەواڵ کە ئێمە پێویستە بیانزانین، کلیلەکانی سروشتی دامەزراوەیی هەواڵ پێکدێنن و بریتین لە: عادەتە دامەزراوەیییەکان، شێوازەکانی کارکردن و بەرهەمهێنان، بەهاکان و ئەو شێوانەی کە ئەمانە بە قووڵی بەهۆی کەرەستە بازرگانییەکانەوە کاریان تێ دەکرێ، (64: Machin, ٢٠٠٨). لە مودیلەکەی فێرکلافدا "بەرهەمهێنانی دەق و گوتار لە پێوەندییەکانی دەسەڵات لە کۆمەڵەوە دەست پێدەکات. ئەم پێوەندییانە، دەسەڵات و ئایدۆلۆژیاکانیش لە رێی دامەزراوە کۆمەڵایەتییەکان و بە تایبەت ئەو ریزبەندییە گوتارییانەوە وا گرێدراوی ئەم دامەزراوانەن، دەق بەرهەم دێنن. (آقازادە، ١٣٨٥: ١٥١)

گوتار بەرهەمێك نییە، پرۆسەیەکە. بۆ شیکردنەوەی "پێویستە هەم دەقەکە خۆی و هەم کارلێککردن و ئەو دەوروبەرەی دەقەکەی تێدایە رەچاو

بکرێ. دەقەکە بەشێکە لە پرۆسەی گوتارەکە و تاوتوێکردنی بە دابڕاوی لە گوتارەکە کارێکی بێئەنجامە (Talbot,2007:10).

**ڕێبازی شیکردنەوەکە**

**١. داتاکان**

١٠ سەردێڕ لە هەر ڕۆژنامەیەك و ٢ دەقی هەواڵی لە هەرکام لە ڕۆژنامەکانی هاوڵاتی و ڕووداو وەرگیراوە. چونکە ئەم ڕۆژنامانە سەر بە دوو شوێنی جیای کوردستان و دوو ناوەندیی جیاوازن لە پێوەندییەکانی دەسەڵاتە هەرێمی و ناوچەییەکان و هەم ڕۆژنامەی بەشێکی بەرچاوی نوخبەکانی دەوروپشتی دەسەڵاتەکانن لە کوردستاندا.

٢. **شێوەی شیکردنەوەکە (جۆرەکانی لاگیری):**

سەردێر و دەقەکان بە پێی بنەماکانی تێگەیشتن لە هەواڵ و ڕەچاوکردنی ئەم خاڵانەی خوارەوە شی دەکرێنەوە. شیکردنەوەکە لەم باسەدا لە دوو ئاستدا دەکرێ: سەرەتا ئامرازەکانی شیکردنەوە وەسف دەکرێن و پاشان داتاکان بەپێی ئەم خاڵانەی خوارەوە لێکدەدرێنەوە:

١. **لاگیری لە بژار و لادان‌دا: بۆ هەر چیرۆکە هەواڵێکی بژارکراو کەسانێکی دیکە هەن لادراون. ئایا ژیانی ڕاستەقینە وەك هەیە باس کراوە؟ تایبەتمەندییە هاوبەش و ئاساییەکانی ئەوانەی بژار کراون چین (وەك، کەسانی بەناوبانگ، دەوڵەمەند، دەستڕۆیشتووی سیاسی، کۆمەڵایەتی و سەرچاوە فەرمییەکان).**

لەو دەقانەی سەرەوەدا ڕەوتێکی بژارکارانەی یەکلایەنە لە ڕۆژنامەکان دەبینرێ، ئەوە ڕووداوەکان و فاکتەکان نین دەدوێن، بەڵکو بڕیارە پێشوەختەکانی ڕۆژنامەکان بۆ ئاڕاستەکردنی بەڵگە و زانیارییەکان بەرەو ئەو بڕیار و ئامانجە دەچن ڕۆژنامەنووس مەبەستێتی.

- **دەسەڵات، ئۆپۆزسیۆن لە مەرج دەخات**

**یەکێتی و پارتی بەناوی "هەڵوێستی نیشتمانییەوە" لایەنەکان لە بەرەیەکدا کۆ دەکەنەوە (هاوڵاتی، ژ. ٩٣٧، ٢٠١٢/١٢/٢٨)**

ئەم لادان و بژارکردنانە بۆ خستنە ئەستۆی بەرپرسیارەتی یان سڕینەوەی بەرپرسیارەتی لە لایەنەکان کراون. لادانی بەرپرسانی پارتی لە بەغدا لەلایەن

رووداوەوە و بە بەرپرسیار ناساندنی (سەرۆکی هەرێم) لە کێشەکانی نێوان کورد و عەرەب لە لایەن هاوڵاتییەوە.

٢. **لاگیری لە رێی جێگۆڕکێ پێکردنەوە (جەختکردنەوە/ بەراییدان لە لاپەڕەکاندا)**: کامانە رووداو کەوتوونەتە لاپەڕەی پێشەوە کامەیان گەورەترین سەردێڕی بۆ دانراوە، کە ئەم جێگۆڕکێ پێکردن یان جەختکردنە کار دەکاتە سەر هەستی کەسەکان کە چی گرنگە.

بەراییدان بە رووداوە سیاسییەکان، و زەقکردنەوەی ململانێی سیاسی لە بەرانبەر گەندەڵییە داراییەکانی ناوەوە: ***"لە دەروازە سنوورییەکان کاڵا بە بەرتیل بەبێ پشکنین دەهێنرێتە ناو کوردستان"*** لە رۆژنامەی رووداودا خراوەتە لاپەڕی چواری رۆژنامەکە، بەڵام هەواڵی *سوپاسنامەیەکی کۆمکاری کەم ئەندامانی عێراق بۆ ئاسیا سێل و وەرگرتنی قوتابیانی کورد لەلایەن زانکۆیەکی فەرانسییەوە* لە لاپەڕەی دوودا هاتووە.

٣. **لاگیری لە سەردێڕەکاندا**: هەندێ لە سەردێڕەکان دەکرێ فریودەر بن، لەو رووەوە کە مەبەستی سەرەکییان قۆزتنەوەی سەرنجی خوێنەر بێت. زۆربەی خەڵك تەنیا سەردێڕەکان دەخوێننەوە، کە دەتوانێ هەستێکی دەستکاریکراو دروست بکەن لەسەر ئەو شتەی بە شێوەی راستەقینە روودەدات، یان ناڕووداوێك بکەن بە رووداوێکی هەست بزوێن.

- *شیکردنەوەیەك بۆ قەیرانی نێوان هەرێم و بەغدا:*

***بارزانی و مالیکی، عێراقیان خستووەتە بەر مقەستی لەتکردن*** (هاوڵاتی،ژ.٩٣٦، ٢٠١٢/١١/٢٧)

٣. **لاگیری لە وێنەکاندا: وێنە بێ ریاکان دەتوانن هەستی خراپ دروست کەن، و وێنە مەبەستدارەکان دەتوانن بە تەواوی دەورووبەری رووداوەکە بگۆڕن.**

(***مانشێتی هاوڵاتی ئەمەیە: مالیکی بۆ هاوڵاتی: دەبێت سەردانەکانی هەرێم بۆ دەرەوە لە رێگای ئێمەوە بێت، بەڵام وێنەکەی دکتۆر بەرهەم بە گەورەیی لە ژێریدا دانراوە.) (هاوڵاتی، ژ. ٩٣٣)***

٤. **لاگیری بە سەرچاوەکانی کۆنترۆڵکردن**: وتارێکی لەبارەی چارەسەری شێرپەنجەوە لە لایەن کۆمپانیایەکی دەرمانسازییەوە نووسراوە، یەکسان نییە

لەگەڵ ئەو وتارەی لەلایەن لێکۆڵەرێکی سەربەخۆوە دەنووسرێ. زۆرجار کۆمپانیا تایبەتەکان، حکومەتەکان، ئاژانسەکانی پێوەندیی گشتی، و گرووپە سیاسییەکان چاوپێکەوتنی چاپەمەنی دەکەن بۆ خۆدەرخستن و کاریگەری لەسەر رای گشتی.

**<u>د. رۆژ نووری شاوێس:</u>** بە مالیکیم گوت کاری نادەستووری دەکەن (رووداو، ژ. ٢٣٧، لاپەڕەی ٣)".

ئەو سەرچاوانەی لەبارەی ئەم رووداوەوە گوتنەکانیان وەرگیراوە، لە پێشدا نوخبە باڵادەستەکانی نزیك لە رۆژنامەکانن. ئەگەر گوتەی کەسانی دیکەشیان گەیاندبێت، ئەوە هەر لە کەسانی سیاسیی باڵادەست و دەسەڵاتدارن. لە پارتێکی دیکە یان بەرانبەر ئایدۆلۆژی رۆژنامەکەش بن گوتنەکانیان لەگەڵ پێشگریمانەکانی رۆژنامەنووسدا گونجێندراون، بۆ ئەوەی بە شێوەی خوازراوی خۆیان گێڕانەوەی هەواڵی رووداوەکە تەواو بکەن. کەسانی پسپۆر و بێ لایەن، یان خەڵکانی کەم دەسەڵات رایان وەرنەگیراوە.

٤. **لاگیری لە بەکارهێنانی زماندا: بەکارهێنانی جیاوازیی زمان و مۆرکی وەك "خەباتکاری رێگای ئازادی"، "تیرۆریست"، دەتوانی هەستی بەتەواوی جیاواز لەسەر کەسێك یان رووداوێك دروست بکات. بەکارهێنانی زمان لەم شێوانەی خوارەوە دەبینرێ:**

**أ) لاگیری لە بەکارهێنانی ناوەکان و نازناوەکاندا** (رووداو، ژ. ٢٣٦/ مانشێت):

- ***<u>پارتی: مام جەلال</u> لە بەغدا بە تەنیا بە جێ نامێڵین، / <u>تاڵەبانی</u> لە مالیکی توورەیە (رووداو، ژ. ٢٣٥)***

- *<u>راوێژکارێکی مالیکی</u>: ئەگەر دیجلە نادەستوورییە، با <u>فەخامەتی تاڵەبانی</u> رێکاری دەستووری بگرێتەبەر و دەستوور جێبەجێ بکات. (لاپەڕەی یەکەم، مانشێت).*

بەڵام لە لاپەڕەی ٣ و لە سەردێڕی ناوەوەی هەواڵەکە وشەی (فەخامەت) کە لەزمان راوێژکارەکەوە گوتراوە، لادراوە.

- *راوێـژکارێکی مـالیکی: ئەگـەر دیجلـە نادەسـتوورییە، بـا تاڵـەبانی ڕێکـاری دەستووری بگرێتەبەر و دەستوور جێبـەجێ بکـات. (لاپـەڕەی ٣، ڕۆژنامـەی ڕووداو، ژ.٢٣٦/١٩/١١/٢٠١٢).*
- بـارزانی لـە چـڕبوونەوەی ململانێکـان جگـە لـە پشـتیوانی کـورد، *بەتـەنیا مایەوە...(هاوڵاتی، ژ.٩٣٦)*

**ب) بژاری وشە:**

(ناوچــە جێناکۆکــەکان، هــاوڵاتی، ٩٣٣) (ناوچــە دابڕێنــدراوەکان، ڕووداو ٢٣٦)/ (هاوڵاتی، ژمارە٩٣٧: مووچەخۆرمان لە بەغدا هـەبوو نـەك نوێنـەر، بۆیـە شکستیان هێناوە)/ بە ناومالێکی ڕێکنەخراو، بە بێ ورەکەی جاران و دۆسـتەکانی پێشوو، پێشمەرگە **دەخرێتە شەڕەوە** (هاوڵاتی، ژ. ٩٣٣).

٥. **لاگیری لـە ژمـارە و ئامارەکانـدا:** ژمارەکـان پێویسـتییان بـە لێکدانەوەیـە: زۆرجار بۆ دروستکردنی هەسـتی درۆ بـەکاردێن، بـۆ نموونـە، لـەم ڕسـتانەی خوارەوەدا، ئامارەکان دەکرێ بـۆ ڕازیکردنـی کەسـێك بـەکار بێـنن کـە دوو هاوسەری بیرۆکەیەکی باشە.

_ نزیکەی ٣٠٪ ئەوانەی هەڵسەنگێندراون پشتگیری لە دوو هاوسەری دەکەن.
_ زیاتر لە ٧٥٪ ئەوانەی هەڵسەنگێنراون دژی دوو هاوسەری بوون.

**یان ئەم نموونەیە لە هاوڵاتی، کە لەگەڵ دەقەکەی**

**– هەرێم بەرگری لە ٥٠٠ پۆلیسی کورد ناکات (هاوڵاتی، ژ. ٩٣١)**

٦. **لاگیری بە هۆی دووبارەکردنـەوەوە:** دووبارەکردنەوەی وێنەی ڕووداوێك یـان بیرۆکەیەك خەڵك بەرەو ئەو باوەڕە دەبات کە ئەوە ڕاستە، زۆر بەرفراوانتر و گرنگتر لەوەی ڕاستەقینەیە و لەواقیعدا وابێت.

- **ئەگەر یەکێتی و پـارتی چاکسـازی نەکـەن، ئۆپۆزسـیۆن بڕیـاری داوە لـە پارلەمان بکشێتەوە**
- **دەسەڵات ئۆپۆزسیۆن لە مەرج دەخـات** (هـاوڵاتی، ژ. ٩٣٧، ل.٢). لەیـەك لاپەڕەدا دووبارە بووەتەوە.

## ئەنجامەکان:

١. لە هەردوو ڕۆژنامەکەدا متمانەی زیاتر بە ***سەرچاوە باوەڕپێکراوەکانی*** وا لە ئایدۆلۆژی و تێڕوانینی ڕۆژنامەکە نزیکن، بەرجەستە دەکرێن و دەپارێزرێن. خەڵکانی پسپۆڕ، بێ لایەن و کەم دەسەڵات لە ڕووی سیاسی یان دوور لە دەسەڵاتی نزیك لە ڕۆژنامەکان لە گوتاری ئەم ڕۆژنامانەدا بزرن. لە ئەنجامدا ئەو بژاردانە بەو دەسەڵاتەی هەیانە دەبنە ڕێکخەری ئەو دەوروبەرانەی کێشەکان تێیاندا دەردەبڕێن و گفتوگۆیان لەبارەوە دەکرێ. واتە زەبری پێکهاتەیی زیاترە لەوەی پیلانێکی ئاشکرا بێت کە وا لە ڕۆژنامەنووس بکات دەستوەردانی هەواڵ بکات.

٢. لە ڕۆژنامەی ڕووداودا ڕووداوەکانی پێوەندیدار بە ئۆپەراسیۆنەکانی دیجلە و کێشە سیاسییەکانی نێوان عێراق و هەرێمی کوردستان وەك دوو کێشەی (**کەسی**) یان (**حیزبی**) نێوان (**مالیکی**) و (**تاڵەبانی**) یان (**دەوڵەتی عێراق**) و (**یەکێتی نیشتمانی**) نوێندراوە. لاگیرییەکەی زیاتر پێکهاتە/ ڕۆنانی داڕشتنی هەواڵەکە دەگرێتەوە.

٣. لە ڕۆژنامەی هاوولاتیدا، وەك کێشەی نێوان (بارزانی) و (مالیکی) بە تایبەتی ململانێیەکی بەرژەوەندیخوازانە و دەسەڵاتخوازانەی (دەسەڵاتدارانی هەرێمی کوردستان) و (دەسەڵاتدارانی ناوەندی لە عێراق) نوێندراوە. لەم ڕۆژنامەیەدا هەواڵی هەڵبەستراو بەرچاو دەکەوێ کە ناوەڕۆکی هەواڵەکە و سەردێڕەکەی تێك ناکەنەوە. وشە و دەستەواژەی لاگیرانە بێجگە لە شێوەی ڕۆنانی هەواڵەکەش بەرچاو دەکەوێ.

٤. ئەوە لە حاڵێکدایە کە، بە پێی ئەو گوتنە ڕاستەوخۆیانەی ئەم دوو ڕۆژنامەیە لە بەرپرسانی دەوڵەتی عێراق، فەرماندەی ئۆپەراسیۆنەکانی دیجلە یان مالیکی وەریانگرتووە، و گەیاندوویانە، (کورد و عەرەب)، (**هەرێم**) و (**ئێمە**)، (**هێزی پێشمەرگە**) و (**ئێمە**)، وەکو دوو لایەنی بەرامبەر بە یەك بەرجەستە دەبن. ئەمەش دەری دەخات کە سنووری دیاریکردنی ناسنامەی کورد و ئەوان لەلایەن دەوڵەتی بەغداوە دیارە لە نێوان دوو ناسنامەی کورد و عەرەب و ئەو کارایانەدایە نوێنەری ناسنامەی کورد و عەرەبن. بەڵام لای ئەم ڕۆژنامانە

هێشتا سنووره حیزبییەكان و ئایدۆلۆژییەكان له پێشەوەی ناسنامه گشتییه نەتەوایەتییەكەوەن.

٥. هەردوو رۆژنامەکه به شێوەیەكی شاراوه و هاوپێچ ململانێیەكی حیزبیی نێوان دوو حیزبی سەرەكی و هاوپەیمان لـه پێوەنـدیی لەگـەڵ مالیکیـدا دەگەیـەنن و رۆنان و داڕشتنی هەواڵی رووداوەكان، جەختكردنەوەكان و گوتەی وەرگـیراوی تاكـه بـژاردەكان ئـەم واتایـه دەردەبـڕن. "ناسـنامه" لـەم رۆژنامانـەدا بـەپێی دەوروبەر و چۆنێتی گێڕانەوەكان لەنێوان ناسنامەی حیزبی (پارتی/ یـەكێتی)، دامەزراوەییـیـەوه (هـاوڵاتی، رووداو) بـۆ نیشـتمانی (عێراقی/كوردسـتانی) و نەتەوەیی (كورد/ عەرەب) له گۆڕاندایه.

**ڕاسپاردەکان:**

١. لە پێناو سەربەخۆبوونی میدیا و پیشەییبوون و زانستیبوونی میدیادا، ناوەندێکی توێژینەوە ستراتیژییەکانی بواری ڕاگەیاندن دابنرێ، بۆ شیکاری دەقە میدیاییەکان، ڕێکخستنی زانستییانەی دامەزراوەکانی ڕاگەیاندن، بەڕێوەبردن و کارگێڕی و ڕۆژنامەنووسیی قەیران، بردنەسەرێی ئاستی خوێندەواری میدیایی وەرگران.

أ) ئەم ناوەندە بودجەی لە ئەنجوومەنی وەزیران یان پەرلەمانی کوردستان بۆ دابین بکرێ، یان بەشێکی تایبەتی ناو ئەکادیمیای کوردی بێت.

ب) گۆڤارێکی وەرزیی تایبەت بەو بوارانەی، هەبێ لێکۆڵینەوەکانی تێدا بڵاو بکرێتەوە.

٢. له وەزارەتی پەروەردە لە قۆناغی بنەڕەتی، ناوەندی و دواناوەندی بابەتی تایبەت بە میدیا و پەروەردە/ خوێندەواری بواری میدیا دابنرێ و وەك وانە بخوێندرێ.

٣. ئەنجوومەنێکی خۆچاوەدێری چاپەمەنی و ڕاگەیاندن دابنرێ بۆ پێداچوونەوە بە گازندەکانی میدیا و وەرگرانی میدیا، هەڵسەنگاندنی ساڵانەی بەرپرسیارێتی کۆمەڵایەتی، ئەخلاقی و نیشتمانی میدیا لە ڕاپۆرتی شیکاریی تایبەتدا.

(ئەندامانی ئەنجوومەنەکە، لە پسپۆڕانی بواری میدیا، زمانی میدیا، دەروونزانانی میدیا، کۆمەڵناسیی میدیا و دەزگاکانی چاپ و بڵاوکردنەوە و ڕۆژنامەنووسان و لێژنەیەکی ڕۆشنبیری پەرلەمانی کوردستان، پێکهاتبێ ).

## پەراوێزەکان:

١. **بڕوانە**: Bashgah.net / رێکەوتی وەرگرتن/ شنبە ٢٧ آبان ١٣٩١

2. reflection
3. archaeology
4.statement
5. formation
6.Jorgensen and Phillips, 2002: 12.
7. social constructionist
8. different regimes
9. negative instance
10 .Jørgensen, M. and Phillips, L. (2002, p. 13:بڕوانە
11. critical linguistics
12. critical discourse analysis
13critical
14. discourse
15. communicative events
16. Ruth Wodak andMichael Meyer 2001: 6
17. recontextualization
18.bias
19. selectivity
20. Stuart Hall
21.formal
22. ideological
23.consensus knowledge
24.Linkage
25. Recency
26.Newsworthiness of event/person
27.accredited sources
28. Primary Definers
29.Selectivity
30. Coding

٣١. دیارە ئەم بەهایانەش شیاوی تێبینی کردنن، بەتایبەتی نیزیکەی ٤ دەیە بەسەریاندا تێدەپەڕێ، "توێژینەوەکەی هارکوپ و ئۆنیل (٢٠٠١) لە بواری چاپەمەنیدا بەها هەواڵییەکانی گالتۆنگ و رۆژ یان نوێ کردەوە و ئەم بەهایانەی خوارەوەشیان پێ زیاد کرد: **بژاردەی دەسەڵاتدار، ناوبانگ، سەرقاڵکردن/ سەرگەرمی، سەرسوڕمان، هەواڵی خۆش، هەواڵی ناخۆش** ( Brighton, P. &

(Foy.D.:2007: 8". ئالبێرت براون (٢٠٠٩) بەهاکانی هەواڵی گەیاندووەتە ٢٠ بەها (بڕوانـە: فردوس آقاگل زاده و همکاران: ١٣٩٠: ٣٢). زۆربەی سەرچاوە رۆژنامەنووسییەکان، "ململانـێ (فیزیکی/ ئایدۆلۆژی)یـەکان" و "هاوسـێتی/ نزیکی(جوگرافیـایی/ هـزری) "وەك بـەها دیـاری کردووە (بڕوانە: نعیم بدیعی و حسین قندی، ١٣٨٠:٢٣).

32.Frequency

33.Threshold

34. Clarity/unambiguity

35. Meaningfulness

36.Predictability

37.unexpectedness

38. Composition

39. Continuum

40:بڕوانە.fowler, 1991:13- 14; Brighton, P. & Foy. D.:2007: 7

41. reality

42.professional

43. accurate

44. biased

45. distortions

46. bias

47. Language, society, and power / an introduction / [edited by], Linda Thomas . . . [et al.] (2004)– 2nd ed.

48.Minds, selves and identities

49. Michael Grade

50. WWW.bbc.co.uk

## سەرچاوەکان:

**أ) فارسی:**


١. آقاگل زاده، فردوس (١٣٨٥)، "تحلیل انتقادی گفتمان"، تهران: انتشارات علمی و فرهنگی.
٢. آقاگل زاده و همکاران (١٣٩٠)، "انگاره زبانشناختی نگارش و گزارش خبر: رویکرد تحلیل انتقادی گفتمان"، فصلنامه پژوهش های زبان و ادبیات تطبیقی، ش٤، (پیاپی ١٢)، صص٢٥– ٤٢.
٣. خالقی، احمد (١٣٨٢)، "قدرت، زبان، زندگی روزمره در گفتمان فلسفی – سیاسی معاصر"، تهران: گام نو.
٤. عباسی، حجت الله (١٣٨٦)، "اصول کاربردی خبرنگاری"، چاپ سوم (با تجدید نظر و اضافات)، تهران: سروش.
٥. نعیم بدیعی، حسین قندی (١٣٨٠)، "روزنامه نگاری نوین"، تهران: انتشارات دانشگاه علامه طباطبایي.

**ب) ئینگلیزی:**

6. Blommaert, J. (2005), “Discourse :A Critical Introduction”, Cambridge: Cambridge University Press.
7. Brighton. P and Foy. D (2007), "News Values". London:SAGE.
8. Christopher J. Hall, Patrick H. Smith and Rachel Wickaksono (2011), "Mapping Applied linguistics: A Guide for students and practitioners": Routledge
9. Caldas-Coulthard, C. R (2003), "Cross-Cultural Representation of" ‘Otherness’ in Media Discourse", in "Critical Discourse Analysis: Theory and Interdisciplinarity ", Edited by: Gilbert Weiss and Ruth Wodak. Palgrave Macmillan.
10. Hastings, M. (2002) Editor: An Inside Story of Newspapers. London: Macmillan.
11. Howarth. D. (2000), http://www.bashgah.net/fa/content/print_version/25647 (Sat Nov 17 23:17:55 2012 )

وەرگێڕانی بەشێکە لە کتێبی:
"Discourse, Divid. Howarth, Open University Press, 2000 ."

12. Fowler, r.(1991), "language in the news: discourse &ideology in the press": Routledge.
13. Fairclough, N.(2004), ""Critical Discourse Analysis in Researching Language in the New Capitalism: Overdetermination, Transdisciplinarity, and Textual Analysis "in"Systemic functional linguistics and critical discourse analysis: studies in social change", edited by Lynne Young and Claire Harrison.p. cm.:Continuum.
14. _____. (1995). Critical discourse analysis. The critical study of language. London: Longman.
15. Thornborrow,J. and Jones(2004), in" Language, society, and power / an introduction /" [edited by], Linda Thomas . . . [et al.] (2004)– 2nd ed.
16. Hall Jamieson.K. and Waldman. P. (2003), "The press effect:politicians, journalists,and….": Oxford University Press
17. Machin, D. (2008)," News discourse I: Understanding the social goings-on behind news texts", in(Language and Power: An Introduction to Institutional), Mayr, Andrea: London: Continuum.
18. Mayr, A. (2008).Language and Power: An Introduction to Institutional. London: Continuum.
19. Wodak,R. and Meyer, M. (2001), "Methods of critical discourse analysis ". London: SAGE.
20. Sheyholislamy, Jaffer(2007),"Yesterday,s separatists" are today,s resistance fighters: mainstream media as agents of hegemony" in "critical discourse analysis of text media": los autores.
21. WWW.bbc.co.uk.

## ملخص البحث

الصحافة والمراسلون عرفوا بأنهم يزودون قراءهم بمعلومات موضوعية ودون انحياز، توصيل المعلومات بنوع من العدالة او بالاحرى ان يجعلوا بأن المعلومة هي التى تتكلم، يعطي الصحافي نوع من الثقة الرصينة لدى متابعيهم، ولكن قد تحدث حالة بأن الصحافي ودون قصد قد ينحاز الى جهة أو طرف، هذا هو موضوع بحثنا الذي يتوزع على فصلين:الفصل الأول عبارة عن مواضيع نظرية حول تحليل الخطاب النقدي تحت مباديء موضوعية ورصينة. واقتبسنا لفرض تطبيق ماقلناه في صحيفتين هما (هاولاتى و روداو).

وقمنا بتحليل المباديء الأساسية فيها ختم البحث بعرض أهم النتائج المتوخاة من البحث .

## Abstract

The press and the journalists have been known to provide the readers with neutral and objective information To impart the information in a fair manner to make the piece of information to speak itself. This fact inspires the journalist with a kind of confidence. Yet, it happens sometimes that the journalist sounds biased towards a certain part; this is going to be the topic of our paper which falls into two sections: the first offers some theoretical discussions of critical discourse analysis. Furthermore, the practical aspect covers citations from the two newspapers of Rudaw and Hawlati. The paper ends with a bibliography and the basic conclusions drawn from the study.

# شیکردنەوەیەکی ڕەخنەیی گوتاری ڕۆژنامەنووسیی کوردی

(١٩١٨- ١٩٣٢)

د.ڕەحیم قادر سورخی و پ.ی.د.ساجیدە عەبدوڵلا فەرهادی
بەشی کوردی/کۆلێژی زمان
زانکۆی سەلاحەددین

## پێشەکی

**ناونیشان و بواری لێکۆڵینەوەکە:**

ناونیشــانی ئــەم لێکۆڵینەوەیــە{شــیکردنەوەیەکی ڕەخنــەیی گوتــاری ڕۆژنامەنووســیی کــوردی (١٩١٨– ١٩٣٢)}یــە[1]، بـۆ پــەیڕەوکردنی ڕوانگــەی "شــــیکردنەوەی ڕەخنــــەیی گوتــــار" وەك لقێکــــی نێــــوان زانســــتیی (Interdisciplinary)، ئەم لێکۆڵینەوەیە، نواندنەوەی ڕووداو، کەس و پێکهاتەکان لـە ڕۆژنامـەکانی :(تێگەیشـتنی ڕاسـتی، پێشـکەوتن، بـانگی کوردسـتان، ئومێـدی ئیسـتقلال، ڕۆژی کوردسـتان، ژیانــەوە، ژیــان، زاری کرمــانجی و کــەرکوك) لــە ساڵەکانی (١٩١٨– ١٩٣٢) تـاوتوێ دەکـات. بابەتـە هەواڵییـەکانی پـاش جـەنگی یەکـەمی جیهـانی کـە بـە زاری ناوەڕاسـتی زمـانی کـوردی لـەم ڕۆژنامانــەدا بـڵاو کراونەتەوە، بە نموونە وەرگیراون. چونکە ئەم ڕۆژنامانە ململانێکانی نێـوان کـورد و دەســەڵاتدارانی ئینگلیــز لــە عێــراق و سیاســەتی دووفاقییانــەی ئینگلیــز (هاوپێوەندی؛ پێکدادان) و پێوەندییەکانی دەسەڵات و ئایـدۆلۆژی لـە دەوروبـەرە کلتووری و کۆمەڵایەتییەکانی ئەو سەردەمەی کوردستان دەخاتە ڕوو.

وشە سەرەکییەکان: شیکردنەوەی ڕەخنەیی گوتار، گوتـاری ڕۆژنامەنووسـیی کوردی، نواندنەوە، دەسەڵات، ئایدۆلۆژی.

**هۆیەکانی هەڵبژاردنی ئەم بابەتە:**

لەبەر ئەوەی ئەم قۆناغە (١٩١٨ – ١٩٣٢)، قۆناغی پێکهاتنی دەوڵەتی نوێی عێراقە. هاوکات قۆناغی چەسپانی دەوڵەت – نەتەوەی فارس و پێکهاتنی دەوڵەت – نەتەوەی نوێی تورکە. کورد هەوڵی پاراستنی نیشتمان و ناسنامەی خۆی دەدات. ئەو ڕۆژنامانەی بە سەرپەرشتی ئینگلیز دەردەچن، هەوڵی دروستکردنی ناسنامەیەکی نوێ بۆ کوردەکان وەك هاوڵاتییەکی عێراقی دەدەن. لە هەمان کاتدا کوردیش خاوەنی بزووتنەوەیەکی نەتەوەییە و ڕۆژنامەش وەك زمانحاڵی شۆڕشی نەتەوەیی بەکار دێنێ و تێیدا هەوڵی پاراستنی ناسنامەی کوردستانیی خۆی دەدات. ڕۆژنامەکان جگە لە دەوروبەرە کلتووری و کۆمەڵایەتییەکان، لە هەمان کاتدا ئەم بیری ناسنامە خوازییەش دەنوێنن. کورد لەگەڵ سیاسەتێکی دووفاقییانەی ئینگلیز؛ هاوپێوەندیی لەلایەك و پێکدادان لەلایەکی دیکەوە بەرەو ڕووە. بە پێی ئەم واقعە سیاسییەش نواندنەوەکە (لە ڕووی بژاری وشە، دەربڕینی دیار و نادیار، ناودانان، گرتنەبەر و دەرهاویشتن)ەوە دەگۆڕێ.

بۆیە لەم لێکۆڵینەوەیەدا دەمانەوێ وەڵامی ئەم پرسیارانەی خوارەوە بدەینەوە:

١. "بۆچی فۆرمێکی زمانی لەجیاتی فۆرمەکانی تری کە لەبەر دەستدان بژارکراوە ؟ بۆچی ئەم کردە زمانییە بەکارهاتووە و کردەکانی تری دەکرا بەکاربێن، بەکار نەهاتوون؟

٢. چۆن زانیاریی ئێمە لەبارەی جیهانەوە لە ڕێگەی ڕۆژنامەکانەوە دەنوێندرێ و کار دەکاتە سەر نواندنەوەی تاکەکان، شوێنەکان و ڕووداوەکان؟

بۆ وەڵامدانەوەی ئەم پرسیارانە، توێژینەوەکە بە شیکردنەوەی ورد (شیکردنەوەی دەق)ەوە خەریك دەبێت. شیکردنەوەی دەق بەندە بە شیکردنەوەی ئەو شێوەیەی گوزارەکان (propositions) ڕۆدەنرێن، لێکدەدرێن و ریز دەکرێن. هەرچەند لە بنەڕەتیشەوە لێکۆڵینەوەکە لێکۆڵینەوەیەکی "نێوان زانستی"یە لە نێوان زانستی کۆمەڵایەتی و زانستی زماندا. دەوری زمانەوانی لە شیکردنەوەی دەقیدا یەکجار زۆرە، بۆیە قورسایی شیکردنەوەکە لە سەر تیۆری

زمانەوانیی ئەرکی و ئامرازە زمانییەکانە. بێجگە لە فێرکلاف بە شێوەی پێویست لە گوتار شیکارانی وەك، (ڤان لیووێن ١٩٩٦؛ ٢٠٠٨)، ریچاردسن (٢٠٠٧؛ ٢٠٠٤) (فاولێر ١٩٩٦)، ڤاندایك (١٩٩٧) و (وۆداك ١٩٩٧) بۆ دەوڵەمەندکردنی توێژینەوەکەمان سوود وەردەگرین. لەم بەشەدا دەمانەوێ ئەوە بناسێنین کە لە سەرانسەری پاشماوەی لێکۆڵینەوەکەماندا بەرفراوان کراوە:." ***فۆرمی دەقی و ناوەرۆکی دەقی پێکەوە گرێدراوە ، بەجۆرێك کە دەقی نووسراو یان پێشکەشکراو لە شێوەی جیاوازدا واتای جیاواز دەگەیەنن"*** . بۆیە، لە چوارچێوە شیکارییەکەمان لە شیکردنەوەی گوتاری رۆژنامەدا، هەندێ چەمك و ئامرازی زمانی (وەك ناودانان، **بژاری وشە**، نادیارکردن، **گۆڕینی جێناوەکان**، **پۆلبەندی کۆمەڵایەتی**، گرتنەبەر و دەرهاویشتن) لە پێوەندیی لەگەڵ دەقە سەرەکییەکانی رۆژنامەکاندا دەخەینە بەرباس. شیکردنەوەی دەقی بەخورتی بەربژارییە: لە هەر شیکردنەوەیەکدا ئێمە لەبارەی رووداوە کۆمەڵایەتییەکان و دەقەکانەوە پرسیاری دیار هەڵدەبژێرین، نەك پرسیاری شیاو (possible)ی تر( Fairclough, 2003: 14).

**پێڕەوی لێکۆڵینەوەکە :**

ئەم لێکۆڵینەوەیە لێکۆڵینەوەیەکی شیکاری ـ رەخنەییە، بە پێی بنەمای زمانەوانی ڕەخنەیی و مێتۆدی گوتارشیکاری "فێرکلاف" پێوەندییەکانی دەسەڵات و ئایدۆلۆژیا و دەوروبەری کلتووری و کۆمەڵایەتی و نواندنی کارا کۆمەڵایەتییەکان لە روانگەی "ڤان لیوێن" شی دەکرێتەوە.

**ناوەرۆکی لێکۆڵینەوەکە :**

ناوەرۆکی لێکۆڵینەوەکە بێجگە لە پێشەکی و ئەنجام لە دوو بەش پێکدێت:

بەشی یەکەم/ بەناونیشانی شیکردنەوەی گوتاری ڕۆژنامەنووسییە، کە ئەم بابەتانە لە خۆ دەگرێ: شیکردنەوەی ڕەخنەیی گوتار، **گوتاری رۆژنامەیی و کردەی کۆمەڵایەتی**، ئەرکەکانی ڕۆژنامە، شیکردنەوەی وشەیی (بژار و واتای وشەکان) ، نواندنەوەی کارا کۆمەڵایەتییەکان لە ناودانان و پۆلینکردنەکانیاندا.

بەشـــی دووەم/ بـــە ناونیشـــانی دەســـەڵات ( Power )و هاوپێوەنـــدیی ( solidarity )و نیشانە کۆمەڵایەتییەکانە، کە ئەم بابەتانە لە خۆ دەگرێ: گۆڕینی جێناوەکان، نواندن وەك دەوروبەرسازییەکی دووبارەی ڕووداو، بکەر نادیارکردن و ناواندن. دواتر ئەو ئەنجامانە خراونەتە ڕوو کە لێکۆڵینەوەکە پێـی گەیشـتووە. لـە کۆتایی لێکۆڵینەوەکەشدا لیستی سەرچاوەکان ، ئینجا پوختەی لێکۆڵینەوەکە بـە هەردوو زمانی عەرەبی و ئینگلیزی نووسراوە.

## بەشی یەکەم

## شیکردنەوەی گوتاری ڕۆژنامەنووسی

گوتاری ڕۆژنامەنووسی بریتییە لە دوو بەشی سـەرەکی: دەقـی نووسـراو یـان گـوتراو، ئـەو پرۆسـەیەی پێوەنـدیی بـە بەرهـەمهێنان و بـەکارهێنانی دەقەکـەوە هەیە. زۆربەی لێکۆڵینەوەکان تا ئێستا، جەختکردنەوەیان لەسـەر لایـەنی یەکـەم، واتــە دەقەکــە بــووە، چــونکە بەتایبــەتی دەقەکــە ئــەو بــەها و ئایدۆلۆژییانــە دەرەمزێنێ کە ڕەنگدانـەوەی جیهانـە گەورەکـەن و کاریگـەرییان لەسـەری هەیـە. جەختکردنــەوەی دووەم، تــا چــەند ســاڵی رابــردوو لەســەر لایــەنی دووەم، واتــە پرۆسەکە ـ بریتییە لـە ڕێسـا و ڕۆتینـەکانی دەسـتەی بەڕێوەبـەرانی ڕۆژنامەکـە و بەتایبەتی هەواڵەکان ـ لەسەر ئەجیندای ڕۆژنامەکان بووە(Cotter,  2001 : 417).

ئــەم تایبەتمەندییانــەی گوتــار و دەقــی ڕۆژنامــەیی پێویســتی بــە تیــۆر و میتــۆدێکی لێکۆڵینەوەیـە کـە توانـایی پـەل هاویشـتنی بـۆ هـەموو لایەنـەکانی بەرهەمهێنان و بەکارهێنان (خوێندنەوە و لێکدانـەوە)ی ڕۆژنامـەکان ببـێ. تیـۆر و میتۆدێـك بێـت نەبەسـترابێتەوە بـە سـنووری تەسـکی تاکـە لقێکـی زانسـتییەوە. شیکردنەوەی رەخنەیی گوتار ئەو تیۆر و میتۆدەی بـۆ شـیکردنەوەی ڕۆژنامـەکان لەم لێکۆڵینەوەیەدا بـژار کـراوە لێکۆڵینەوەیـەکی چۆنییە، شـێوەیەکی ڕاڤـەیی و دەوروبەری و هەڵێنجانییە. مەبەست لە گوتارشیکاریی ڕەخنەیی لێرەدا "خسـتنە ڕووی  لێکدانــەوەی واتــای دەقەکانــە نــەك دیــاریکردنی "چــەندی"یانــەی ســیما دەقییەکان و هەڵگوێزانی واتا لەو سیمایانە؛ واتە دانانەوەی ئەو شتەی گـوتراوە و نووسراوە لەو دەوروبـەرەی تێیـدا ڕوویـداوە. بۆیـە، لێکۆڵینەوەکـە شـیکردنەوەی

رۆژنامەی لە روانگەی  "شیکردنەوەی رەخنەیی گوتارەوە وەك تیۆر و میتـۆدێکی نێوان زانستی" دەخاتە روو.

### شیکردنەوەی ڕەخنەیی گوتار

فێـــرکلاف (١٩٩٥b: ٣٦)     زاراوەی"***رەخنــــە***" (qritique) بـــە واتــــای "ئاشـکراکردنی پێوەنـدیی دوولایەنـەی نێـوان شـتەکان" دەزانـێ و بـەکارهێنانی زاراوەی رەخنەیی بەلای فێرکلافـەوە "پێوەنـدیی بـە دەروەسـتبوونی بـە تیـۆر و میتــۆدێکی دیالێکتیکییــەوە هەیــە کــە " شــتەکان لــە بنەڕەتــدا لــە پێوەنــدیی دوولایەنەیان، هاوپێوەندییان، جووڵانیان، و بوون و نەبوونیاندا دەرك پێدەکا"کـە لە "ئینگلس"ی وەرگرتووە. لەلایەکی تریشەوە، زاراوەی رەخنەیی (critical) لـە شـیکردنەوەی رەخنــەیی گوتــاردا زۆرجــار لەگــەڵ تــاوتوێکردنی پێوەندییــەکانی دەسـەڵاتدا پێوەنـدیی هەیـە. ئـەم چـەمکە رەخنەییـە، لـە قوتابخانـەی تیـۆری رەخنــەیی فرانکفۆرتــەوە هــاتووە. لەوانــە؛ (ئــادۆرنۆ 1973؛ هابرمــاس 1976؛ هورکایمێر 1972)و... لێکۆڵینەوە و تیۆری رەخنەیی سروشتایەتی (naturalism) (کـــە پێیوایـــە، کـــردە کۆمەڵایەتییـــەکان، مـــۆرك و بەرنامـــەکانی واقعییـــەت دەنوێننـەوە)، عەقڵانییـەت (راسـتی ئـەنجامێکی زانسـت و مەنتیقـە)، و بێلایـەنی (ئـەو گریمانەیـەی کـە راسـتی هـیچ بەرژەوەندییـەکی تایبـەتی ناخاتـە روو) رەت دەکاتــەوە ( Rojers, 2004: 3). زاراوەی "***گوتــار***"(discourse) لــە  رووی تیۆرییـەوە پێوەنـدیی بـە پێشـینەی تێڕوانینـی زمانـەوانیی ئـەرکی – سیسـتەمی هالیـــدەی و "لێکۆڵینـــەوەکانی بێرنشـــتاین (١٩٩٠) لـــەبارەی رەمزەکـــان و کۆمەڵناسـییەوە هەیـە. زاراوەی گوتــار ئامــاژە بــە رەگــەزە نیشــانەییەکان (semiotic elements)ی کردە کۆمەڵایەتییەکان دەکـات. کەواتـە زمـان (نووسـین یان ئاخاوتن لە لێکدراوێك لەگـەڵ نیشـانەکانی دیکـەدا، وەك مۆسـیقا لـە گـۆرانی گوتنـدا)، پێوەندییـە نازمانییـەکان (حاڵـەتی روخسـار، جوولانـدنی جەسـتە، ئاماژەکان و هی دیکە،) و وێنە دیدارییەکان (وێنە فۆتۆگرافییەکان یان فیلمەکان،) دەگرێتــەوە ( Chouliaraki & Fairclough,1999:38). مەکدۆناڵـد (٢٠٠٣: ١) "گوتار" وەك "سیستەمێك لە کردەکانی پێوەندیکردن کە بەتەواوی گرێـدراون بـە

کردە کولتووری و کۆمەڵایەتییەکانەوە پێناسە دەکات کە، کۆمەك دەکەن بە بنیاتنانی چوارچێوە تایبەتەکانی بیرکردنەوە" و پێی وایە ئەم "چوارچێوە تایبەتانەی بیرکردنەوە" بۆخۆیان پرۆسەیەکن لە واتا دروستکردن، زیاتر لەوەی حاڵەتێکی چەسپاو بن، مەرجدار و کاتین، واتە بەڕووی گفتوگۆ و مشتومڕەوە کراوەن و گوتار زیاتر شیاوی تێگەیشتن دەکەن.

"زاراوەی" ***شیکردنەوە*** (analysis)" لە شیکردنەوەی رەخنەیی گوتاردا، بەو پێناسانەوە بەندە کە گوتارشیکار لە (رەخنەیی) و (گوتار) و مەبەستەکانی بۆ بەرێوەبردنی شیکردنەوەکە وەری گرتووە. کەم تا زۆر لە روانگە دەق تەوەر (textual oriented approaches)ەکان بۆ شیکردنەوەدا هەندێ میتۆد کەمتر لە رووی زمانی جەختیان لە سەر کراوە و زۆر زیاتر جەختیان کردووەتە دەوروبەری گوتارەکە (Rojers, 2004: 6). مەبەست لە شیکردنەوە لەناو شیکردنەوەی رەخنەیی گوتاردا" هەر دەرخستنی واتای ئاڵۆز و نائاسایی ناو دەقەکە نییە، بەڵکو رەواندنەوەی تەمومژی و روونکردنەوەی ئەو پرۆسانەیە پێوەندییان بە بەرهەمهێنان و درك پێکردنەوە هەیە کە ئەو توانایە بە شیکەرەوە دەدات، کاریگەریی ئایدۆلۆژی لە زماندا ببینێ و بەوانی دیکەی بناسێنێ (آقاگل زادە، ١٣٨٥: ١٢٣).

"ئەو شتەی شیکردنەوەی رەخنەیی گوتار لە نەریتی لێکۆڵینەوەی زمانی جیا دەکاتەوە، ئەوەیە کە زانستی رەخنەی کۆمەڵایەتی و زانستی زمان (بەتایبەتی  زمانەوانیی ئەرکی – سیستەمی هالیدەی) لەناو چوارچێوەی تیۆر و میتۆدێکی شیکاری و تیۆریدا پێکەوە دێنێ و دیالۆگێك لە نێوانیاندا رێکدەخات" (Chouliaraki; Fairclough,1999: 6).

### گوتاری ڕۆژنامەیی و کردەی کۆمەڵایەتی

"سەبارەت بە ژیانی کۆمەڵایەتی لەو گریمانەیەوە دەست پێدەکەین کە لە کردەکان (practices)[٢] پێکدێت. "مەبەستمان ئەو شێوە ئاساییی بووانەیە وا گرێدراون بە کات و شوێنێکی تایبەتەوە کە تێیاندا خەڵك سەرچاوە (ماکی و میناکی)یەکان بەکاردێنن بۆ خۆ گونجاندنیان لە جیهاندا.

### ئەرکەکانی ڕۆژنامە

"ئامرازەکـانی راگەیانـدنی گشـتی {یـەك لەوانـە رۆژنامـەکان} سـێ ئـەرکی سەرەکییان هەیە، کە بەڕیز بریتین لە: خافڵاندن، زانیاریگەیانـدن بـە خـەڵك، و لـە راستیدا بنەڕەتیترین و سەرەکیترین ئەرکی ئامرازەکانی راگەیاندنی گشتییە کە بۆ بــە ئەنجامگەیانــدنی، هــەوڵی پرۆپاگەندەیــەکی رێکوپێــك دەدەن (چۆمســکی و هێرمەن: 1377:17). پرسیارێکی بنەڕەتی کە لە جەرگەی هەموو لێکۆڵینەوەیەکی رۆژنامەنووسیدا مت بووە، ئەوەیە کە رۆژنامەنووسی بۆ چییە؟

ئێمە ئەم روانگەیە پەسند دەکەین کـە گریمانـە دەکـات: "***رۆژنامەنووسـی بـۆ ئەوە هەیە کە هاوڵاتییان باشتر بتوانن ژیانیان  و پلە و پایەکانیان لە جیهاندا درك پێبکەن***" (Rechardson,2007:7).

### شیکردنەوەی وشەیی ( بژار و واتـای وشەکـان )

بە لەبەرچاوگرتنی باری دەوروبەری ئەو دەقانەی خوارەوە، کە وەرگری کورد لـە نێـوان دوو لایـەنی "ئـەوانی تـری خـۆی"دا بـەراورد بکـات، بـە شـێوەیەکی بەڵگەمەندانە بریتییەکانی هەر کام لەم جووتانـە دەکـرا ئامـاژە بـە هـەمان لایـەن، کەس یان کردە بکەن، بەڵام سنوورە ئایدۆلۆژییەکان (بە تایبەت لە کـاتی شـەڕدا) بەدەگمەن بـەو جـۆرە بـوون. هەربۆیـە بـۆ بەشـێکی تـری کوردەکـان بەتایبـەتی ناوچەکانی رەواندز و رانیە دەکرێ ئەو وشانەی بۆ ئینگلیزییەکان بەکارهاتوون بـۆ تورکەکان بەکاربێنەوە. "ئەو وشانەی بەکاردێن بۆ گەیانـدنی پەیامـەکانی دەق ــ لەبارەی تاکێك، گرووپێـك لـە تاکـەکان، رووداوێـك، مەسـەلەیەك، یـان رووداوێکـی پێشـبینیکراو، کردەیـەك، بارودۆخێـك یـان هــەر بابـەت و باسـێکی تـری دەقــی رۆژنامەکان ـــ بابەتەکـە بـە شـێوەیەکی ڕاسـتەوخۆ و بـە خـورتی بنیـاد دەنـێن" (ibid, p. 48).

ئـــەم چەشـــنە ڕەگەزانـــەی ڕاگەیانـــدنی ســـنووردانەر و جیاوازیدانـــەر لـــە پێکدادانـــەکانی نێـــوان تـــورك و ئینگلیـــزدا لـــە ســـاڵی ١٩٢١ دا لـــە رۆژنامـــەی "پێشکەوتن" دا بەدی دەکرێ:

**(١)"ڕانیە و ڕەواندز"**

**ڕۆژی ١٣ ئاگۆست جەنابی حاکمی سیاسی لەگەڵ عەسکەری سوارەی لیوای سلێمانی گەیشتە ڕانیە. لە ڕۆژی ١٤ی مانگدا کۆمەڵێکی عەشایری کن ڕەواندز کە نزیک ٢٥٠ سوار بوون، لەگەڵ چەتەیەکی پیادە کە جلی رەسمی تورکییان لەبەردابووە ڕوویان کردۆتە ڕانیە و لەپاش شەڕە تفەنگ عەسکەری سوارەی سلێمانی ئەوانیان شکان و بڵاوەیان پێدان.**

**وادەزانرێت کە لە عەشایری ڕەواندز ٤ کەس کوژرا و ٣ بریندار بووە، لە پشدەری کە لەگەڵ عەسکەری سوارەی سلێمانی بوون، یەکێ بریندار بووە لەپاش ئەمە لە قەزای ڕانیەدا هیچی تر ڕووی نەداوە.**

**حاکمی سیاسی تەلغرافی هاتووە دەنووسێت کە عەشایری رواندز ڕۆیشتنە ماڵی خۆیان لە قەزادا ئەمینی دامەزراوە و قایم بۆتەوە." (پێشکەوتن ساڵ٢ / ژمارە ٦٩ی ١٩٢١).**

لەو دەقە بەربڵاوەی سەرەوەدا، بۆ ئەوەی بزانین چۆن کردەی لایەنی تورکەکان وەسف کراوە و لەگەڵ کردەی لایەنی ئینگلیزیدا بەراورد کراوە: "تورک ڕاستەوخۆ وەك "چەتەیەکی پیادە" وەسف کراوە کە لەگەڵ ***"کۆمەڵێك"*** ی عەشایری ***"کن*** ڕەواندز" **"ڕوویان کردووەتە"** ڕانیە. کاری "ڕوویانکردۆتە"، لە جۆری کارە چالاکەکان (Dynamic)ە و لە واتا ئاساییەکەیدا "ڕووکردن" بۆ لایەنە و بۆ هەر کەس یان شتێك دێت کە ئاڕاستەکەی بەرەو لایەك دەگۆڕێ. هەروەها دەکرێ واتایەکی ئەرێنیشی هەبێ وەك:"***زانا بۆ تەواوکردنی خوێندنی باڵا ڕووی لە هەندەران کرد***". بەڵام لێرەدا ئاماژەی هاوپێچی گۆڕانی باری ئێستای تێدایە. نواندنەوەی کردەی لایەنی تورکی بە "ڕووکردن"، لەم دەوروبەرەدا و **هاوڕێبوونی** لەگەڵ "کۆمەڵێکی عەشایری کن ڕەواندز"و **"چەتەیەکی پیادەدا"**دا مەبەستی گۆڕانەکە بەرەو تێکدان و تاڵانکردن بەهێزتر دەکات. نموونەی بەکارهێنانی ئەم کردەیە لە دەوروبەرێکی هاوشێوەی لەم دەقەی خوارەوەدا دەردەکەوێ:

**(٢) کوللە زەرتکە** ئەم چەند ڕۆژە **بە پۆل ڕووی لە قەزاکەمان کردووە،** لەپاش گەلێك زەرەردان لە هەموو نەواحییەك دەستی بەگەرادانان ناوە، ئەگەر

**حکومـەت** زوو فریـای نەکـەوێت **موسـتەقبەلی** قەزاکـەمان **چـاك نابـێ**... (زاری کرمانجی، ژ.٢٢، ٣٠ی نیسانی ١٩٣٠).

(کولله/ چەتە؛ کۆمەڵ/ پۆل؛ رووکـردن) واتـای زەرەرمەنـدی دەگەیـەنن لـەم دەقانەدا و چارەی ئـەم بەڵایـەش بەحکومـەت دەکـرێ. بۆیـە حکومـەت و حـاکمی سیاسی لەم دەورووبەرانەدا یەك دەور دەبینن.

بەتایبـەت ئەگـەر لەگـەڵ کـردەی "گەیشـتن"ی حـاکمی سیاسـی و لایـەنی ئینگلیزی بەراوردی بکەین دەبینین گەیشـتن، واتـای وەسـتان و سـەقامگیربوون و مانەوە و ئۆقرەگرتن دەگەیەنێ و هێنانی لەگەڵ "حـاکم" و "عەسـکەری سـوارەی سلێمانی"دا واتای پاراستن و ئاسایش و قانوونیبوونی گەیشتنەکە دەگەیەنێ و لـە رێگەی ئەم بەکارهێنانەوە سەرپۆش لەسەر کردەی لایەنی ئینگلیزی لە سـەرکوتی راپەڕینی خەڵکی ئەم ناوچەیە بە دژی خۆیان دادەنێ.

وەسفکردنی "خۆمـان" وەك ***عەسکەری سـوارە*** و "ئـەوان" وەك ***چـەتەیەکی پیادە***، ئەم لێکدانەوەیە دەسـەلمێنێ. وەسـفکردنی ئێمـە بـە **سـوارە** و ئـەوان بـە ***پیادە***، واتـای رەوایـی دەسـەڵاتی خۆمـان و نـاڕەوایی و نزمـی پێگـەی "ئـەوان" دەگەیەنێ . دیارە ئاوەڵناوەکانی ***سوارە*** و ***پیادە*** لەخۆیاندا واتای نرخاندنیان تێدا نییە و بە شێوەیەکی بابەتی وەسفی چۆنێتییەك دەکـەن لـە گـوتنێکی ئاسـاییدا، بـەڵام لێـرەدا چـونکە ***پیـادە*** وەسـفی ***چـەتە*** دەکـات و وشـەی چـەتە واتایـەکی نرخێندراوی نەرێنییە بۆ لایەنی بەرامبەر (تورك) و پیادەش واتـای شـاراوەی کـەم دەسەڵاتی و نزمیی پێگـەی کۆمەڵایـەتی پەسـنکراوەکە (ئـەوان) دەگەیـەنێ. لـەم دەقـەدا دەبیـنین لایـەنی ئینگلیـزی بـە "گەیشـتن"ی بـۆ رانیـە خـۆی دەخاتـە هەڵوێستی بەرگریکارەوە و لە ئەنجامی "رووکردن"ی چەتە تورکەکانەوە "**شەڕە تفەنگ**" دێتـە ئـاراوە. هێنـانی وشـەی شـەڕەتفەنگ هاوسـەنگە لەگـەڵ چۆنێتیی گێڕانـــەوەی رووداوەکـــە و کـــردە پاڵخراوەکـــانی بەشـــداربووەکان، بەتایبـــەتی کوژراوەکـان لـە عەشـایری (کـوردی) رەوانـدزن، نـەك لەوانـەی وەك "چـەتەیەکی پیادە"ی تورك ناویان هاتووە. هەربۆیە زاراوەی "شـەڕەتفەنگ" واتـای شـاراوەی شەڕێکی دوولایەنی هاوشان و بەچەکی سـووك دەگەیـەنێ، و بـەم جـۆرە دەیـەوێ ئاسـتی دڵڕەقیـی لایـەنی ئینگلیـزی داشـکێنێ. واتـە هەرچـەند لایـەنی ئینگلیـزی

سەرکەوتوون و لایەنی تورکی **شکاون و بڵاوەیان پێکراوە**، بەڵام ژینگەی ڕووداوەکە و بەشداربوو و کارتێکراوەکانی کوردن و بەشێوەیەکی شاراوە دەیەوێ بەم داشکاندنە خۆ لە ورووژاندن و بێزاریی هۆزە کوردەکانیش بە دژی خۆی بدزێتەوە. بۆیە بە نەناسراوکردنی (عەشایر) بەهۆی پاشگری نەناسراو (- ێکی) بۆ سەر دیارخەری "کۆمەڵ" و نواندنەوەی وەك "کۆمەڵێکی" و ئاوەڵگوازارەی "کن" دەیەوێ هاوبەشیی کورد لەم کردەیەدا بچووك پیشان بدا و بیبەستێتەوە بە ***تاقمێکی نزیك*** ڕەواندز نەك شاری ڕەواندز کە بە گرنگتر دێتە بەرچاو. لەلایەکی تریشەوە هێنانی هاوبەشە کوردەکان وەك کارتێکراو و بەدوای یەکتردا وەك ***عەشایری ڕەواندز*** و ***پشدەری***، ئەو گریمانەیە بەهێزتر دەکات کە کوردیش وەك دوولایەنی جیاوازی دژبەیەك پیشان بدات کە خۆیان بەرپرسیاری کوژراوەکانیانن لە هەردوو لا؛ کاتێ کە لە کۆتایی دەقەکەدا دەگێڕێتەوە:

(٣)"وادەزانرێت لە ***عەشایری ڕەواندز*** ٤ کەس کوژراو و ٣ بریندار بووە، لە ***پشدەری*** کە لەگەڵ عەسکەری سوارەی سلیمانی بوون، ***یەکێ*** بریندار بووە".

نواندنەوەی پێکدادانی دوو لایەن لە کردەی "شەڕەتفەنگ"دا بەرپرسی کوشتنەکان لەم پێکدادانانەدا دەشارێتەوە و بەتایبەتی بەوەی کە لەکاری بکەرنادیاری "کوژرا" و "برینداربوو"دا دەنوێندرێتەوە. ئەوە لە حاڵێکدایە کە ئەم دەقە باسی ململانێیەکی زەقی **"تورك"** و **"ئینگلیز"** وەك دوو لایەنی سەرەکی بەشداربووی ئەم گوتارە دەکات. بەشداربووەکانی هەرکام لەم دوولایەنە "عەشایر"ی کوردن. کورد لەو کاتەدا لەگەڵ داگیرکەری ئینگلیز لە شەڕدایە؛ ئەگەر تورك هاتوونەتە ناوچەکە لە ڕاستیدا بەهۆی هەبوونی ئەم ناڕەزایەتییەی کورد لە داگیرکەرەوە هاتوون و دەیانەوێ ئەم هەلە بۆ گوشار بۆسەر ئینگلیز و وەرگرتنی ئیمتیاز لە وان بەکاربێنن. کورد لێرەدا ئامرازە، هەردوولا بەکاری دێنن، بۆیە بەناوی عەشایر ناودەبرێن (عەشایری ڕەواندز) نەك ناوی نەتەوایەتییان وەك "کورد". تەنانەت ئەو تاکەی وەك عەسکەری سوارەی حکومەتیش ناو دەبرێ بە ناوی تایەبەتییان ناو نابرێن، بەڵکو بەناوی عەشیرەتەکەیان (پشدەری) ناو دەبرێن. ئەمە بێجگە لەوەی لاوازیی دەسەڵات و پێگەی تاك لەناو خێڵدا دەگەیەنێ کە بەچاك و خراپ کار و کردەوەکانی تاك بۆ خێڵ دادەنرێ و بەناوی خێڵ تۆمار

دەکرێ، هەروەها گرێدراوە بە ئامانج و بەرژەوەندیی بەرهەمهێنەرانی دەق و گوتارەکەوە، لەم دەقەدا دەبینین کە هەموو کارا کۆمەڵایەتییەکان لە دەقەکەدا یان نانوێندرێنەوە و یان بە کاڵ و کەمڕەنگی دەنوێندرێنەوە و لەناوی "عەشایر" یان "پشدەری" (ئاستە کۆمەڵایەتییەکەیان)دا دەگشتێندرێن و دەخرێنە پشتەوە. واتە وەك تاکەکەس بەناوی خۆیان ئاماژەیان پێ ناکرێ. بەم جۆرە دەبینین بژاری وشەکانی "**حاکمی سیاسیی**"، ("**عەسکەر**"ی "**سوارە**"ی "**سلێمانی**") و "**گەیشتن**" بەرامبەربە وشەکانی ("**کۆمەڵێك**"ی "**عەشایر**"ی "**کن**"**ڕەواندن**)، ("**چەتە**"**یەکی** "**پیادە**"ی "**تورك**")، "**رووکردن**" **لە جیاتی جێگرەوەکانی تری وا دەشێ هەبن، گرێدراوە بە ئایدۆلۆژی و بەرژەوەندیی سەرنووسەری ڕۆژنامەی پێشکەوتنەوە**. ئەمەش بۆ ئەم تایبەتمەندییەی زمان دەگەڕێتەوە کە "بەردەوام سەرچاوەیەك بۆ دەستەواژەی بریتی دەستەبەر دەکات: بەردەوام ڕۆنانی ڕێزمانیی جیاواز و یەکەی وشەیی جیاواز لەبەر دەستدان بۆ ئاماژەکردن بەشتێکی "یەکسان" لە شێوەی جۆراوجۆردا، لە ڕێگای ڕێگەدان بە دەربڕینی هەڵوێست، نرخاندنی تاکەکەسییانە، و گۆشەنیگاکانەوە" (Widdowson, 2007: 69).

### نواندنەوەی کارا کۆمەڵایەتییەکان لە ناودانان و پۆلینکردنەکانیاندا

شیکردنەوەی کارای کۆمەڵایەتی دەتوانێ یارمەتیمان بدات لە تێگەیشتنی ئەوەی چۆن تاکەکان لە دەقەکاندا پۆلین دەکرێن و دەنرخێندرێن. شیکردنەوەی کارای کۆمەڵایەتی لە کۆمەڵێك کەتیگۆری کۆمەڵایەتی– واتایی ( Socio-semantic) پێکدێت کە دەتوانێ لە رووی زمانی و دیداری(Visually)یەوە بەڕێوە بچێ. ئێمە جەخت دەکەینە سەر ئەم چەمکانەی کە لەلایەن "ڤەن لیووێن"ەوە (١٩٩٦) دەستنیشان کراون. وەك "ناودانان" (Nomination) و پۆلینکردن" (Categorization)، ) ئاستبەندی (Classification)، چونکە ئەمانە بەڕوونی ڕێگەمان بۆ خۆش دەکەن بۆ ئەوەی دەستنیشانی بکەین بەشداربووەکان لە دەقەکاندا چۆن نوێندراون.

أ) – **ناودانان:**

"ناودانان لە راستیدا شێوەیەکی کولتوورییە بۆ چەسپاندنی شتێك کە ئێمە وەك واقعێك لە جیهانی دەوروبەری خۆمـان بـەهای پێـدەدەین" (پاکنهـاد، ١٣٨١: ٦٦). کارا کۆمەڵایەتییەکان بەپێی پێناسەی تایبەتی و تاقانەی خۆیان لە رێگەی نازناوەکان دەنوێندرێن. ناوبردنی کاراکان بە پێی پێناسەی کەسیی و تایبەتییان، بـە شـێوەی "فـەرمی" وەك "جـەنابی شـێخ مـەحمود، جـەنابی بابـەکر ئاغا"/"**حەزرەتی ئەمیر فەیسەل** "/ "مدیر مەجید ئەفەندی"، یـان نیمچـە فـەرمی وەك "شێخ مەحمود"و یان نافەرمییـە وەك "خولـەی دەوڵـەتیار"، "مینـا نـاو"، "قالـەی حەمـەی حـاجی"، "عـەزەی شـاکە"، گرێـدراوە بـە پێوەندییـە کۆمەڵایەتییـەکانی هاوبەشـەکانی دەقەکـە و ئـەو شـێوەیە لـە تێڕوانینـی رۆژنامەنووسەوە بۆ ناساندنی ئەوان، لە راستیدا رۆژنامەکان بەشدارن لـەوەی ئـەم چەشنە لە پێوەندیی کۆمەڵایەتی لە رێی وشەکان و لێرەدا ناوەکانەوە بەدی بێنین یان بەهێزی بکەن. وەك ئەم نموونانەی خوارەوە:

(٤)**جـەنابی بابـەکر ئاغـا** بـیری هاتنەسـلێمانی هەیـە (پێشـکەوتن، ژ١. ٢٩ی ئاپریلی ١٩٢٠)

(٥) **عەزەی شاکە تیلەکۆیی** ماینێك و گوێدرێژێك لە کفـری **دەدزێ**، دەیهێنـێ بۆ ماڵی **حەمەی شاکە لە لەنجاوا** – لەسەر راسپاردنی **مدیر مەجیـد ئەفەنـدی** کـە هەرچی روویدا چـاك و خـراپ دەبـێ بیزانـێ –... (پێشـکەوتن، ژ١. ٢٩ی ئـاپریلی ١٩٢٠)

(٦) **خولەی دەوڵتیار** کە مودەتێکە دێهـاتی ئـەم قـەراغ شـارەی بـە راوڕووت تەعجیز کردبوو،...ئەیگرن (ژیان، ژ.٦٥، ١٢ی مایسی ١٩٢٧).

ب)– **پۆلینکردن:**

کارا کۆمەڵایەتییەکان بۆ سێ شێوەی بنەڕەتی پۆلین دەکرێن:

١) **ئەرك پێدان** (Functionalization) واتە بـەپێی ئـەرکی پیشـەیی یـان بـە پێـی چـالاکیی کۆمەڵایـەتییان دەنوێنـدرێن (بـەوە کـە "ئـەوان چـی دەکـەن" دەناسێنرێن)، وەك لەم نموونانەی خوارەوەدا دەردەکەوێ:

(٧) خیلافـی ئـەمر و ئیعلانـی حکومـەت... و **عـەدەمی ئیمتسـال ئـەوامری حکومەتـەوە** قەڵەمچی حـاجی محەممەد کـوڕی سـاڵحی حەمـە لاو و نەعلبەنـد ، ئوسـتا سـاڵح کـوڕی عەبـدولڕەحمان **هەریـەك** بـە پـەنجا ڕوپیـە جـەزای نەقـدی مەحکووم کران (ژیانەوە، **ژ.٣٧ی** ٢٧ی ئاگۆستی ١٩٢٥).

بۆ ناساندنی ئـەو تاکانـەی دەسـەڵاتی کۆمەڵایـەتییان لاوازە و سـەر بـە سـێ توێـژە باڵادەسـتەکە (شـێخ، ئاغـا و ئەفەندییـەکان) نـین، کاراکـان بـە پێـی پیشـەکانیان دەناسـرێن، و پیشـەکەیان دەکرێتـە لووتکـە (Topicalization) لـە ڕیزکردنـی کەرەسـتە پێکهێنـەکانی گـرێ ناوییەکانـدا لـە ڕووی زمانییـەوە. ئەمـە بەشێوەیەکی شاراوە ئەو کلێشە زمانییە شاراوانە دەخاتە ڕوو کـە لادان لـە بنـەما کۆمەڵایەتییـەکان دەبەسـترێتەوە بـە ئاسـت و چـینی کۆمەڵایـەتی مامناوەنـدی و خوارترەوە، کـە ئـەم ئاسـتەش لـە ڕێگـای "پیشـەی کـارا کۆمەڵایەتییـەکان"ەوە دەردەکـەوێ، بۆیـە چـالاکییە نەرێنییـەکان و لادانـەکانی تـاك لـە ڕێگـەی بـە لووتکـەکردنی پیشـەکەیەوە دەخاتـە پـاڵ ئاسـتە کۆمەڵایەتییەکـەی. لـە ڕاسـتیدا دەسەڵات و پێگەی کۆمەڵایەتی کاراکان کاردەکەنـە سـەر چۆنێتیی نوانـدنیان لـە زماندا. ئەمە ئەو دیاردەیەیە کە ***فێرکلاف*** بە ***سروشتیبوونی ئایدۆلۆژی*** لـە زمانـدا ناوی دەبات و، بەشێوەیەکی ئایدۆلۆژیکییانە کارە نەرێنییەکانی ئەوانی تر کـە لـە ئاست و گرووپی خۆماندا نـین دەخەینـە پێشـەوە و کـارە نەرێنییـەکانی کاراکـانی سەر بە گرووپ و ئاستی خۆمان دەخەینە پشتەوە (Backgrounding).

بەڵام ئەگەر کاراکان لەو توێژە بن کە دڵخوازی ڕۆژنامەکە بن،  بـە جـۆرێکی شیاوتر دەنوێندرێن بۆ نموونە:

(٨) تـــەلێك لەلایـــەن **حـــەزرەتی مەنـــدوبی ســـامی هـــاتووە** بـــۆ سلێمانی..(پێشکەوتن، ژ٦١. ٢٣ی جونی ١٩٢١).

(٩) **موتەسـەریفی عـالی لیوامـان سـەعادەت تەحسـین بـەگی عەسـکەری** لـە ئـەوەڵ ڕۆژی یەکـەمی حـوزەیران **کـوڕێکی تـازەی هاتۆتـە** دونیـا و نـاوی نـراوە فاروق.... ***(کەرکووك، ژ. ٣٠٧، ٩ی حوزەیرانی ١٩٣٠)***

لـە پێوەنـدی لەگـەڵ ئـەم نموونانـەدا دەبیـنین کـە"جیـاوازیی ڕەگـەزی و چینایەتییان بەتەواوی ستوونی و پلەیین و زەمینە بۆ دەسـەڵاتداربوونی گرووپێـك

لە ڕێی پەراوێزخستن و دەسەڵات سەندنەوە لەوانی دیکە خۆش دەکەن" (تولان، ١٣٨٦:: ٤١٦).

٢) **ناساندن** (Identification)، بەواتای پێناسەی ئەو کارا کۆمەڵایەتییانە دێت کە نەك بەپێی ئەو کارەی ئەنجامی دەدەن، بەڵکو بەپێی ئەو شتەی هەمیشە یان بە خورتی هەیانە دەناسرێن (ئەوان کێن)، (Van leeuwen, 1996 :54) کە ئەمەش بە پێی "پێوەندییان بەکەسەکانی ترەوە" و " پێناسەی فیزیکییان" دەکرێ:

**١– پێوەندییان بە کەسەکانی ترەوە:**

(١٠ جەنابی فازل و مورشیدی کامل حەزرەتی شێخ سیدیق ***برای*** حەزرەتی شێخ ئەحمەدی بارزان خودا راگیراویان کا ... بۆ دیدەنی و زیارەتی حەزرەتی سەید تەها تەشریفیان هاتە رەواندز (زاری کرمانجی، ژ. ٢، ١٠ی موحەرەمی ١٣٤٥).

(١١عایشە ***کچی*** رەشید ئەحەل و ئامینە ***کچی*** مستەفا شرە جنێویان گوتووە و لەیەکتریان داوە...(ژیانەوە، ژ.٢٨ی ١٩٢٥).

**٢– پێناسەی فیزیکییان:**

**(١٢<u>قاچ باریکەکانی</u>** هیندستان رژانە سلێمانی....**(ئومیدی ئیستقلال، ژ.١٠ی ١٢ی رەبیعولئاخری ١٣٤٢)**

(١٣ئێمە لە **هیندوەکان**، **<u>چینییە پێ خرەکان</u>** ، **لە یام یامەکانی ئەفریقیا** ...کەمتر و بێ بەهرەترین؟...**(ژیان، ژ.٣٦، ٧ی ئەیلولی ١٩٢٦)**

(١٤گوێکرتن لە تەزویراتی ئەو "***<u>جلخوار</u>***[٣]" انەی رەواندز بۆ کوردان چاك نابێ (...) (بانگی کوردستان. س١. ژ١٤. لل ١–٢ . حوزەیران ١٩٢٢).

**٣) ئاستبەندی** (Classification):

"کارا کۆمەڵایەتییەکان بەپێی ئەو پۆلە سەرەکییە ناودەبرێن کە بەهۆی دامەزراوە یان کۆمەڵێکی دیار لە نێوان ئاستەکانی خەڵکدا جیا دەکرێنەوە ( Van Leeuwen 1996: 54). لە کۆمەڵی ئێمەدا ئەمانە بریتین لە تەمەن، رەگەز، زێد، چین، دارایی، نەژاد، نەتەوە، مەزهەب، هۆز، تایفە، و هی تر... ئەوە دەکرێ روون بکرێتەوە کە ئەمانە کەم تازۆر جۆری شیاوی گۆڕین نین، وەك کەسێکی "رەش

پێست"، یان کەسێکی "سپی پێست". ئەم ئاستانە لە شیکردنەوەدا گرنگن چونکە ڕێگەمان دەدەن لەبارەی ئەو کارایانەی جیاکراونەتەوە یان هەڵاوێردراون بیر بکەینەوە و لایەنی نرخاندنی ئەرێنی یان نەرێنییان بخەینە بەرچاو.

(١٥**خەلقی محەلەی دەرگەزین** موتەهەم **قالەی حەمەی حاجی** کە ئەموال و ئەشیای **رەفعەت ئەفەندی** سرقەت کردووە، بە ساڵێك حەبسی شەدید مەحکوم کراوە. (ژیانەوە، **ژ.٣٧ی** ٢٧ی ئاگۆستی ١٩٢٥)

لەم دەقەدا دەبینین کە ئاست و دەسەڵاتی کۆمەڵایەتی لە نواندنی کاراکاندا چ جۆر ریزبەندییەکی لە گرێ ناوییەکاندا دروست کردووە، (خەلقی محەلەی دەرگەزین موتەهەم "قالە"ی حەمەی حاجی)؛ وەك تاکێکی ئاسایی کۆمەڵ لە بەرامبەر (رەفعەت ئەفەندی)دا هاتووە، لێرەدا سەرنووسەری رۆژنامەی "ژیانەوە" ناوی تایبەتیی کاراکە (قادری حەمەی حاجی) بە کەم زانیوە بۆ وەسفکردنی کردەی "دزی کردنی" لە کارایەکی بەدەسەڵاتتر و ئاست بەرزتری کۆمەڵایەتی (ئەفەندییەك). بۆیە نواندنی بە پێی پێوەندیی بە شوێنی نیشتەجێبوونی واتە، "خەلقی محەلەی دەرگەزین" و "موتەهەم "یشی خستووەتە پاڵ. شوێنی ژیانەکەی کردووەتە لووتکەی ناساندنەکەی، ئەم جۆرە ناوبردنە بە لێسەندنەوەی پێناسە (impersonalisation)ەکەی وەك ناوی تایبەتی خۆی و بە پاشکۆکردنی ناوە تایبەتەکەی لە ڕێگای نواندنی کاراکە بە پێی شوێنەکەیەوە دادەنرێ. ئەمە لە ڕێزمانی ئەرکی هالیدەیدا و لە رووی تێپەڕاندنەوە، رەگەزی بار (circumstantial element)ە. ئەم رەگەزەش کە وەك رەگەزێکی پاش زەمینەیی دەناسرێ، گرنگە چونکە دەتوانێ رۆڵی کەسەکە لە رووداوەکەدا کەم کاتەوە یان بە تاوانبار بناسێنێ" (تولان، ت: ١٣٨٦:: ٣٩٨) کە لێرەدا مەبەست تاوانبار پیشاندانەکەیە، چونکە بۆی هەیە بە جۆرێك واتایەکی شاراوەی تێدا بێت بۆ خستنەپاڵی کردەی دزیکردن بە خەڵکی گەڕەکەکەش کە گشتاندنە. دیارە ئەگەر ئەمە بڕیاری "مەحکەمەی جەزای دەرەجەی ئولای سلێمانی"یش بێت، کە رۆژنامەکە هەواڵی دادگاکانی رووماڵ کردووە، ئەوە دەگەیەنێ نواندنی کاراکان لە روانگەی یاساوە یەکسان نین. نواندنەوەی کاراکانی نادادپەروەرانە رەوانەی رۆژنامەکە کردووە و دەکرێ بڵێین رۆژنامەکەش پێوەندییەکانی دەسەڵاتی لەم

سیستەمە کۆمەڵایەتی و یاساییەدا پاراستووە و ڕەوایی پێداوە و تووشی ئەو هەڵاواردنە چینایەتییە بووە کە زاڵە. دیارە هەڵاواردنەکان لە سەروتارەکاندا زەقتر دەردەکەون وەك لەم نموونەی سەروتارەکانی ڕۆژنامەی تێگەیشتنی ڕاستیدا بەدی دەکرێ:

(١٦حکومەتی موعەزەمەی بەریتانیا کە بە ئەسارەتی ***قولە ڕەشەکان*** ڕەزا نەبوو، ***ئەڵبەتە*** بە فریادی ***کوردان*** ئەگا." (تێگەیشتنی ڕاستی، ژ.٣، ٨ی کانونی دووەمی ١٩١٨).

لەم دەقەدا **نەژادی کورد** وەك نەژادی سپی، بەسەر نەژادی ڕەشەکان بەرایی پێدارە، کە ئەمە خۆی بیری "نەژاد پەرەستی"و جیاوازیدانەرانەی گوتاری ڕۆژنامەنووسی ڕۆژنامەکە دەردەخات؛ ئاست بەندییەکە لایەنی نەژادی گرتووەتەبەر.

**نواندنی ڕەگەز (gender)**[٤]: ئێمە لێرەدا نواندنی ناهاوشانی (asymmetry) ژن و پیاو لە پێوەندی لەگەڵ دەسەڵاتدا دەخەینە ڕوو. لەبارەی گوتاری ڕەگەزەوە، ڕەگەزیش بەپێی پێگە و دەسەڵاتی کۆمەڵایەتی بەشێوەی جیاواز نوێندراوە. ئەگەر ژن سەر بە خێزانی ئەشراف بووە، لەزمانیشدا ناو و نازناوی ئەشرافی وەرگرتووە، بەڵام بەگشتی وەك ئاستێکی خوارەوەی ڕەگەزی بەرامبەری نوێندراوە. ئێمە وا گریمانە دەکەین کە لەزمانی کوردیدا، ڕەگەزی نێر(پیاو) وەك نوێنەرێکی گشتی (بێ نیشان) دەنوێندرێ، بەڵام ڕەگەزی مێ لە ئەرکی ڕەگەزی خۆیدا دەنوێندرێ، بە شێوەی ئاشکرا بێت و یان بە شێوەی نائاشکرا. وەك نیشانەکانی ڕەگەزی "جوامێر"، "ناپیاو/پیاو" " زەعیفە"، و "عیفەتمەئاب"و ...

(١٧) لەبەغدا دەمێکە پیاوان خەریکن نادییەك بۆ خۆیان ڕێك بخەن، هێشتا بۆیان نەچووەتە سەر، لە نەکاوا خوێندەوارەکانی ***"جنسی لەتیف"ی*** عاسیمە نادییەکیان بەناوی موعەلیماتەوە کردەوە{...}(ژیان، ژ.٣٢٤ی ٢ی حوزەیرانی ١٩٣٢)

لەم نموونەیەدا بەرامبەرکردنێك لە نێوان دوو ڕەگەز (پیاوان و ژنان)دا دەبینرێ. ئەم بەرامبەرییە لە ڕووی زمانییەوە لە بەرامبەرکردنی دوو کاتی ڕابردوو

و  و ئێستاشـدا لـەرێگای بـەکارهێنانی ئاماژەگـەرەکان (deictic)ی "دەمێکـە" و "هێشتا"دا دەبینرێ. لەم دەقەدا بە شێوەیەکی بەردەوام جـەخت لەسـەر هـەوڵی پیاوان کراوەتـەوە.  دەمکـاتی کارەکـانیش بـەوەی کـە کـردەی پیـاوان لـە کـاری رابردووی تەواو(present perfect)دا دەردەبـڕێ و نەگەیشـتووەتە ئـەنجام، واتـای ناکامبوونی پیـاوان دەگەیـەنێ. لـە بەرامبـەردا ژنـان وەك بـەئاکام گەیشـتوویەکی چاوەڕوان نەکراو دەبینیٚ، ئەمەش لە ئاوەڵکـاری "لەنـەکاوا" و لـە کـاری چـالاکی (نادییەکیان کـردەوە)دا دەنوێنـێ. لـەم دەقـەدا وشـەی "ژن/ژنـان" وەك نـاوێکی دەربـڕی توێـژی کۆمەڵایـەتی رەگـەزی مێیـە و لـە بەرامبـەر "پیاو/پیـاوان"دا لـە گرێیەکی وەسفی (جنسی لەتیف)دا دێت کە ئاماژەیـەکی جنسـییە نـەك رەگـەزی. وادیارە رۆژنامەنووسەکە هۆی لەنەکاو کردنەوەی نادییەکە بۆ ئەم سـیما پێکهێنـە واتاییەی ئەوان دەگەڕێنێتەوە.

(١٨){...} یەکێ لە منەوەران ژنەکەی ژان دەیگـرێ، بـە کـەماڵی حیجابـەوە دەڵێ: ئەفەندی؛ لازمە مامانێ بێنی موحتاجم بەیەکێ لەلام بێ، منەوەر دەڵێ بۆچ حەیواناتی وەحشی و ئەهلی بـێ مامـان زگ و زا دەکـەن، ژن بۆچـی داوای مامـان دەکا، بە عەقڵی خۆی کەسی بۆ بانگ ناکا "زەعیفە" بـەوەزعی حەملـەوە وەفـات ئەکا{...}(ژیانەوە، ژ. ٢٥، ٣٠ی نیسانی ١٩٢٥).

ئەم دەقەی سەرەوە کە پارچەیەکە لە سەروتاری رۆژنامەی ژیانەوە لـەبارەی هەڵبژاردنەکانی "ئەنجومەنی مەبعوسان"ی عێراقەوە، زیاتر بەمەبەستی شـکاندنی منەوەرەکان هاتووە، بەڵام بۆ ئـەم کـارەی لـە چیرۆکسـازییەکدا کەسـایەتی  ژنـی بەکارهێناوە، لە سیمای قوربانییەکدا کە فیدای عەقڵی خاوی منەوەرێك دەبێت:

لـەم دەقـەدا ژن وەك مرۆڤێکـی "شـەرمنی بـێ دەسـەڵات" نوێنـدراوە، کـە پێویستی بە "مامان"ێکی هاوڕەگەزی خۆیەتی بـۆ رزگـاربوونی. "مامـان" بـەپێی بوارە کۆمەڵایەتییەکەی نـاوێکی پیشـەیی نیشـانەدارە بـۆ رەگـەزی مـێ. هـەروەك چـۆن "دارتـاش" و "قەسـاب" بـۆ پیـاون. نواندنـەوەی بـاری گـوتنی ژنەکـە "***بە کەماڵی حیجابەوە دەڵێ***"،  پێوەندیی کۆمەڵایەتیی ژن و مێرد لەو قۆناغە پیشـان دەدات، تەنانـەت لـەکاتێکی وا هەستیاریشـدا کـە گیـان لـە مەترسـیدایە، ژنەکـە ناتوانێ داواکەی بە روونی و لێبڕاوی بڵێ و بە شەرمەوە داوای یارمەتی لە شەریکی

ژیانی خۆی دەکات. بەتایبەتی ئەم ژێردەستی و بێ دەسەڵاتییەی لە ڕووی ڕەگەزییەوە لە وشەی "***زەعیفە***"دا دەنوێنێ. کە ئەمەیان ناساندنی ژن بە پێی ناساندنێکی جەستەیی و فیزیکییە.

## بەشی دووەم

## دەسەڵات ( Power ) و هاوپێوەندیی ( solidarity ) و نیشانە کۆمەڵایەتییەکان

نیشانە زمانییەکانی دەسەڵات و هاوشانی لە زمانی کوردیدا دەکرێ لە جێناوەکانی کەسی دووەم یان سێیەمدا و لە وشەکانیش وەك کارەکاندا دەرکەوێ.

دەسەڵات و "**هاوپێوەندی**" ئەو پێکهاتە ئایدۆلۆژیکییانەن کە واتا دەبەخشن بە چۆنێتی بەکارهێنانی **جێناوەکان**. بەم پێیە، سیستەمی جێناو نواندنەوەیەکن لە پێوەندییە کۆمەڵایەتییەکان و تاڕادەیەك میکانیزمێکن بۆ بەرهەمهێنانەوەی ڕیزبەندیی دەسەڵات. شتی لەم جۆرە بۆ جۆرەکانی ناوە کەسییەکانیش ڕاستە. سیستەمە ئایدۆلۆژییەکان لە بژارە بنچینەییەکانی ناو یان جێناوەکاندا مەیلی سەرەکی لێکۆڵەرن لە لێکۆڵینەوەی میدیاکاندا. ئەمە ڕێژەیەکی زۆر لە جیاوازی بەدی دێنێ کاتێ کە کەسێك بڵێ: "جەنابی شێخ مەحمود "، ""یان "خان بەهادور عادیلە خانم"/ مینا ناوێ، "شێخ مەحمود"، "حوکمداری کوردستان" یان "خولە (لە "خولەی دەوڵەتیار"دا)" (Fowler, 1996: 35).

### گۆڕینی جێناوەکان

نەریتێکی ناودانان و ناونیشان دانان چۆنێتی بەکارهێنانی جێناوە کەسییەکانە. لە ڕوانگەی "**هۆدسن**"ەوە "نیشانە زمانییەکانی دەسەڵات – **هاوپێوەندی** بە قسەکەر و وەرگرەوە نابەسترێنەوە، بەڵکو لەوانەیە دەربڕی پێوەندیی نێوان قسەکەر و تاکێك بێجگە لە وەرگریش بن" (باغینی پور، ١٣٨٠: ١٣) ئەو جێناوانەی کە ئاخێوەرانی سیاسی بۆ ئاماژەکردن بە خۆیان و وەرگرەکانیان بەکاری دێنن، دەکرێ بەشێکی گرنگ بێت لە پەیامەکە. ئەوانە

لەوانەیــە بــۆ "پــێش زەمینــە" (foreground) یــان بــۆ بەرپرســیارێتی یــان کارایەتییـەکی (agency) ناڕوون بـەکاربێن (Thomas . . . [et al.], 1999: 52.) بۆنموونە بڕوانە بەشێك لە قسەکانی مـەلیك فەیسـەڵی حـاکمی عێـراق لـە راپۆرتـە هەواڵێکی رۆژنامەی "ژیان"دا:

(١٩"{...}لێتان **شاراوە نییە** کە دین بۆ خوایە و وەتەن بۆ هەموو لایەکە. لە نەزەر مندا لە بەینی سوکانی مەملەکەتە مەحبوبەکەمدا **هیچ** فـەرق و تەجـەزیێك؟ نییە{...} **هیچ** شوبهە نییە کە هەر یەك لە ئێـوە ئـەیزانێت کـە **حکومـەتی** عێـراق قەبوڵی تەجزیئە و تەفریق ناکات (ژیان، ژ.٢٨٧، ٣ی ئیلولی ١٩٣١).

گۆڕانی جێنـاو لـە "مـن"ەوە بـۆ "– تـان/ئێوە" یـان بـۆ نـاوی "حکومـەت" لێرەدا لەم چەشنە بەکارهێنانەیە کە گرێدراوە بە پەیامەکـەوە. هۆیـەکی روون بـۆ ئـەم گۆڕانـە دەشـێ ئـەوە بێـت، روون نییـە "ئێـوە" یـان "حکومـەت" بـۆ کـێ دەگەڕێتــەوە. مــەلیك فەیســەڵ "– تــان" جێنــاوی لکــاوی کەســی دووەمــی کــۆ بەکاردێنێ، ئاماژەبۆکراوەکەی خەڵکە و  دەڵـی: "لێتـان شـاراوە نییـە"، چـونکە گوتنەکەی دوایە واتە "*دین بۆ خوایـە و وەتـەن بـۆ هـەموو لایەکـە*" کـە تیشـکۆی قسەکانی پێکدێنێ جێگای بـاس و مشـتومڕە، چـونکە جـەماوەرێکی جۆراوجـۆری بـەئاین و ئـاینزای جۆراوجـۆر لەبەرامبـەری وەسـتاون و لەوانەیـە لەبەرامبـەر ئـەم بۆچوونەیدا هەڵوێست بنوێنن. بۆیە بەرامبەرەکانی بە (لێتان شاراوە نییە) دەکاتە هاوبەشی بۆچوونەکەی خۆی و ناوێرێ شتێکی وا راستەوخۆ بەناوی خۆیەوە بڵـێ. بۆیـە لـە هـەر جێیـەك ئـەم جێگۆڕکێیـە بـە جێناوەکـان دەکـات بـۆ ئەوەیـە کـە هاوپێوەندی بنوێنێ لەگەڵ بەرامبەرەکانیدا. ئەو بەشێوەیەکی زیرەکانـە رەچـاوی "مەســەلەی جۆراوجــۆریی ئــاینی" لــە وڵاتەکەیــدا دەکــات و بــەم جــۆرە دڵــی ئینگلیزەکـانیش رادەگـرێ. بـەڵام خێـرا و بـەدوای ئـەم گوتنـەی لـە "ئێـوە"وە دەیگۆڕێ بۆ "من" و خۆی دەکاتە پێش زەمینە، ئەویش کاتێك بەکاری دێنـێ کـە لە بارێکی دڵنیاتردایە و دەیەوێ بەرپرسیارێتی دەسکەوتێکی ئەرێنی تر لەئەسـتۆ بگرێ کە بانگەشەی دەکات و ئەویش "حاشاکردنە لە هەڵاواردنی ئـاینی و قـەومی لە نێوان دانیشتوانی عێراقدا". کاتێ کە دەڵێ: ***"هیچ شوبهە نییە کە هەر یەك لـە ئێـوە ئـەیزانێت کـە حکومـەتی عێـراق قـەبوڵی تەجزیئـە و تـەفریق ناکـات"***،

دیسانەوە ئەم جێناوە (من) بەهەمان شێوە دەگۆڕێ بۆ "حکومەتی عێراق"، چونکە، بەرپرسیارەکە ئاشکرا نییە کێیە و ئاماژەکە بۆ ئەو کەسە تایبەتە بگەڕێتەوە. تاکو خۆی لە بەرپرسیارێتی و کەوتنە بەر پرسیاری بەرامبەرەکانی و بەتایبەتی کوردەکان و خەڵکی شاری سلێمانی بدزێتەوە کە لە ژێر حوکمی ئەودا تاوانی ***بەردەرکی سەرای*** سلێمانی کراوە. ئاماژەی بە "عێراق" ناڕاستەوخۆ لەبەرامبەر "کوردستان"دایە، کە لەگەڵ حکومەتی عێراق و حاکمانی سیاسیی ئینگلیز لە عێراق لە ململانێدایە. بە جەختکردنەوەی لە گوتنێکی "مۆدالکارانە"دا؛ ***"لێتان شاراوە نییە"***، ***"هیچ شوبهە نییە" و "هەریەك لە ئێوە دەزانێت"***، دەیەوێ رادەی خۆبەستنەوەی بە گوتنەکە و راستیی و لێبڕاوانە بوونی بڕیاری حکومەتی عێراقی دەربڕێ. دەیەوێ بەم گوتنانەی خەڵکی لە ئامانجی حکومەتی عێراق و پێوەندیی بەکوردستانەوە دڵنیا بکاتەوە و بەشێوەی هاوپێچ خەڵکیش تێبگەیەنێت ئەو لەپلە و پایەیەکی وادایە بیروبۆچوونی خۆی بەنوێنەرایەتی خەڵك و حکومەتی عێراقیشەوە بدوێ و لێبڕاوانە بڕیار بدات. "وەتەن" ئاماژەیەکە بۆ دواوەی خۆی کە "عێراقە"، "دین" لە پانتای کۆمەڵەوە دەباتەوە بۆ کونجی دڵەکان و دەروونی تاکەکان، لەبەر پێکەوە ژیان و لابردنی جیاوازیی نێوان جۆراوجۆرییەکان. ئەمە لە هونەری دەربڕیندا بە جوان نواندن(euphemism)ی کارێکی ناپەسەند و ناشیرین دادەنرێ. بەم بەڵگە هێنانەوەیەی دەیەوێ نەتەوەیەك بە بێمەیلی خۆی بەرێتە ژێر رکێفی خۆی و نەتەوەی خۆی (عەرەب)ەوە. راست کارێکی رەگەزپەرستانە دەکات، و وەك عەرەبێکی سعودی و خەڵکی زێدی ئیسلام لافی سێکۆلارێکی پێشکەوتنخوازی ئەمڕۆ لێدەدات. ئەمە هیچ پێوەندییەکی بە ئەرکی "بیرۆکەیی" زمان (زمان بەواتای پێکهاتەیەك لە زانست و ئەزموون/شارەزایی)یەوە نییە، کە بەڵگەهێنانەوەش دەگرێتەوە. ئەم ئەرکە، ئەرکی"نێوانکەسی"یە، چونکە پاساودانی تاکەکەسییانەی قسەکەری پێوە دیارە و کارایی گوتنەکە بەستراوەتەوە بەو چەشنە پاساودانانەوە.

ئەگەر ڕۆژنامەکان لایەنێکی بەدەسەڵات بوون بۆ بەرهەمهێنان و پاراستنی گوتاری سوڵتە- بەو جۆرەی لەو نموونانە دەردەکەوێ و لە بەشی یەکەمیشدا ئاماژەمان پێدا- هەروەها دەتوانن لایەنێکی بە هێزی گۆڕانیش بن. لە ناوەکان و

لە ئاستی وشەکان و تەنانەت پاراستنی پێگەی تاك یان لایەنی دەسەڵاتدا کار بکاتە سەر گۆڕانی هەندێ لایەنی ڕێزمانیش وەك لەم نموونەیەدا:

(٢٠ قەومی کورد لە غایەی سەربەستیی بە واسیتەی حکومەتێکی حەمییەتمەندەوە زیاتر هیچ غایەیەکی تر تەعقیب و ئارەزوو ناکات...ئومێدمان وایە ئەو غایەیەمان و ئەو حقوقی مەشروعەیەمان پێ **بەخش بفەرمورێ**. (ئومێدی ئیستقلال، ژ.٢، ٢٧ی ئەیلولی ١٣٣٩).

لە نموونەی (٢٠)دا کاری "بەخشین" براوەتە رووی نادیارییەوە، بەڵام بۆ بەرز نواندنی دەسەڵات (بەریتانیا) (فەرموو)ی پێ زیاد کراوە، (گرێی کار)ی "پێ **بەخش بفەرمورێ** "دروستبووە، کە نامۆ دەنوێنێ و کاریگەریی دەسەڵات لەسەر زمانیش دەردەخات. ئەم گۆڕانانە بەپێی کردە گوتارییەکانی پێکهاتنی دەوڵەتە نوێیەکان و کارلێکردنی گوتاریی ئەوانە و دەستنیشانکردنی سنووری نێوانیان و گفتوگۆ و پێکهاتنی دوولایەنەیان دێتە ئاراوە.

**نواندن وەك دەوروبەرسازییەکی دووبارە ( recontextualization )ی ڕووداو**

لە راستیدا دەسەڵاتی هەڵبژاردن و نواندنی ڕووداو لە فۆرمی جۆراوجۆری زمانیدا، خۆی دەوروبەرسازییەکی دووبارەی ڕووداوەکانە لە گوتاری ڕۆژنامەنووسیدا بۆ نواندنی بەو شێوەیەی ئایدۆلۆژی و سیاسەتی ڕۆژنامەکە مەیلی لێیە. ئەمە بەم واتایەیە کە "هەواڵ، گوتارێکە لەبارەی کردەیەکی کۆمەڵایەتییەوە کە هەمیشە لە دەرەوەی دەوروبەری ئەو کردەیە و لەناو دەوروبەری کردەیەکی تردا ڕوودەدا. ئەم پرۆسەیەی کردەیەکی کۆمەڵایەتی لەناو کردەیەکی تردا دەگرێتەبەر، دەوروبەرسازییەکی دووبارەیە (van Leeuwen, 1993a, 276). فێرکلاف (٢٠٠٣: ١٣٩ –١٤٠) دەڵێ: "لە نواندنی ڕووداوێکی کۆمەڵایەتیدا، کاتێ کەسێك ئەو ڕووداوە لە ناو دەوروبەری ڕووداوێکی تردا جێ دەخات، دەوروبەرسازیی دووبارەی دەکات {...}چەند بنەمایەك هەن کە دەبنە بناغەی جیاوازییەکان لە نێوان ئەو شێوانەدا کە تێیاندا جۆرێکی تایبەتی لە ڕووداوی کۆمەڵایەتی لە ژینگەی جیاواز، تۆڕەکانی کردەی کۆمەڵایەتی، و ژانرەکاندا دەنوێنرێ. ڕەگەزەکانی ڕووداوێکی کۆمەڵایەتی بە پێی ئەم بنەمایانە

بەشێوەیەکی بژارکارانە "فیلتەر" دەکرێن{ هەندێك دەگیرێنەبەر، هەندێکیان هەڵداوێردرێن، و هەندێکی تریان گرنگیی زیاتریان پێدەدرێ (بەرجەستە/دەخرێنە پێشەوە) و یان کەمتر گرنگییان پێدەدرێ (دەکرێنە پاش زەمینە)}. ئەم بنەمایانە کار دەکەنە سەر ئەوەی چۆن بەشێوەیەکی بەرجەستە یان بەشێوەیەکی نابەرجەستە (زەینی) رووداوە کۆمەڵایەتییەکان دەنوێندرێن. هەروەها چۆن دەنرخێندرێن، روون دەکرێنەوە، رەواییان پێدەدرێ، و ئەو ریزبەندییەی رووداوەکان تێیدا دەنوێندرێن". بە کورتی بریتین لە:

١ – بەشداركردن/ئامادەكردن (Presence): رەگەزەکانی رووداوە کۆمەڵایەتییەکان، یان رووداوەکان لە ناو زنجیرەی رووداوەکاندا، دەهێنرێن/ناهێنرێن، گرنگییان پێدەدرێ و بەرجەستە دەکرێن/بە پاشزەمینە دەکرێن (back grounded).

٢ – دابڕین/گشتاندن (Abstraction): پلەیەك لە دابڕین یان گشتاندن (generalization) لە نواندنی رووداوە واقعیی و کۆنکرێتەکان هەیە.

٣– ریزبەندی (Arrangement): رووداوە کان چۆن ریزبەندی دەکرێن؟

٤– زیادکردنەکان (Additions): چی لە نواندنەوەی رووداوەکاندا زیاد دەکرێ وەك، روونکردنەوە/ رەواییپێدان (بەڵگەکان، هۆیەکان، مەبەست/ئامانجەکان) و نرخاندنەکان؟ (ibid)

**(٢١ بۆمبا و زایعات**

**نەزەر** بە ئیستخباراتی مەخسوسە لە کەرکووکەوە **چەند تەیارەیەك چووەتە سەر** مەرکە و قەڵادزە و ئەتراڤی رانیە. لە **تەئسیری بۆمبا** لە نفوس و حەیواناتدا زیاعاتێکی **موتەئسف بووە**. ئەهالی ئەو ناوە بە رۆژ ئیلتیجا بە شاخ و کێو و ئەشکەوتان و بە شەو بەعزێکیان بۆ ماڵەکانیان عەودەت دەکەن.

رەوایەت لە ئەو کەسانە کە لە ئەو ئەترافەوە هاتوون دەڵێن لە تەیارەکانەوە لە پێش بۆمبا هاویشتنا بەیاننامەیەکی زۆریان هاویشتووە و بە ئەهالییان تێگەیاندوە کە ئەی ئەهالی بچن تەبەعییەت و ئیتاعەت بە سلێمانی یەعنی حکومەت عەلیەی کوردستان بکەن واز لە ***ئیختلال و عیسیان*** بهێنن ***هەتا*** ئێوەیش

لە تەئسیرات بۆمبا و تەیارە ئەمین بن...(بانگی کوردستان ژ١٢- ٢٧ تشرین ئەوەل ١٩٢٢).

لەم دەقەدا لە رووی زمانییەوە، نووسەر ویستوویەتی لە کاری کەم مەترسیی "چوونە سەر" لە جیاتی گرووپێك کاری بریتی وەك "هێرشکردن"، "دەستدرێژی کردن" و "هجومکردن" سوود وەرگرێ کە واتای هاوپێچی زۆر جیاواز بەدی دێنن. ئەم کردە تێپەڕە بریتییانە ماهییەتی توندوتیژیی کردە راگەیەنراوەکە دەپارێزن کەچی کاری ("هاتنەسەر"، لە دەقی ژمارە ٧٦دا کە لە سەرەوە ئاماژەی پێکرا) و "چوونەسەر" لەم دەقەدا بەم جۆرە نییە. بەتایبەتی لە ژێر پەردەی ئەم کارەدا، کردەیەکی مادی لە کاری تێپەڕی "بۆمباران کردن"دا لە کردەیەکی مادی تێنەپەڕ بە "چووەتە سەر"دا شاراوەتەوە. بەم بژارە لە تێپەڕەوە بۆ تێنەپەڕ کارا و بەرپرسی بۆمبارانکردنەکان نائامادەن (absent) و ئامرازەکان شوێنیان پڕکردوونەتەوە. ئەو جۆرەی کە (van Leeuwen, 1993a, 276) ئاماژەی پێدەکات، توخمێکی تری دەوروبەرسازی جێنشین کردنە وەك لەم دەقەدا دەبینین تەیارە جێنشینی (Substitution)ی مرۆڤ و بەرپرسی سەرەکی (حکومەتی ئینگلیز) *کراوە*. لە رستەی دووەمی ئەم دەقەدا دەبینین کە کردەی "کوشتن و لەناوبردنی نفوس و حەیوان" لە کاری پێوەندیداری "بوون"دا نوێندراوە، هەر بەم بژارەش کردەی "کردن" گۆڕاوە بۆ کردەی "بوون/روودان"، بۆ ئەوەی کاریگەریی (تەئسیر)ەکە لە سەر کارتێکراوەکان بدرێتە پاڵ "بۆمبا" (ئامرازەکان/چەند تەیارە) کە ئەم جێنشین سازی و گۆڕینەی کردە لە کردنەوە بۆ روودان خۆی گشتاندن/دابڕینە لە کردەیەکی کۆنکرێتەوە بۆ کردەیەکی ئەبستراکت و دابڕاو لە دەوروبەرە واقعییەکەی. ئەم رۆژنامەیە لە بەرپرسکردنی بێگیانەکان لە کردەکە دەیەوێ ئاراستەی روانینی خوێنەر لەسەر بەرپرسە گیاندارەکان (مرۆڤەکان/ و لە راستیدا دەوڵەتەکان) لابدات، و بەم جۆرە بەرپرسیارەکەی بشارێتەوە/ بیخاتە پاشزەمینەوە، هەرچەند لە فۆرمی کاری بکەر نادیاردا نەینواندووە. ئەم جۆرە نواندنە خۆلادان یان تەفرەدانێکی رۆژنامەکەیە لە "تەن"ێك یان سەرچاوەیەك کە بەرپرسیارێتییەکەی بۆ دەگەڕێتەوە، ئەویش حکومەتی ئینگلیزە. لەم دەقەدا بەم نواندنەوەیە و بە جێگیرکردنی ئامرازی بێ

گیان لە شوێنی کارا/ بەرپرسی گیاندار دەقێکی تۆکمەی بنیات ناوە. دەقەکە وەك گشتێك دیاردەیەك دەنوێنێ (دەیگرێتەبەر) و پێش بە نواندنی دیاردەیەکی دیکە دەگرێ (هەڵداوێرێ)؛ واتە واتای دەقی (textual meaning) لە ڕێگای پێوەندییەکانی ئامادەبوون (presence) و ئامادە نەبوون (absence)ەوە دەگەیەنێ لەجیاتی ئەوەی لەسەر بناغەی ڕستە بە ڕستە بیگەیەنێ. ئەمە لە هەمان کاتدا وەك فێرکلاف (٢٠٠٣: ١٣٩) ئاماژەی پێکردووە لە شیکردنەوەی گوتاردا بە دەوروبەرسازییەکی دووبارەی ڕووداوەکان ناودەبرێ.

وەك لەم دەقە هەواڵییانەی تا ئێستا ئاماژەیان پێکرا و لەم دەقەی خوارەوەدا دەیخەینە بەرچاو، دەوروبەرسازیی دووبارە دەکرێ شی بکرێتەوە بۆ ئەوەی بزانرێ کە ڕووداوەکان لە گوتاردا چۆن ڕیزبەندی دەکرێن و ڕێکدەخرێن (Arrangement)، لەم ڕووداوەدا دەبینین کە ڕووداوەکە بەپێی چۆنێتیی ڕوودانەکەی لە ڕووی ڕێکەوتەکەیەوە ڕیزبەندی کراوە، کاراکان بە پێی دەسەڵاتیان بەشی پێشەوەیان پێ براوە و پێدەچێ ڕۆژنامەکە هەرچەند لە ڕێی کەرەستە پێوەندیدارەکانی بە کاراکانیشەوە بووبێ، ئەوان لە بەرایی دابنێ و خوێنەرانیشی بە شێوەی شاراوە لە توانا و هێزی حکومەت بترسێنێ، بۆیە لە پاراگرافی دووەمدا لەڕێگەی "زیادکردن" (Additions)ەوە دەکەوێتە ڕوونکردنەوە و پاساودان/ڕەوایی پێدان بە کردەکە. واتە، ڕۆژنامەکە دەکەوێتە بەڵگە هێنانەوە و هۆکار دەربڕین بۆ ئەوەی تاوانەکە لە ئەستۆی بەرپرسی کردەکە کە ئینگلیزەکانن لابدات. بەوەی کە دەڵێ: "***لە پێش بۆمبا هاویشتنا*** بەیاننامەیەکی زۆریان هاویشتووە و ***بە ئەهالییان تێگەیاندوە کە ئەی ئەهالی بچن تەبەعییەت و ئیتاعەت بە سلێمانی یەعنی حکومەت عەلیەی کوردستان*** بکەن" بۆ ئەو مەبەستەی کە "واز ***لە ئیختلال و عیسیان*** بهێنن " و لە کۆتاییدا کە وشەی "هەتا" بەکاردێنێ، لە پارستەی "***هەتا*** ئێوەیش لە تەئسیرات بۆمبا و تەیارە ئەمین بن". دەیەوێ بەشێوەیەکی هاوپێچ دووبارەبوونەوەی تاوانی لەم جۆرە بە تەرکی "شۆڕش" (کە ئەم بە "ئیختیلال و عیسیان"ناوی دەبات) ببەستێتەوە و ئەو واتایە بگەیەنێ کە هەتا شۆرش هەبێ ئەگەری بۆمبارانی لەم جۆرەش دەبێ.

بەم شێوەیە ڕەوایی بدات بەو تاوانە و ئەو کوشتارەش کە کردوویەتی لە وشەیەکی وەك (تەئسیر/کاریگەر یدا) بگشتێنێ و نابەرجەستەی بکات.

نواندنی ڕووداوەکان  لەم (بەڵگە هێنانەوە و هۆکار و ئامانج)انەدا و لەلایەکی تریشەوە نرخاندن (evaluation)ی شۆڕشی کوردی لەم ناوچەیەش وەك هەموو شوێنەکانی تر بە(***ئیختلال و عیسیان***) ڕەواییدانەکەی زیاتر دەردەخات.

**بکەر نادیارکردن ( passivization ) و ناواندن ( nominalization ):**

نەریتی هەواڵنووسین وایە کە ڕووکاری دیار (active voice) هەمیشە بەسەر ڕووکاری **نادیار** (passive voice)دایە:

(١) *پۆلیس دەستڕێژی لە خۆپیشاندەرەکان کرد (دیار). (٢) خۆپیشاندەرەکان (لەلایەن پۆلیسەوە) دەستڕێژیان لێ کرا (نادیار). لەم بارەدا* هۆیەکی سادە ئەمەیە کە خوێندنەوەی ڕووکاری نادیار لە دیار ئەستەمترە و لەهەمان کاتدا بە فێربوونی وشەیە (Sheridan Burns, 2002: 128). دیارە ئەم بۆچوونە زیاتر لەو بارانەدا ڕاستە کە لە ڕووکارە نادیارەکەشدا ئاماژە بە هاوبەشەکان (کارا و کارتێکراو) کرابێ، بەلاّم ئەگەر کارا لادرابێ دیسانیش بەراییدانەکە دەبێ بۆ ڕووکاری دیار بێت – لەبارە ئاساییەکەیدا– چونکە هەموو هاوبەشەکان تێیدا ئامادەن و زانیاریی زیاتری تێدایە و لە زمانی ڕۆژنامەنووسیدا بوونی زانیاریی بنەمایە. بەلاّم بەکارهێنانی ڕووکاری نادیار هەندێ جار لە ڕووی ناچارییەوەیە وەك ئەم نموونەیە: "ئەگەر ***دزی لە یەکێك کرا*** ئەو کەسە دەبێ زوو خەبەر بە نزیکترین مەحەلی حکومەتی بگەیەنێت (پێشکەوتن، ژ. ٦٥، ٢١ی جولای ١٩٢١)" کە لێرەدا کردەکە پێشبینی دەکرێ و کاراکەشی نادیارە کێ دەبێت. بەگشتی، "ڕووکاری نادیار زۆرجار بۆ نواندنی کارای کردەیەك وەك کەسێکی نەناسراو ("***من دزیم لێکرا***.")، کەسێکی ناسراو ("***تۆمەتبارەکە گیرا***")، ناگرنگ ("***چەندین تاقیکردنەوە بەڕێوەبران***") بەکاردێت، بکەر نادیار هەروەها دەکرێ بۆ شاردنەوەی کارایەکی دیاریش بەکاربێت، یان بۆ بچووك دانانی واقعییەتێکی کارایەك تێوەی گلاوە. بژار لەنێوان دیار و نادیاردا یەکێکە لەو کۆمەڵە بژارانەی قسەکەران بەناچار لەنواندنەوەی کردە و ڕووداوەکاندا لە  پێوەندیی لەگەڵ

چـۆنێتی ڕێکخسـتنی ڕۆڵـە واتاییـەکان بەسـەر ڕۆنانـە ڕێزمانییەکانـدا دەیکـەن. "(johnstone, 2008: 55). سیمایەکی دیکـەی تێپەڕانـدن "**ناوانـدن**"ە. "ناوانـدن گـۆڕینی کردەکانـە بـە ناوەکـان کـە کاریگـەری هەیـە لەسـەر پـاش زەمینـەکردنی کردەکە خۆی – کاتەکەی و ڕێژەکەی نیشان نادرێ – و ئاسایی بەشـداربووەکانی دیاری ناکرێ، لەبەرئەوەی کە کێ، چی و بەرامبەر بە کێ، دەکات بەهاوپێچ تـەرك دەکـرێ. "(Fairclough, 1992 : 179) کـە زمانـەوانانی ڕەخنـەیی دیاردەکـانی ناواندن و بکەرنادیارکردن وەك چـەند سـیمایەکی ئایـدۆلۆژیکی بـەکارهێنانی زمـان دەستنیشان دەکەن؛ کە بریتین لە: (ا) لادانی کارایەتی/بەرپرسیارێتی ( Deleting agency)؛ (ب) بە شتکردن (Reifying)؛ (پ) دانانی چەمکی بە شتکراو وەك کارا (positing reified concepts as agents)؛ (ت) پاراسـتنی پێوەندییـەکانی دەسەڵاتی نایەکسان (Maintaining unequal power relations).

١. **لادانـی کارایەتی/بەرپرسـیارێتی**: بـۆ نموونـە بڕوانـە ئـەم سـەردێڕانەی خوارەوە.

***(٢٢) پەرێشانی شێخ بزێنی (بانگی کوردستان، ژ.١١، ٢ی ئاگۆستی ١٩٢٢)***

نموونـەی (٢٢)، "پەرێشـانی شـێخ بزێنـی "بـەراورد بکـە لەگـەڵ " بـەهۆی بۆمبـارانی هێـزی ئاسمـانی ئینگلیـزەوە شـێخ بزێنـی پـەرت و پەرێشـان بـوون"، دەتـوانین نموونـەی دووەم بەڕاسـت یـان ناڕاسـت دابنـێین، ڕەتـی کەینـەوە یـان بیسەلمێنین بەڵام یەکەمیان ناتوانین هیچ هەڵسەنگاندنێکی لەبارەوە بکەین.

٢. **بە شتکردن و دانانی چـەمکی بـە شـتکراو وەك کـارا** *(* Positing reified concepts as agents): شتە سەربەخۆکان دەبنە جێگرەوەی کارای کردەکان. بـۆ نموونە بڕوانە ئەو بەشە لە دەقی (٢١) کە دەڵێ:

"**چەند تەیارەیەك چووەتە سەر** مەرکە و قەڵادزە و ئەترافی ڕانیە. لە **تەئسیر بۆمبا** لە نفوس و حەیواناتـدا زیاعـاتێکی **موتەئسـف بـووە**. "لێـرەدا "تـەیارە" و بۆمبا"وەك بەرپرس دەرکەوتوون.

٣. **پاراستنی پێوەندییەکانی دەسەڵاتی نایەکسـان**: ناوانـدن و نادیـارکردن لەو ڕێگایانەن کە تێیاندا نواندنـەوەی ڕووداوەکـان، کردەکـان و کاراکـان لـەپێناو بەرژەوەندییەکانی دەسەڵاتی زاڵدا بەکار دێن.

**(٢٣) پەرێشانی شێخ بزێنی**

**لە نوسخەی پێشوودا بۆمباردمانی دێهاتی شێخ بزێنیمان نووسی بوو. لەپاش ئەمە کە پێنج دێ بەتەواوی بۆردمان کرابوو ٣٠٠ سوار لـە کەرکووکـەوە هـاتبوون ئەو دێهاتەنەیان سوتاند و لە پاش ئەمە بەنابـە ئیفـادەی تـەوفیق ئاغـای رەیـس عەشیرەتی شێخ بزێنی کە ئێستا تەشریفی لـە سـلێمانیدایە دراوسـێکانی خۆیـان یـەعنی عەشـیرەتی شـوان چـوونە سـەریان  بـۆ تـاڵانی ٤٥٠ مـەڕ و  قـەدرێکیش رەشەوڵاغیان بردووە. بزانن لەم واقعەیەشدا و لە ئەم حاڵ و پەرێشانییەشدا کورد بەکورد مەرحەمەتی نەکردوە، خودا هەموومان ئیسـلاح بکـا (بـانگی کوردسـتان، ژ.١١، ٢ی ئاگۆستی ١٩٢٢).**

وەك لەسەرەوە ئاماژەمان پێکرد، سەردێڕەکە بەناو کراوە. هەر ئەمـەش وای کردووە بەرپرسی پەرێشـانکردنەکە بشـاردرێتەوە، لەپاشـان دەنووسـێ: "لـەپاش ئەمە کە  پێنج دێ بەتەواوی بۆردمان کرابوو". کردەکە لە فۆرمێکی بکەر نادیـاردا نوێنــدراوە. ئەمــەش راســتەوخۆ لــە بەرژەوەنــدیی دەســەڵاتی نایەکســاندایە و دەسـەڵات و ئایـدۆلۆژی کـاری کردووەتەسـەر رووی دەرکـەوتنی فـۆرم و رۆنـانی، رسـتیلە و گـوزارە پێکهێنـەکانی دەقەکـە. ئـەم رۆنانانـە بۆتـە هـۆی شـاردنەوەی بەرپرسیاری سەرەکیی پەرێشانییەکە و لەوەش خراپتر هیچ ئاماژەیەك بەخەسارە گیانی و ماڵییەکانی ئەم بۆمبارانە نەکراوە. **بـەڵام لـە رێـی بـە شـایەت وەرگرتنـی "تەوفیق ئاغای رەیس عەشیرەتی شێخ بزێنی"یەوە،**  کردەی عەشیرەتی شـوانی لـە رسـتەیەکی دیـاردا نوانـدووە (**دراوسـێکانی خۆیـان یـەعنی عەشـیرەتی شـوان چوونە سەریان  بۆ تاڵانی ٤٥٠ مەڕ و  قـەدرێکیش رەشـەوڵاغیان بـردووە.**) و بـە وردی کردەکــەیانی خســتووەتە روو. هەرلــەم رێیەشــەوە ویســتوویەتی کــردەی کوشتار و وێرانکردنی ماڵی خـەڵك و پەرێشـانکردنیان کـە ئینگلیزەکـان کردوویانـە داپۆشێ و هەموو تاوانەکە لەکردەی تاڵانی عەشیرەتێکی دیکەدا چڕبکاتەوە.

ناواندن جۆرێك میتافۆری رێزمانییە کە کردەکان بـەهۆی گـۆڕینی رسـتیلەکان (clauses، لەوانە کارەکان) بۆ جۆری ناوەکان وەك بوونێکی سـەربەخۆ دەنوێنـێ. ناواندن زۆرجـار دەبێتـە هـۆی هـەڵاواردنی کـارا کۆمەڵایەتییـەکان لـە نواندنـەوەی رووداوەکانـدا "لـە ناواندنـدا شـتێکی کـە ئاسـایی کردەیەکـە لـە رووی فۆرمـەوە

دەگۆڕێ بۆ گرێیەکی ناوی و کورت دەکرێتەوە و لەم رووەوە، گشت پرۆسەکە وەك "شتێك"ی چەسپاو دەخرێتە روو کە لەم فۆرمەدا دەکرێ وەك بەشداربوویەك لە کردەیەکی دیکەدا بەشێوەیەکی راستەوخۆتر رابگەیەنرێ و شیاوی تاوتوێکردن بێت، رەفتار بکات. ناواندن کردەکە ناگێڕانەوەیی دەکات و دەیکاتە پاش زەمینەیەك بۆ کالاّ یان شتێکی دیکە.

**(٢٤) زیاعێکی گەورە**

**لە ئەزکیا و منەوەرانی کورد عیرفان زادە ، جەمال بەگ، شەوی چوارشەمەی رابوردوو ١٢ – ١٣ی کانونی ئەوەڵی ٣٣٨{١} لە تەرەف ئەشخاسی مەجهولەوە دەستڕێژی لێکرا ، دوو گوللە ئیسابەتی کرد، پاش سێ سەعات وەفاتی کرد.**

**حەقیقەتەن زیاعی ئەم زاتە بۆ کوردستان مەوجبی تەئەسور بوو. بەناوی ئەشراف و عمومی ئەهالی مەملەکەتەوە لە عائیلەی موحتەرەمەیان بەیانی تەعزییەت و تەمەنی تەسلیەت ئەکەین. رۆژی کوردستان (رۆژی کوردستان، ژ. ٥، ٢٠ی کانونی یەکەمی ١٩٢٢).**

سەرەتا کردەی "کوشتن" لە سەردێڕەکەدا بەناوکراوە و لە "گرێیەکی وەسفی" (زیاعێکی گەورە)دا نوێندراوە. واتە رۆژنامەکە بەم بژارەی لەدەستچوونی جەمال عیرفان (کارتێکراوەکە) خۆی بە خەسارێکی گەورە وەسف دەکات، زانیاری لەبارەی رووداوەکەوە نادات. پاشان فۆرمی بکەر نادیاری بۆ نواندنی کردەکە بژار دەکات (دەستڕێژی لێکرا). "سەرنج دەری دەخات کە لە ئاخاوتنی کوردیدا هەمان بێ هێزی کە لە رووداندا هەیە لەکاری بینا مەجهولیشدا خۆ دەنوێنێ، و بۆتە هۆی ئەوەی کە سیغەی بینا مەجهول لە کوردیدا لە چاوگی ئەلفییەوە وەرگیرێت" (مەسعود محەمەد، ١٩٧٦: ١٠٢). ئەم هەواڵە باری کردەکە تەنیا لەکاتدا دەخاتە روو؛ لەکاتی پێکرانی و پاش ٣ سەعات، بەلاّم شوێنەکەی دیار نییە. کاراکان (ئەشخاسی مەجهول)ن. ئامرازی کوشتنەکە بەوردی وەسف کراوە، (*دەستڕێژی لێکرا*)، دوو گوللە ئیسابەتی کرد، (دوو گوللەی پێکەوتووە) لێرە کارەکە بەدیار دەربڕاوە، ئامرازەکە "گوللە" بکەری رستەکەیە. کارەکە لێکدراوە (ئیسابەتی کرد) تا دەگات بەوەی کوشتنەکە لە کاری لێکدراوی (وەفات کردن)دا بنوێنێ کە تێنەپەڕە[٥] (هاوتای مردن گیان سپاردن و کۆچی دوایی

کـردن)ە، نـەك کـوژران. پێدەچـێ هۆیـەك لـەم چەشـنە نواندنـەدا هـەبێ، وەك پارێزکردن و ترس، چونکە ڕۆژنامەکە زیاتر وەسـفی کـات و ئامرازەکـە و چۆنێتی کوژرانەکـەی دەکـات و نـەك هـۆی کوژرانەکـەی، لەلایـەکی تریشـەوە هاوخـەمیی حوکمـدارانی کوردسـتان یـان هەڵوێسـتیان بەرامبـەر ئـەم تاوانـە دیارنییـە. ئەمـە دیاردەیـەکی تیرۆریسـتییە کـە لـە سـەردەمی حـوکمی شـێخ مـەحموود بەرامبـەر ڕوونـاکبیران کـراوە، ئـەم ڕاپۆرتـە هەواڵـە زیـاتر لـە ئاگادارییـەك دەچـێ، یـان پرسەنامەیەك کە لەلایەن ڕۆژنامەکەوە ئامادە کرابێ، ڕۆژنامەکە ڕووداوەکە بـەپێی ڕێکـەوتی ڕوودانەکـەی و بـە شـێوەیەکی مێـژوویی (chronology) دەگێڕێتـەوە. بکەرنادیارکردن هۆکار و بەرپرسیارێتی دەشارێتەوە و بەشـداربووە کارتێکراوەکـە شوێنی بکەر پڕدەکاتەوە و دەکرێ بکەری مـەنتیقی بـەئارەزوو لابـدرێ. لـە ڕووی زانیـاریی گەیاندنـەوە ئـەم ڕیزکردنـە هـۆ یـان کـارای کـردەی دەسـتڕێژکردنەکە دەرنابڕێ، بەڵام ئەو بەشداربووەی کاری تێ کراوە بۆتە سەرەی ڕستەکە.

## ئەنجام

لە ڕۆژنامەکانی بابەتی ئەم لێکۆڵینەوەیەدا ئێمە وا تێبینی دەکەین:

١- ڕۆژنامەکان بەگشتی لە خزمەتی ناساندن ، چەسپاندن ، ڕەواییدان بە شوناس و دەسەلاتی کۆمەلایەتیی ئاستەکانی سەرەوەی کۆمەڵ ، وەك دەرەبەگەکان ، شێخەکان و ئەفەندییەکانن (خوێندەوارە ملکدارەکان) و بەرژەوەندیی ئەمانە دەپارێزن.

٢- ڕۆژنامەکانی وا ئینگلیزییەکان پشتگیریی ماکی و میناکییان لێ دەکەن تارادەیەکی زۆر بۆ خزمەت بە بەرژەوەندییەکانی ئەوان، بەدوای دروستکردنی "ئاگاییەکی هەڵە و چەواشەیی"یەوەن، کە لە ڕێگای ئەو نوخبە زاڵانەی کۆمەڵی کوردەوارییەوە دەیانەوێ بەشێوەیەکی ئیقناعی، بە کۆمەلانی خەڵکی کوردستانی تێبگەیەنن. بۆیە بەرلەوەی نوێنەری بۆچوون و باوەڕی کەسێك بن، نوێنەری ئایدۆلۆژیی سیاسی داگیرکەری ئینگلیزن و گوتارێکی (هێژێمۆنیك) پەیڕەو دەکەن.

٣- ڕۆژنامەکانی سەر بە شۆڕشی شێخ مەحموود یان ئەهلی وەك "زاری کرمانجی" و نیمچە ئەهلی وەك "بانگی کوردستان"، لەگەڵ ئەوەدا کە نوێنەری باوەڕی گشتیی کۆمەلایەتین، نوێنەری گوتاری بەرەنگاربوونەوە لەگەڵ سوڵتەی خۆسەپێنی بێگانەشن. ڕۆژنامەکانی دژ یان لە دەرەوەی بەرەی داگیرکەری بەریتانین، بەشێوەیەکی دیار لە سەرەتادا نوێنەری شوناسێکی "ئاینی - نەتەوەیی"ن و لە نیوەی دووەمی دەیەی بیستدا نوێنەری شوناسی "نەتەوەیی"ن.

٤ - ڕۆژنامەنووسی سەر بە دەسەلاتی بەریتانی دەور دەبینی لە چەسپاندنی ئایدیۆلۆژیایی دەوڵەت- نەتەوە و داهێنانی شوناسێکی نوێ لەم چوارچێوەیەدا؛ زمان لە پێناو ناساندنی هاولاتی کوردستانی وەك هاولاتی عیراقیدا بەکار هاتووە، کاری کردۆتە سەر بژاری فۆڕمێکی زمانی بەسەر فۆرمە بریتییەکانی دیکەدا.

**پەراوێزەکان:**

١. ئەم لێکۆڵینەوەیە وەك بەشێك لە نامەی دکتۆرای ڕەحیم قادر سورخی وەرگیراو(مستل)ە.

٢. وشەی"کردە/کردار"(practice)، تاڕادەیەك لەم کۆنتێکستەی ئێستایدا تەمومژاوییە؛ دەکرێ هەم وەك "کردە"(action)یەکی کۆمەڵایەتی، واتە ئەو شتەی لە کات یان شوێنێکی تایبەتدا ئەنجام دەدرێ، و ئەو شتەی لەناو سوباتێکی ڕێژەییدا پتەو بووە – بە تایبەت لەو ڕووەوە کە شێوەیەکی عادەتی لە کردنە. ئەم لێڵییەی سوودمەندە چونکە ئاماژە دەکات بەو ئاستە ناونجییەی چەسپانی کردەکە لە نێوان ڕۆنانەکان (structure) و ڕووداو (event)ەکان، و ڕۆنان و بەرپرسیارێتی"agency"دا– کردارەکان تاڕادەیەك هەردوو تایبەتمەندییەکەیان هەیە (Chouliaraki & Fairclough,1999 :22). **تۆڕی کردەکان (Networks of practices) لە ڕێگای پێوەندییە کۆمەڵایەتییەکانی دەسەڵاتەوە لە شوێنێکدا ڕاگیراون، و گۆڕانی جومگەبەندییەکانی کردەکان لە سەرانسەری تۆڕەکاندا بە گۆڕانی کۆی هێزەکان (dynamics)ی دەسەڵات و ململانێکان لەسەر دەسەڵاتەوە گرێدراوە.** (Chouliaraki & Fairclough,1999 :24)

٣. جلخوار، "مۆرکێکە "دراوە لە تورکان و لاگیرانی تورکان؛ بە بۆچوونی **"ڕەفیق حیلمی** تورکخواکانی پێ ناوئەبرا، وشەیەکی گاڵتە و تانوت بوو لەلایەن کوردە نیشتمان پەروەرەکانەوە بۆیان دانرا...(ڕەفیق حیلمی ١٩٩٢: ١٧). **"مەیجەرسۆن"**، لەبارەی جلی سەربازانی تورکەوە دەڵێ: ... **پانتۆڵێکی سەیریان بۆ سەربازی تورك دروست کردبوو، کە وەك کراسێکی قۆڵکورتی سەرەو خوار ملەکەی دوورابۆوە، سەربازەکان لاقیان دەکرد بە قۆڵەکاندا بۆ ڕاکردن و سواربوون کە مەحاڵە بەکردەوە ئەم چالاکییانەی پێوە بکرێت (مەیجەرسۆن، ٢٠٠٧: ١٥٨)، کەواتە پێدەچێ وشەی تایبەتی جلخوار لەم دەوروبەریدا واتاکەی فراوان کرابێت و بۆ ئەوانەش بەکارهاتبێت وا لاگیری تورکەکانیان کردووە.**

٤. **ڕەگەز (gender) ئاماژەیە بە کەتیگۆرێکی کۆمەڵایەتی کە پێوەندیی بە ڕەوشتێکی دیاریکراوەوە هەیە. لە بەرامبەردا جنس (sex) ئاماژەیە بۆ کەتیگۆرییەکی بیۆلۆژیکی کە ئاسایی بەر لە لەدایکبوون چەسپاوە.** (Thomas . . . [et al.], 1999: 76)

٥. **کاری تێنەپەڕ لە زمانی کوردیدا وەك لە زمانەکانی تریشدا لە ڕووی هێزەوە دەبێت بە دوو جۆر: (تێنەپەڕی ئاسایی یان ئیرادی) وەك بگوترێت (ڕۆیشت، فڕی، هات..) و تێنەپەڕی (لائیرادی، ڕوودان).. لەم جۆرە کارانەدا بکەر دەورێکی تایبەتی خۆی نییە و بە بێ ویستی ئەو دێتە ئاراوە (پووشەکە سووتا، داوەکە پسا، پشیلەکە خنکا) (بڕوانە: ڕێزمانی ئاخاوتن؛ مەسعود محەمەد، ١٩٧٦: ١٠٠). کە لێرەدا وەفاتکردن (مردن لەو جۆرە کارە واتە ڕوودان/لائیرادییە).**

## سەرچاوەکان

**أ) سەرچاوەی زمانی کوردی**


١. ڕەفیق حیلمی (١٩٥٨)، "یادداشت": کوردستانی عێراق و شۆڕشەکانی شێخ مەحمود، ئامادەکردنی پاکیزە ڕەفیق حیلمی بەغدا: دەزگای چاپ و بڵاوکردنەوەی کوردی.

٢. ـــــــ، (١٩٩٢)، "یادداشت "(جزمی شەشەم)، ئامادەکردنی پاکیزە ڕەفیق حیلمی بەغدا: دەزگای چاپ و بڵاوکردنەوەی کوردی.

٣.ـــــــ، (٢٠٠٥)، "جۆری ڕستە لە ڕووی بوون و نەبوونی کاتەوە لە زمانی کوردیدا"، گۆڤاری (الاستاذ)، (ر.٥٢)، (صص. ٨٣٩– ٨٦٠).

٤ . شلێر ڕەسوڵ محمد، (٢٠١٠)، "شێوازی جەختکردن لە زماندا "لە گۆڤاری "ئاکادیمیا"دا، ژمارە ١٥، (لل. ١٥ – ٣٩)، هەولێر: چاپخانەی سپیرێز.

٥. کاروان عومەر قادر، (٢٠٠٨)، ڕستەی باسمەند لە زمانی کوردیدا، چاپخانەی تیشك/ ، سلێمانی.

٦.ـــــــ، (١٩٧٨)، "تێگەیشتنی ڕاستی" (شوێنی لە ڕۆژنامەنووسیی کوردیدا)، بەغدا: چاپخانەی کۆڕی زانیاریی کورد.

٧. لێژنەی زمان و زانستەکان (١٩٧٦)، ڕێزمانی ئاخاوتنی کوردی، چاپخانەی کۆڕی زانیاری کورد ــ بەغدا.


**ب. سەرچاوە فارسییەکان**


١– آقا گلزاده، فردوس (١٣٨٥)، "تحلیل انتقادی گفتمان"، تهران: انتشارات علمی و فرهنگی.

٢– پاکنهاد جبروتی، مریم/ فرادستی و فرودستی در زبان، تهران گام نو ١٣٨١.

٣– تولان مایکل (١٣٨٦)، ترجمه فاطمه علوی و فاطمه نعمتی، روایت شناسی: درآمدی زبانشناختی ـ انتقادی، تهران: ـــ سازمان مطالعات و تدوین کتب علوم انسانی دانشگاهها (سمت).

٤– چامسکی، نوام، هرمن ادوارد (١٣٧٧) "فیلتر هاي خبري"، (مترجم) تژامیر فخرایی تهران: انتشارات موسسه ایران.

٥– باطنی، محمد رضا (١٣٨٧)، مسایل زبان شناسی نوین (مجموعه مقالات)، تهران: آگه، چاپ پینجم.

٦– باغیني پور"مجید (١٣٨٠)، "سخن کاوي انتقادي: تحلیلي کوتاه بر بازتاب قدرت در زبان" در"مجله زبانشناسی"، انتشارات مرکز نشر دانشگاهی، سال شانزدهم/ شماره دوم.

### ج) سەرچاوەکان بەزمانی ئینگلیزی

1. Bilig, M. (2008). "The language of critical discourseanalysis: the case of nominalization", Discourse & Society, Vol 19(6): 783–800.
2. Chouliaraki, L., & Fairclough, N. (1999). Discourse in late modernity: Rethinking Critical Discourse Analysis. Edinburgh: Edinburgh University Press.
3. Fairclough, N. (1989) Language and Power, London: Longman.
4. _____. (1992). Discourse and social change. Cambridge, UK: Polity Press.
5. _____. (1995a). Media discourse. London: Arnold.
6. _____. (1995b). Critical discourse analysis. The critical study of language. London: Longman.
7. _____. (2003). Analysing discourse. Textual analysis for social research. London/New York: Routledge.
8. _____.  And Wodak, R. (1997) ‘Critical discourse analysis’, in van Dijk, T. (ed.), Discourse as Social Interaction. London: Sage, pp. 258–84.
9. Fowler, R. (1997), Language in the News: Discourse and Ideology in the Press, London; New York: Routledge.
10. Fowler, R., Hodge, R., Kress, G., & Trew, T. (1979). Language and control, London: Routledge &Kegan Paul.
11. Halliday, M.A.K. (1985). An Introduction to Functional Grammar, London: Edward Arnold.
12. Halliday, M.A.K. and Martin, J.R. (1993) Writing Science. London: Falmer Press.
13. Johnstone, B. (2008). Discourse analysis. Oxford, UK: Blackwell.
14. Jørgensen, M. and Phillips, L.  (2002). discourse analysis: as Theory and Method.  London: Sage.
15. Mcdonald, M. (2003). Exploring media discourse. London: Arnold.
16. M. Wel, Jennifer, (2003), "Politics is marriage and show business’ in "New Media Language"Edited by Jean Aitchison and Diana M. Lewis, London:  Routledge.
17. ______ . (2007) Analysing Newspapers: An Approach from Critical Discourse Analysis. Basingstoke: Palgrave Macmillan
18. .Reisigel, M & Wodak. R. (2001) Discourse and Discrimination: Rhetoric of Racism and anti- Semitism, London: Routledge.
19. Rojers, R. (2004). An introduction to critical discourse analysis in education, New Jersey: Lawrence Erlbaum Associates, Inc.
20. Simpson, Paul (1993) Language, Ideology and Point of View, London and New York: Routledge.

21. Thomas L. . . . [et al.]. (1999). Language, society, and power / an introduction .London: Routledge.
22. Van Leeuwen, T. 1996: The representation of social actors. In C.R. Caldas-Coulthard and M. Coulthard (eds), Texts and Practices. London: Routledge, 32-70.
23. _______ , (2009). "Critical Discourse Analysis", in Renkema, J., "Discourse, of Course: An overview of research in discourse studies", (pp. 277 - 311), Amsterdam/Philadelphia: John Benjamins.
24. Widdowson, H.G. (2004). Text, context, pretext. Critical issues in discourse analysis. Oxford, UK: Blackwell.
25. ______. Positioning in journalistic discourse– a new framework for analysis. <www.grammatics.com/appraisal>.

**سەرچاوەی نموونەکان**

١– ڕۆژنامەی تێگەیشتنی ڕاستی، ڕەفیق ساڵح، ؛ سدیق ساڵح، یەکەمین ڕۆژنامەی کوردی لە عێراق ١٩١٨ ـ هەولێر: ئاراس ٢٠٠٧
٢– ڕۆژنامەی کەرکووک – ی کوردی (١٩٣٠)، ئامادەکردن و پێشەکی: ئەحمەد تاقانە، هەولێر: ئاراس، ٢٠٠٧.
٣– زاری کرمانجی، ئامادەکردن و پێشکەشکردنی : د. کوردستان موکریانی، هەولێر دەزگای موکریانی، ٢٠٠٢.
٤– سێ ڕۆژنامەی ڕۆژگاری شێخی نەمر (١٩٢٣– ١٩٢٤) ، (بانگی حەق، بانگی کوردستان، ئومیدی ئیستقلال)، ئامادەکردنی ڕەفیق ساڵح؛ لێکۆڵینەوەی کەماڵ فوئاد و سدیق ساڵح، سلێمانی: چاپی بەدرخان.
٥– ڕۆژنامەی ژیان، ١٩٢٦ – ١٩٣٢، چاپ نەکراو، کتێبخانەی ناوەندیی زانکۆی سەلاحەدین.
٦– ڕۆژنامەی پێشکەوتن (یەکەمین ڕۆژنامەی سلێمانی ١٩٢٠– ١٩٢٢)، کۆکردنەوە و ئامادەکردنی بۆ چاپ: عەلی ناجی کاکە حەمە ئەمین عەتار، سیروان بەکر سامی، پێشەکی: د.مارف خەزنەدار هەولێر: چاپخانەی وەزارەتی پەروەردە، ١٩٩٨.
٧– ژیانەوە و شوێنی لە ڕۆژنامەنووسیی کوردیدا (١٩٢٤ – ١٩٢٦)، کۆکردنەوە و ساغکردنەوەی: عەبدوللا زەنگەنە، پێشەکی و پێداچوونەوەی د. کەمال مەزهەر ئەحمەد، هەولێر: چاپخانەی وەزارەتی پەروەردە، ٢٠٠٠.
٨– ڕۆژی کوردستان، ١٩٢٢ – ١٩٢٣، جەمال خەزنەدار، بەغدا: وەزارەتی ڕاگەیاندن، کارگێڕی گشتی ڕۆشنبیری کوردی (١٩٧٣).

**ملخص البحث**

يتناول هذا البحث الموسوم ب(**التحليل النقدي للخطاب الصحفي الكوردي**) اعادة الانتاج والبناء والنشر في الخطاب الصحفي في جنوب كوردستان مع رصد السلطة التسلطية والعلاقات الاجتماعية غير العادلة الناتجة عنها.

وقد أخذ هذا البحث على عاتقه تحليل نصوص صحفية في (٩) صحف كردية مابين سنة (١٩١٨ – ١٩٣٢) هذا ويأتي البحث ضمن نظرية المنهج التحليلي النقدي للخطاب، وهو ما تم اقتراحه من قبل (فيركلاف). فهو تحليل دقيق للغة الصحف او استعمالها اللغوي في ضوء اللسانيات الوظيفية حسب منهج (هاليداى) على مستوى الخطاب الفاعل. اما فيما يتعلق بنتائج الدراسة، فقد تبيّن ان الخطاب الصحفي في تلك الحقبة قد أنتج في ظلّ اطار ايدولوجي منفعي سياسي، لمصلحة السياسة البريطانية والنخبة الكردية المحافظة. فقد قامت السلطات بأظهار الكرد بوصفه قومية بدوية ناقصة الأهلية، وذلك عن طريق تصنيف المجتمع وتوزيعه حسب الطبقات المختلفة. ومادامت هي كذلك فهي بحاجة الى نظام انتدابي.

يتضمن البحث فصلين مبدوء بالمقدمة ومختوم بنتائج البحث، مع ملخص البحث باللغة العربية واللغة الأنكليزية مع قائمة بالمصادر المستعملة في البحث.

## Abstract

This study which is entitled, "A critical analysis of Kurdish Journalistic Discourse' deals with reproducing, constructing, spreading, and preserving relations of the authority of social inequality in Kurdish journalistic discourse in the context of southern Kurdistan.

In the research, journalistic texts from (9) Kurdish newspapers in the period between 1918 and 1932 are taken as samples.

The research gives a detailed analysis of the language use of newspapers from the perspective of functional linguistics, and according to Halliday,sapproach.

The results reached show that the journalistic discourse has been used to servethe ideological framework and for the politicalinterests of its producers, that is, British administration and the Kurdish conservative elite. Through a representation of classification, the British administration wants a primitive and immature nation. It also wants to make Kurdish readers understand that they require a mature supervisor.

# کاریگەریی ئاینی ئیسلام لەسەر زمانی کوردی

د. ئومێد بەرزان برزو
زانکۆی گەرمیان ـ فاکەڵتی پەروەردە/بەشی زمانی کوردی

**پێشەکی**

کۆمەڵ سەرچاوەی لەدایکبوون و گەشەکردن و پەرەسەندنی سەرجەم دیاردەکانە، زمان و ئاینیش دوو دیاردەی کۆمەڵایەتین، کە لەناو کۆمەڵەوە سەرچاوە دەگرن و گەشە دەکەن. زمان خاڵێکی سەرەکییە بۆ بڵاوکردنەوەی بیروباوەڕی ئاینی و کۆکردنەوەی تاکەکانی کۆمەڵ، هەروەها ئاینیش کاریگەریی لەسەر زمان هەیە و بەهۆیەوە کۆمەڵێك وشە و دەربڕین دێنە نێو زمانەکەوە، بەمەبەستی گەیاندنی چەمکە فەلسەفییەکانی و جێگیرکردنی لە ناخ و بیری کۆمەڵدا. لە هەمان کاتیشدا پارێزگاریی لە مانەوەی زمان دەکات، بۆیە ناونیشانی توێژینەوەکە بۆ (کاریگەریی ئاینی ئیسلام لەسەر زمانی کوردی) تەرخان کراوە، چونکە قورئانی پیرۆز و ئاینی ئیسلام بوونەتە بەشێکی گرنگ لەژیانی کۆمەڵگای کوردەواریدا، بەمەش کاریگەریی زۆرتری لە کتێبە ئاسمانییەکانی تر هەیە و لەنێو بەرهەمی نووسەران و شاعیران و زمانەوانەکاندا ڕەنگی داوەتەوە. تەنانەت کاریگەریی لەسەر ئاستی ڕۆشنبیری و کۆمەڵایەتیی تاکی کورددا کردووە.

ئەم توێژینەوەیە دەچێتە چوارچێوەی زمانەوانی کۆمەڵایەتییەوە، کە لقێکی زانستی زمانە و تیایدا ڕێبازی شیکردنەوەی پەسنکەرانە پەیڕەو کراوە.

گرنگیی توێژینەکەش لەوەدایە، کە کۆمەڵێك ئەنجامی لەبارەی پەیوەندی و کاریگەریی نێوان زمان و ئاین، هەروەها کاریگەریی ئاینی ئیسلام لەسەر زمانی کوردی و لە بۆنە کۆمەڵایەتییەکاندا خستووەتە ڕوو.

توێژینەوەکە لە پێنج تەوەر پێکهاتووە:

تەوەری یەکەم و دووەم باس لە چەمك و پێناسەی زمان و ئاین بەگشتی و پەیوەندیی نێوانیان دەکات. تەوەری سێیەم و چوارەمیش بۆ کاریگەریی ئاینی ئیسلام لەسەر ئاستەکانی زمانی کوردی و هۆکارەکانی تەرخان کراوە. هەروەها لە تەوەری پێنجەمدا لە کاریگەریی ئاینی ئیسلام لە دەربڕینی بۆنە کۆمەلأیەتییەکاندا کۆڵراوەتەوە.

لە کۆتاییدا گرنگترین ئەنجام و لیستی سەرچاوەکان و پوختەی توێژینەوەکە بە هەردوو زمانی عەرەبی و ئینگلیزی خراونەتە ڕوو.

## تەوەری یەکەم/ چەمك و پێناسەی زمان و ئاین:

زمان گەورەترین دەستکەوتی مرۆڤە[1]. چونکە بنەمایەکی گرنگی ژیانی کۆمەڵە و هۆکارێکە بۆ لەیەکگەیشتنی مرۆڤەکان و خاڵی سەرەکیی جیاکەرەوەی مرۆڤ و گیانلەبەرانی ترە. تەنانەت مرۆڤ هەر لە منداڵییەوە بەهۆی فێربوونی زمانەوە، ناسنامەی خۆی چ وەك تاك، چ وەك بوونەوەرێکی کۆمەلأیەتی دەدۆزێتەوە. بۆیە زمانەکانی جیهان پەیوەندییان بەکۆمەڵگا مرۆڤایەتییەکان و نیشتەجێبوونیان لەسەر ڕووی زەوی بەپێی هەمەچەشنیی جوگرافی و ناوچەییەوە هەیە و جیاوازی هەموو زمانێك لەزمانێکی تر بەهۆی جیاوازیی ڕەگەزو پەیوەستبوونی قسەپێکەرانییەوەیەتی[2]. ئەگەر بمانەوێت لە چەمك و پێناسەی زمان بدوێین[3]، ئەوا کارێکی ئاسان نییە، چونکە زمان دیاردەیەکی ئاڵۆزەو لە زۆر بواری زانستیی جۆربەجۆرەوە سەیری کراوە. دەتوانرێت بەکورتی بوترێت: زمان لەدایکبووی پەیوەندییە کۆمەلأیەتییەکانە و ئامرازێکە کە مرۆڤ بۆ لەیەکگەیشتن و پەیوەندیکردن بەکاری دەهێنێت.

هەروەها ئاینیش پەیوەندیی بەکۆمەڵەوە هەیە و لەناو کۆمەڵەوە گەشە دەکات و پەرە دەسێنێت، چەندین پێناسە بۆ وشە و چەمکی ئاین کراوە، لەوانە:

١- وشەی ئاین لە قورئانی پیرۆزدا بە سێ واتا بەکارهێنراوە: ا- سزا و پاداشت. ب- گەردنکەچی. ج- بەرنامەی ژیان[4].

٢- (مجدالدين محمد بن يعقوب الفيروز آبادي) دەڵێت: ئاین واتا سزاو پاداشت، ئیسلامەتی، پەرستن، حوکمکردن، ڕێوشوێن دانان، تاکپەرستی، لێپێچینەوە،

زاڵبوون، دەسەڵاتداری، گوێڕایەڵی و ملکەچی، هەروەها ناوە بۆ هەموو ئەو شتانەی کە خوای دەسەڵاتدار و پایەبەرزیان پیٚ دەپەرستریٚ[٥].

٣- (أبي القاسم الحسين بن محمد) دەڵێت: ئاین بە ملکەچی و سزا و پاداشت دەوترێت و بۆ بەرنامەی خوا خوازراوە[٦].

٤- (لويس معلوف) دەڵێت: ئاین واتە ملکەچی و سەرپێچی، هەروەها ناوە بۆ هەموو ئەو شتانەی کە خوایان پیٚ دەپەرستریٚ[٧].

٥- (کۆزمانەوانە عەرەبەکان) دەڵێن: ئاین بریتییە لە گوێڕایەڵیکردنی کەسێك بۆ مەنهەج و پەیام و مەبدەئێك، کە ئەو کەسە بڕوای پێی هەبێت[٨].

لە کۆی ئەم پێناسانەدا، دەتوانین بڵێین کە ئاین بریتییە لە باوەڕبوون و گوێڕایەڵیکردنی زاتێك، کە دەیپەرستی.

## تەوەری دووەم/ پەیوەندیی زمان و ئاین:

مرۆڤ لە دێرزەمانەوە زمانی وەکو دیاردەیەکی زیندوو لە پرۆسەی ئاخاوتن و پەیوەندیکردندا بەکارهێناوە، لێکۆڵینەوە لە زیندوویێتی زمان دەمانگەیەنێتە ئەو ئەنجامەی، کە هەموو زانستەکان وەك بنەمایەك پشتی پیٚ دەبەستن بۆ دەربڕینی چەمکی زانستەکان لەشێوەی وشە و زاراوەدا، بۆ نموونە هەر زانستێك بگرین وەك ماتماتیك، دەروونناسی، فیزیا،.....هتد لە ڕێی ئەو وشە و زاراوانەوە تیۆری و ڕاستییەکان دەردەبڕێت.

لە هەمان کاتیشدا ئاین ڕۆڵێکی کارا لە ژیانی کۆمەڵگادا دەگێڕێت، بەوەی دەتوانێت تاکەکانی کۆمەڵگە زمان جیاوازەکان لەژێر چەتری بیروباوەڕی خۆیدا کۆبکاتەوە و وابکات، کە نەوە لەپاش نەوە شوێنکەوتووان و پەیڕەوکەرانی پەرە بەم ئاینە بدەن. بۆیە ئاین هۆکارێکی گرنگی پژان و نەشونما و گەشە و مانەوەی مرۆڤ و زمانەکەیەتی[٩].

بۆ دەربڕینی چەمکی ئاین سوودێکی گەورە لەزمان بینراوە، بەڵکو هەر بەهۆی زمانەوە دەگاتە ناو کۆمەڵ و ئاشنایی لایەنە فەلسەفییەکانی دەبین. بەهەمان شێوەش ئاینەکان چ ئەوانەی ئاسمانیین یان مرۆڤکردەن کاریگەریی زۆریان لەسەر زمان هەبووە[١٠]. بۆیە زمان سوودێکی گەورەی لە چەمك و زاراوە

فەلسەفییە ئاینییەکان بینیوە بۆ دەوڵەمەندکردن و فراوانکردنی فەرهەنگی زمـان. بۆ نموونە خوای گەورە دەفەرموێت ((وَكَذَلِكَ أَنزَلْنَاهُ قُرْآناً عَرَبِيّاً))[11]. واتـە" ئێمـە قورئانمان بەزمانی عەرەبی دابەزاند". لەم بارەیەوە (کریستۆف لۆکسنبرگ)[12] کە رۆژهەڵاتناسێکی ئەڵمانییە، لـەبارەی دابـەزینی قورئـانی پـیرۆز بـەزمانی عـەرەبی دەڵێت: "ئەو ئایەتە بەڵگەیە لەسەر ئەوەی کە قورئان بەزمانی قورەیش دابـەزیوە و تاکە سەرچاوەی کۆنە، کە بەدەستمانەوە هەبێت و تاکە بەڵگەیە لەسـەر زمـانی عەرەبی". لەم سەرچاوەیەوە ئاینی ئیسلام سوودی لە زمانی عەرەبی بینیـوە بـۆ دەربڕینی چـەمك و بیروڕاکـانی، لەهـەمان کاتـدا زمـانی عـەرەبیش چـوار سـوودی سەرەکی لە ئاین وەرگرتووە، کە ئەمانەن:

١- دەوڵەمەندکردن و فراوانکردنی فەرهەنگی زمانی عەرەبی.

٢- ئاینی ئیسلام بوو بە فاکتەرێکی گەورە و ڕۆڵی بینی لە دروستبوونی زمـانێکی ستاندەری عەرەبی.

٣- عەرەبـەکان بـەهۆی ئـاینی ئیسـلامەوە توانییـان هـەموو تـیرە و هۆزەکـانی عەرەب لـەنێو دوورگـەی عەرەبدا کۆبکەنـەوە و ڕێکیـان بخـەن، پاشـان لـەژێر ئاڵای ئاینی ئیسلامدا دەوڵەتێکی نەتەوەیی ئیسلامی دابمەزرێنن و بـەرە بـەرە سـنووری دەوڵەتەکـەیان لەسـەر حسـابی گـەلانی ناوچـەکە فـراوان بکـەن و بەشێکی ئەم سەر زەوییە بخەنە ژێر ڕکێفی خۆیانەوە.

٤- دروستبوونی زانستی ڕستەسازی و دەنگسازی و لایەنی ڕەوانبێژی، کـە پـێش قورئان لەناو عەرەبەکاندا بوونیان نەبووە[13].

هەر لەکۆنەوە تا ئەمڕۆش بەشێوەیەکی ڕوون و ئاشکرا زمانی ئاینی و زمانی نەتەوەیی کاریگەرییەکی زۆریان لەسەر یەکتری کردووە، هـەروەها کاریگەریشـیان لـە پێشـکەوتن یـان دواکـەوتنی نەتـەوەکانیش کـردووە. ئـەو کارتێکردنـە یـا بەشێوەیەکی باش، یا بەشـێوەیەکی خـراپ بـووە. یـەکێکیان زیـانی بـەوی تریـان گەیاندووە و ڕێگەی گەشەسەندنی لێ گرتووە و دوای خستووە یان بەپێچەوانەوە.

پێش ئەوەی ئاینە ئاسمانییەکان بلاْوببنەوە، واتـە پـێش ئـەوەی پەرتووکـە پـیرۆزە ئاینییـەکان بـە یـەکێ لـە زمانـە نەتەوەییـەکانی ئـەو سـەردەمانە بنووسرێنەوە، ئەو ئاینانەی کـە دروسـتکراون، زمـانی ئـاینی کاریگەرییـەکی زۆری

لەزمانە نەتەوەییەکان نەکردووە و مەترسییەکی ئەوتۆیان لەسەر نەبووە، چونکە لەو سەردەمانەدا نەتەوە جیاجیاکانی سەر ڕووی زەوی هەریەکەیان ئاینێکی تایبەتییان بۆ خۆیان هەڵبژاردووە، جا باوەڕیان بە هەر شتێ بووبێ، یان هەر جۆرە بتێکیان داتاشیبێ و پەرستبێ، تەنها بەو زمانانە ناویان لێ ناون و لێیان پاڕاونەتەوە، کە خۆیان قسەیان پێ کردووە، لەبەرئەوە زمانی نەتەوەیی و زمانی ئاینییان هەر یەك زمان بووە، زمانە ئاینییەکەیان هیچ جۆرە مەترسییەکی لەسەر زمانە نەتەوەییەکەیان دروست نەکردووە. بەلاّم بەهاتنە خوارەوەی ئاینە ئاسمانییەکان، زمانی ئاینی کاریگەرییەکی زۆری لە زمانی نەتەوەکان کردووە، لەکاتێکدا نەتەوەی خاوەن ئاین چەند ولاّتێکیان داگیرکردووە، بەمەش ئاینەکەیان بەسەر دانیشتوانی ئەو ولاّتانەدا سەپاندووە و هەمیشە هەوڵیانداوە لەڕێی زمانی ئاینەوە زمانە نەتەوەییەکەیان بەسەر ئەو نەتەوەدا بسەپێنن.

ئەگەر لە حاڵەتێکدا نەیانتوانیبێ زمانە نەتەوەییەکانیان بەتەواوەتی لەناوبەرن، ئەوا بە هەموو توانایەکیانەوە هەوڵیانداوە، کە زمانی نەتەوە بندەستەکان بەزمانێکی خراپ و دواکەوتوو بناسێنن و بەتەواوەتی کز و لاوازی بکەن و لە پەلوپۆی بخەن.

بۆ نموونە هەندێ لە نەتەوەکان زمانی ئاینی و زمانی نەتەوەییان هەر یەك زمان بووە، ئەم نەتەوانە تووشی گرفتێکی ئەوتۆی نەتەوەیی و زمانەوانی نەبوونە، بەڵکو بەپێچەوانەوە زمانە ئاینییەکە ڕاژەی زمانە نەتەوەییەکەی کردووە، وەکو عەرەبەکان هەردوو زمانەکەیان یەك بووە، بەلاّم لەگەڵ هاتنی ئاینی ئیسلام ڕاژەیەکی زۆر گەورەی زمانی عەرەبی کردووە، کە لە لەناوچوون و لاوازی پاراستیویەتی و پەرەی پێداوە، لەهەمان کاتیشدا بەتەواوی بەهەموو جیهانی عەرەب و ولاّتی موسڵمانانیدا بلاّوی کردووەتەوە.

بەلاّم هەندێ نەتەوەی دیکە هەردوو زمانەکەیان جیاواز بووە، زمانی نەتەوەییان هەبووە، بەلاّم زمانی ئاینییان لە نەتەوەیەکی ترەوە وەرگرتووە، زمانی ئەم نەتەوەیە خۆی لەبەردەم مەترسیی زمانە ئاینییەکەدا بینیوەتەوە، زمانە ئاینییەکە هەمیشە هەوڵی داوە، جێ بەزمانە نەتەوەییەکە لەق بکات و بەسەریدا زاڵ ببێت و لەناوی بەرێت، چونکە ئەم نەتەوانە ڕووبەڕووی چەڵەمەیەکی

زمانەوانیی گەورە بوونەتەوە، هەرچەندە هەوڵیانداوە، خۆیان لەزمانە ئاینییەکە بپارێزن، وەکو کارتێکردنی زمانی عەرەبی لەسەر زمانەکانی تورکی و فارسی و کوردی و ....تاد.

**تەوەری سێیەم/ کاریگەریی ئاینی ئیسلام لەسەر زمانی کوردی:**

پاش ئەوەی نەتەوەی کورد لە سەدەی حەوتەمی زاینیدا بووە بەموسوڵمان، زمانی عەرەبی کە زمانی قورئانی پیرۆزیشە کاریگەریی زۆری لەسەر زمانەکەمان هەبووە، لەوانە:

**١- دەنگسازی:**

زانستی فۆنۆلۆجی یەکێکە لە ئاستەکانی زمان، هەر زمانێك سیستەمی فۆنۆلۆجی تایبەت بەخۆی هەیە، دەستنیشانکردنی کەرەستەکانی ئەم ئاستەش پشت بە فۆنیم دەبەستێت، چونکە فۆنیم بچووکترین دانەی زمانە و بەگۆڕینی هەمان فۆنیم لەجووتە وشەکاندا دەبێتە هۆی گۆڕینی واتای وشەکان. هەر زمانێکیش بەپێی بەراوردکردنی وشەکانی دەستەیەك فۆنیم هەڵدەبژێرێت و دەبنە کەرەستەی فۆنۆلۆجیی زمانەکە.

ئاماژە بەوە درا، کە قورئانی پیرۆز بەزمانی عەرەبی بۆ نەتەوەی عەرەب دابەزی و یەکێك لە سوودەکانی، دروستبوونی زانستی دەنگسازیی زمانی عەرەبییە، بۆیە سیستەمی فۆنۆلۆجیی زمانی عەرەبی لە قورئانەوە سەرچاوەی گرتووە.

فۆنیمەکان لە فۆنۆلۆجیی زمانی کوردی و عەرەبیدا بەم شێوەیە دەستنیشان کراون(١٤):

| | فۆنیمە نەبزوێنەکان | فۆنیمە بزوێنەکان | نیمچە بزوێن |
|---|---|---|---|
| زمانی عەرەبی | /ء ، ب ، ت ، ث ، ج ، ح ، خ ، د ، ذ ، ر ، ز ، س ، ش ، ص، ض ، ط ، ظ ، ع ، غ ، ف ، ق، ك ، ل ، م ، ن ، هـ ، و ، ي/ | /و ، ا ، ي ، الضـــمة، الفتحـــة ، الكسرة/ | /و ، ی/ |
| زمانی کوردی | /ئـ ، ب ، پ ، ت ، ج ، چ ، ح ، خ ، د ، ر ، ڕ ، ز ، ژ ، س ، ش ، ع ، غ ، ف ، ڤ ، ق ، ك ، گ ، ل ، ڵ ، م ، ن ، ھ ، و ، ی/ | /و ، وو ، ۆ ، ی ، ێ ، ا ، ە ، i/ | /و ، ی/ |

بە بەراوردکردنی فۆنیمەکانی هەردوو زمانەکە خـاڵی هاوبـەش و جیـاوازی بەرچـاو دەکەون، کە ئەمانەن:

١- فۆنیمـە نەبزوێنــەکان: هــەردوو زمانەکــە لــە بیســت فــۆنیمی نەبزوێنــدا هاوبەشن، وەك /ئـ ، ب ، ت ، ج ، ح ، خ ، د ، ر ، ز ، س ، ش ، ع ، غ ، ف ، ق ، ك ، ل ، م ، ن ، ھ/، بـــەڵام فۆنیمـــەکانی /ث ، ذ ، ص ، ض ، ط ، ظ/ تایبەتن بەزمانی عەرەبی و فۆنیمـەکانی /پ ، چ ، ڕ ، ژ ، ڤ ، گ ، ڵ/ تایبـەتن بەزمانی کوردی.

٢- فۆنیمە بزوێنـەکان: لـەزمانی عەرەبیـدا فۆنیمـەکانی /و ، ا ، ي/ درێـژن و /الضمة ، الفتحة ، الكسرة/ کورتن، بەڵام لەزمانی کوردیدا فۆنیمەکانی /ا ، وو ، ۆ ، ێ/ درێژن و /ی ، و ، ە ، i/ کـورتن، دەبیـنین فۆنیمـەکانی /ا ، ی ، و/ لـە هەردوو زمانەکـەدا هاوبەشـن، بـەڵام فۆنیمـەکانی /الضـمة ، الفتحـة ، الكسـرة/ تایبەتن بەزمانی عەرەبی و فۆنیمـەکانی /و ، ۆ ، ێ ، ە ، i/ تایبـەتن بـەزمانی کوردی.

٣- فۆنیمـە نیمچـە بزوێنـەکان: لـە هــەردوو زمانەکـەدا فۆنیمـەکانی /و ، ی/ هاوبەشن.

**کاریگەرییەکان:**

١- فۆنیمەکانی /ث ، ذ ، ص ، ض ، ط ، ظ/ لەزمانی کوردیدا نین، کەچی ژمارەیەکی زۆر لەو وشانەی کە ئەم فۆنیمانەی تێدایە، لەزمانی عەرەبییەوە هاتوونەتە نێو فەرهەنگی زمانی کوردییەوە، ئەمەش دەگەڕێتەوە بۆ پەیدابوونی ئیسلام و دراوسێتی و تێکەلاویی کورد لەگەڵ عەرەبدا، لەگەڵ ئەوەشدا بەچەندین ڕێگا دەستکاری ئەو وشانە کراوە، بەتایبەتی لە ڕووی گۆکردن (تلفظ)ەوە، بەتایبەتی وشە و زاراوە ئاینییەکان کە کورد وەری گرتوون، خستوونیەتە ژێر باری یاسای دەنگسازیی زمانی کوردی و خۆماڵی کردوون، بۆ نموونە ئەگەر لە وشەیەکدا دەنگێك هەبووبێ، کە لەگەڵ یاسای فۆنەتیکی کوردیدا ڕێك نەکەوتبێ، ئەوا گۆڕانکاری بەسەردا هێنراوە، وەکو دەنگەکانی /ث ، ص/ ، /ض ، ظ ، ذ/ ، /ط/ کە لەزۆرێك لە وشە عەرەبییەکاندا هەن، لە کوردیدا کراون بە /س/،/ز/،/ت/ و بوونەتە ئەلەفۆنی ئەم فۆنیمانە، بۆ نموونە:

(ثروة : سەروەت)، (عصر : عەسر)، (صفة : سیفەت)، (الصَّفَا والمَروَةَ: سەفاو مەروا)، (قرض : قەرز)، (فرض : فەرز)، (الارض : عەرز/ئەرز)، (ظلم : زوڵم)، (ذِكر : زیکر)، (العذاب : عەزاب)، (الشیطان : شەیتان)، ....تاد.

بێ شك ئەم دیاردەیە بەپێچەوانەیشەوە ڕووی داوە، کە لەزمانی کوردییەوە چەندین وشە چووەتە نێو زمانی عەرەبییەوە، وەك وشەکانی (گوێز : جوز)، (گێزەر : جزر) و ....تاد.

٢- فۆنیمەکانی /الضمة ، الفتحة ، الكسرة/ کە تایبەتن بەزمانی عەرەبی و بەفۆنیمە ناڕیزبووەکان ناودەبرێن، ئەمانە لەزمانی کوردیدا نین، کەچی ژمارەیەکی زۆر وشەی ئاینی کە ئەم فۆنیمانەی تێدایە، هاتوونەتە نێو زمانی کوردییەوە، ئەمەش وای کردووە. کە بەرامبەر بەمانە هێمایان بۆ دابنرێت و لەشێوەی (پیت)دا بنووسرێن، وەك /و/ بەرامبەر /الضمة/و /ە/ بەرامبەر /الفتحة/و /ی/ بەرامبەر /الكسرة/[15]. بۆ نموونە:

سُنَة : سونەت

رَحمَة : ڕەحمەت

الفِتنَة : فیتنە ....تاد.

**ب- فەرهەنگسازی:**

١- لەژێر کاریگەریی قورئانی پیرۆزدا، چەندەها وشەی قورئانی هاتوونەتە نێو زمانی کوردییەوە و زمانی کوردییان لە بواری ئاینیدا دەوڵەمەند کردووە، لە دیدی زمانناسانەوە هەر وشەیەك لە زمانێکی بیانییەوە بێتە ناو زمانێکی تر و فۆنەتیکی ئەو زمانە وەربگرێت، ئەوا دەبێت بە بەشێك لەو زمانە[١٦]. بۆ نموونە:

(القیامـة: قیامـەت)، (فتـوی : فـەتوا)، (کتـاب : کتێـب)، (نکـاح : نیکـاح)، (شَهید: شەهید)، (رزق: رۆزی)، (السُجْدَة: سوجدە)، (العَرفَـة: عەرەفـە)، (عـرش : عەرش)، (عقیدة : عەقیدە)، (الوقت: وەخت)، ....تاد.

٢- هەر کاریگەریی ئاینی ئیسلام وای لە زانایان و نووسەرانی کورد کردووە، کە هەوڵبدەن وشەی خۆماڵیی کوردی بەرامبەر بەوشە ئاینییەکان بدۆزنەوە و فەرهەنگێك بۆ وشە ئاینییەکان بەزمانی کوردی دابنێن، بەمەبەستی زیاتر لەناوەڕۆکی ئاینەکە تێبگەن. چونکە وەرگێڕانی قورئانی پیرۆز ڕۆڵێکی گرنگی بینیوە، نەك هەر بۆ دەوڵەمەندکردنی زمانی کوردی بەوشەی ئاینی، بەڵکو بۆ زیاتر تێگەیشتن لەقورئان، بەجۆرێك وەرگێڕانی ئەم دەقە بەزمانی کوردی گۆڕانێك لە بونیادی خوێندەواریی کورد دروست دەکات، بەمەش خوێندەواری کورد نەك هەر پەیڤی کوردی لەلا زێدە دەبیّ، بەڵکو ئاسۆی بیریشی فراوانتر دەبێت، بەوەی هەر خۆی دەتوانێ تارادەیەکی زۆر لەم دەقانە تێبگات[١٧]. بۆ نموونە:

الجنة: جەنەت = بەهەشت

جهنم: جەهەنەم = دۆزەخ

الیتیم : یەتیم = بێباوك

الفقر : فەقیر = هەژار

الملائکة : مەلائیکە = فریشتە ....تاد

٣- وشە و دەستەواژە ئاینییەکان کە هاتوونەتە نێو زمانی کوردییەوە، کاریگەریی خۆیان نواندووە و لە بۆنە ئاینییەکان و کۆمەڵایەتییەکاندا بەکارهێنراون، ئەم وشە و دەستەواژانەش لە زمانی کوردیدا یان وەك خۆیان ماونەتەوە و خراونەتە ژێر باری یاسای فۆنەتیکی زمانی کوردییەوە، واتە بەپێی ڕێنووسی زمانی کوردی نووسراونەتەوە، بۆ نموونە:

(الزکـاة : زەکـات)، (الحـج : حـەج)، (العمـرة : عـەمره)، (الجنـة : جەنـەت)، (جهنم : جەهەنەم)، (الغيبة : غەيبەت)، (الجمع والقصر : جەمع و قەسر)، (الفتنة: فيتنە)، ....تاد.

یان هەندێ وشە و دەستەواژە هەن، کە وەرگێڕدراونەتە سەر زمـانی کـوردی و بۆ هەمان واتا بەکارهێنراون، بۆ نموونە:

رضي الله عنه.................. خوای لێ ڕازی بێت

صلى الله عليه وسلم.............. دروودی خوای لەسەر بێت

بسم الله الرحمن الرحيم............. بەناوی خوای گەورە و میهرەبان

٤- ئەگـەر تەماشـای فەرهـەنگی نـاوی تایبـەتی مرۆڤـی کۆمـەڵگای کـوردی بکەین، هەر لەکۆنەوە تا ئێسـتاش بەردەوامـە، کـە ژمارەیـەکی بـێ پایـان لـەناوە ئاینییەکان و بەتایبەتی ناوەکانی خـودای گـەورە و پێغەمبـەران و ئەسـحابەکان و شوێنکەوتووەکانیان لەپرۆسەی ناولێناندا بـەکارهێناوە، ئەمـەش بـۆ بـەرزڕاگرتنی پیرۆزی ئەو ناوانـە دەگەڕێتـەوە، وەك (محمـد، احمـد، محمـود، ابـراهيم، يوسـف، ميكايل، اسماعيل، جبرايل، عبدالرحمن، عبدالله، عبـدالخالق، صـادق، عبدالسـتار، ....تاد).

٥- تەنانەت ئاینی ئیسـلام کاریگـەری لەسـەر فەرهـەنگی ئـەدەب و شـیعری شاعیرانی کوردی کردووە، چونکە لەلایەکـەوە شـاعیران و مـەلاکان و نووسـەران و ڕۆشنبیرانی پێشوو لە حوجرەی مزگەوتەکاندا خوێندوویانـە و بابەتـە ئاینییـەکانی وەکو (فیقە و عەقیدە و ئوصول....تاد)یان بەزمانی عەرەبی خوێندووە، لەلایەکی تریشەوە شیعری کلاسیکی کوردی لـەژێر کاریگـەریی شـیعری فارسـی و عەرەبیـدا بووە، کە ئاینی ئیسلام سەرچاوەی ئەوانیش بووە. بێگومـان ئەمـەش کاریگـەریی لەسەر بەکارهێنانی وشـە ئاینییـەکان لـە فەرهـەنگ و زمـانی ڕۆژانەیانـدا هـەبووە، بەتایبەتی شاعیرانی کلاسیك، لەوانەش (خانی و جەزیری و نالی و سالم و کوردی و مەحوی و حەمدی و ....تـاد)، لێـرەدا تـەنها ئاماژەیـەکی کـورت بـۆ دوو شـاعیری وەك (نالی) و (مەحوی) دەکەین.

نـالی شـاعیرێکی قوتابخانـەی کلاسـیکییە و شـیعرێکی زۆری لـە بـواری خوداپەرسـتی و ئاینیـدا نووسـیوە، یـەکێك لەوانـە کـە بـۆ (مەککـە و مەدینـە)ی نووسیوە، ئەمەی خوارەوەیە(١٨):

**بەقییەی عومری ضایع گەر موورادت پێ تەدارەك بێ**
**حەیاتی مەککەت و مەوتی مەدینەت جەبری نوقصانە**
**چ مەککە؟ دارو بەردی قاعیدەی ئەرکانی ئیسلامە**
**چ طەیبە؟ ماء و خاکی مائیدەی ئەنواری ئیمانە**

*** *** ***

**فەضا بەحری موحیط و وشتری تێدا سەفینەی بەر**
**سەرابی میثلی نیل و دیجلە و جەیحون و عوممانە**
**لەصەد جێ کلکی ئوشتر گەییە ئەرضی مەهلەکە،هێشتا**
**یەمی فەججی عەمیقی نالی هەر بێ قەعرو پایانە**
**لەنێو ڕێگەی ڕەوانی قوم نوقوم بۆ وشترو بۆ گوم**
**نەما گوێی بیستنی (قم قم) چ جای ئیمکانی هەستانە**

هەروەها مەحوی بەیەکێك لە شاعیرە هەرە بەرزەکانی شیعری ئاینی دادەنرێت، زۆربەی وشە ئاینی و عەرەبییەکانی تێکەڵ بەشیعرەکەی کردووە، یەکێ لەو شیعرانە، ئەمەی خوارەوەیە(١٩):

**مەسئولمە ئیعانە لە وەههابی موستەعان**
**هەر لەو دەکەم سوئال و، دەکەم حەمدی ئەو بە جان**
**تەوفیقی لێ طەلەبمە بکەم خدمەتێ بە دین**
**مەئمولمە خولاصەی (أمالی) بکەم بەیان**

*** *** ***

**ئەمما لەبەعدی حەمدو صەلات، ئیکە نەوبەتی**
**مەطلەب ئیفادەکردنە بۆ جەمعی طالیبان**
**واجب لەسەر جەمیعی موسوڵمان و موئمینە**
**باوەڕ بکەن بەدڵ، چ خەواص و چ عامییان**

**ذاتی خودا کە خالیقی ئەکوانە، هەر بووە**
**یەعنی قەدیمی موطڵەقە (بالذات) و (بالزمان)**

دەبینین هەردوو شاعیر (نالی) و (مەحوی) و چەندین شاعیری وەکو ئەوانیش، بەو شێوە زمانە شیعریان نووسیوە و ژمارەیەکی زۆر وشەی ئاینیی خوازراویان هێناوەتە نێو فەرهەنگی زمانی کوردییەوە، وەکو (بەقییە،ضایع، مەوت، حەیات، مەوت، ئیسلام، نوقصان، طەیب، ئیمان، فەضا، موحیط، ئەرض، میثل، عەمیق، مەئمولمە، ئیعانە، موستەعان، حەمد، صەلات، مەطلەب، جەمع، جەمیع، موئمین، خالیق، ذات، عامییان، موطڵەق، ....تاد).

**پ- وشەسازی:**

١- ناوی تاك و كۆ: مۆرفیمی /ان/ مۆرفیمی سەرەکی کۆکردنەوەی ناوە لەزمانی کوردیدا، لەگەڵ ئەوەشدا مۆرفیمی /ات/و ئەلۆمۆرفەکانی لەکۆکردنەوەی چەند ناوێکدا بەبێ جیاوازیی ڕەگەزی دەردەکەوێت، بۆ نموونە (دێهات، میوەجات، سەوزەوات، میوەهات، ...تاد). شایانی باسە ئەم مۆرفیمە لەزمانی عەرەبیدا یەکێکە لە مۆرفیمە سەرەکییەکانی کۆکردنەوەی ناوی مێ، وەك (طَیبات، الصالحات، المؤمنات، السَیئات، المُسلمات،....تاد). بۆ نموونە خوای گەورە دەفەرموێت ((**يَأَيُّهَا الَّذِينَ إمَنُواْ كلُواْ مِن طَيِّبَاتِ مَا رَزَقنَاكُم**))[٢٠]. یان دەفەرموێت ((أَفَأَمِنَ الذِينَ مَكروُا السَيِئات))[٢١].

٣- ڕۆنانی وشەی نوێ: سەرەڕای ئەوەی وشە ئاینییەکان دێنە ناو فەرهەنگی زمانەکەمانەوە، هەروەها لەڕۆنان و داڕشتنی وشەی نوێدا سوودیان لێ وەردەگرین، بۆ نموونە:

شەیتان + ی = شەیتانی
ڕەحمان + ی = ڕەحمانی
عاشق + بەند = عاشقبەند
قەبر + ستان = قەبرستان
کتێب + خانە = کتێبخانە

بە + لەزەت = بەلەزەت

ئیمان + دار = ئیماندار

ئیمان + هێنان = ئیمان هێنان

حەج + کردن = حەجکردن

زەکات + دان = زەکاتدان

ئاخر + زەمان = ئاخر زەمان

ئاخر + شەڕ = ئاخر شەڕ

ئاخر + جار = ئاخر جار

سوجدە + بردن = سوجدە بردن

دوعا + کردن = دوعاکردن

عەمرە + کردن = عەمرەکردن .....تاد

**ت- ڕستەسازی:**

**١- ڕستەی ناوی:** زمانی عەرەبی سەر بەخێزانی زمانە سامییەکانە و لەم زمانانەشدا دوو جۆر ڕستە هەن، ئەوانیش (الجملة الاسمیة ـ ڕستەی ناوی) و (الجملة الفعلیة ـ ڕستەی کرداری)، ڕستەی ناوی لە (المبتدأ + الخبر) پێکهاتووە، لەم جۆرە ڕستەیەدا کردار نییە و بەهۆی گوزارەوە (الخبر) واتای ڕستەکە ڕوون دەکرێتەوە، واتە کاتیشی تێدانییە. بۆ نموونە خوای گەورە دەفەرموێت ((**الحَمْدُ للَّهِ رَبِّ الْعَالَمِينَ**))[٢٢]. یان بۆ نموونە لەزمانی عەرەبیدا:

الطالبٌ ذكيٌ

الطالبةٌ ذكيةٌ

ئەم یاسا سینتاکسییە بەڕوونی کاریگەری لەسەر زمانی کوردی نواندووە و لە کتێب و بەرهەمی نووسەرانماندا بەرچاو دەکەوێت. تەنانەت لەکتێبی زمان و ئەدەبی کوردیی خوێندنگاکاندا هاتووە، کە هەر ڕستەیەك کردارەکەی ناتەواو بێت، ئەوا ئەو ڕستەیە بریتییە لە (نیهاد + گوزارە)، بۆ نموونە:

خوێندکارەکە وریایە

نیهاد گوزارە

**٢- ئامرازی لێکدەری (و):**

ئەم مۆرفیمە دوو فرێز یان دوو ڕستەی سادە یان زیاتر پێکەوە گرێ دەدات، واتە ئەرکی لێکدانی دوو فرێزی ناو دروستە هاوپێوەندەکە یان دوو ڕستەی سادەی ناو ڕستە لێکدراوەکە یان زیاتر دەبینێت.

ئەم ئامرازە لە ئایەتەکانی قورئانی پیرۆز و زمانی عەرەبیدا لە فۆرمی (وَ)دا دەردەکەوێت، بۆ نموونە خودای گەورە دەفەرموێت ((**وَٱلتِّينِ وَٱلزَّيْتُونِ وَطُورِ سِينِينَ وَهَٰذَا الْبَلَدِ الأَمِينِ**))[٢٣]. فۆرمەکە لە فۆنیمی /و/ و /الفتحة/ پێکهاتووە و لە سەرەتای دووەم فرێز یان دووەم ڕستەوە دەردەکەوێت.

ئەم دیاردەیەش کاریگەریی لەسەر نووسەر و ڕووناکبیرانی کورد هەبووە، بەوەی ئامرازی (وە)یان لە نووسینەکانیاندا بەکارهێناوە و لە سەرەتای دووەم فرێز یان دووەم ڕستەوە دایانناوە. زمانی کوردی خاوەنی تایبەتمەندیی سینتاکسی خۆیەتی، وەك ئامرازی (و)، نەك (وە)ە، کە لە ئاخاوتن و نووسیندا بەکار دەهێنرێت، هەروەها لەکۆتایی فرێزی دووەم یان ڕستەی دووەمەوە دەردەکەوێت، بۆ نموونە:

ئازاد و بەهار هاتن

ئازاد یاری دەکات و بەهاریش چوو بۆ قوتابخانە

**٣- فرێزی ناوی:**

یەکێکی تر لەو کاریگەرییانە و بەتایبەتی لەکاتی وەرگێڕانی دەقە ئاینی و عەرەبییەکاندا بەرچاو دەکەوێت، ئەویش سەرەوژێربوونی کەرەستەکانی دروستەی فرێزی ناوی فراوانکراوە، بۆ نموونە:

الحرب العالمية الاولى : جەنگی جیهانیی یەکەم

مطار اربيل الدولي : فڕۆکەخانەی هەولێری نێودەوڵەتی

مكتب بهار للسفر وَالسياحة : نووسینگەی بەهار بۆ گەشتوگوزار

ئەم دەربڕینانە لە ئاخاوتنی زمانی کوردیدا دروستن و لێیان تێدەگەین، بەڵام ئەمانە وەرگێڕانێکی فەرهەنگی و سینتاکسیی زمانی عەرەبییە بۆ سەر زمانی کوردی، چونکە لەیاسای ڕێزمانیی فراوانکردنی دروستەی فرێزدا هەمیشە ناوە دەستنیشانکراوەکە دەکەوێتە کۆتایی فرێزەکەوە، ئەو کاتە ئەم دەربڕینانە

لــە زمانەکەمانــدا دروســتترن و کەرەســتەکانیش بــەپێی یاســای سینتاکســی زمانەکەمان ڕیزکراون، بەم شێوەیە:

جەنگی یەکەمی جیهانی

فرۆکەخانەی نێودەوڵەتیی هەولێر

نووسینگەی گەشتوگوزاری بەهار

**ج- واتاسازی:**

سەرەڕای ئەوەی زاراوە ئاینییەکان هاتوونەتە نێو زمانەکەمانەوە و بەکار دەهێنرێن، چەند لایەنێکی واتایی دروست دەکەن، وەك: پەیوەندییە واتاییەکان (هاوبێژی، هاوواتایی،...)، کێڵگەی واتایی، ....تاد.

**١- هاوبێــژی:** دوو وشــە یــان زیــاتری واتــا جیــاوازە، کــە یــەك فــۆرم وەردەگرن[٢٤]. وەك وشەی (کُفر) لەقورئانی پیرۆزدا بەواتای (نقیض الإیمان، أي عدم التصدیق بآیات الله وأحکامهُ)[٢٥]. واتە بێ بڕوایی، باوەڕ نەبوون بەئایەتەکانی خــوا و فەرمایشــتەکانی. بــۆ نموونــە خــوای گــەورە دەفــەرموێت ((**لَـئِن شَـكَرتُم لأَزِيدَنَّكُم ولَئِن كَفَرتُم إِنَّ عَذَابِي لَشَدِيدٌ**))[٢٦]. بەڵام وشەی (کفر) لەزمانی کوردیدا چەندین واتای جیاوازی هەیە و دەبێتە هاوبێژ، وەك:

کفر١ : دارێکی دەوەنە زۆرتر لە دەم چەمان دەڕوێ

کفر٢ : ڕەنگی ڕەش

کفر٣ : بێ ئاین/بێ بڕوا[٢٧].

هــەروەها وشــەی (خــال) لــە قورئــانی پــیرۆزدا تــەنها بــەواتای (بــرای دایــك) هاتووە، بۆ نموونە خــوای گــەورە دەفــەرموێت ((**حُرِمَت عَلَيكُم أُمَّهَاتُكُم وَبَنَاتُكُم وَأَخَوَاتُكُم وَعمَاتُكُم وَخَالَتُكُم**))[٢٨]. بــەڵام وشــەی (خــاڵ) لــەزمانی کوردیــدا دوو واتای جیاوازی هەیە و دەبێتە هاوبێژ، وەك:

خاڵ١ : برای دایك

خاڵ٢ : خاڵی سەر لەش/نوقتە

ئەم دوو وشەیە هاوبێژن، چونکە لە ڕەگەزدا جیاوازن، واتە نــە لــەدوورەوە و نە لەنزیکەوە پەیوەندیی واتا لەنێوانیاندا نییە و لەڕووی ئیتیمۆلۆجییــەوە هەست بەپــەیوەندیی نێوانیان ناکرێت[٢٩].

بەپێچەوانەیشەوە وشەی (هودا) لەزمانی کوردیدا بەواتای (هیدایەت) دێت و وەك ناوێکی تایبەتی بەکاردێت، بەلاّم لە قورئانی پیرۆزدا ژمارەیەکی زۆر واتای جیاوازی هەیە و هاوبێژن، کە ئەمانەن[٣٠]:

١- البيان، خوای گەورە دەفەرموێت ((أُوْلَئِكَ عَلَى هُدًى من رَّبِهِم)).
٢- دين الاسلام، خوای گەورە دەفەرموێت ((إِنَّكَ لَعَلَى هُدًى مُّستَقِيمٍ)).
٣- الإيمان، خوای گەورە دەفەرموێت ((وَيَزِيدُ اللّهُ الَّذِينَ اهتَدَواْ هُدًى)).
٤- داعياً، خوای گەورە دەفەرموێت ((وإِنَّكَ لَتَهدِي إِلَى صِراطٍ مُّستَقِيمٍ)).
٥- معرفة، خوای گەورە دەفەرموێت ((وَعَلَمَتٍ وَبِالنَّجمِ هُم يَهتَدُونَ)).
٦- كتباً ورسلاً، خوای گەورە دەفەرموێت ((فَإِمَّا يَأتِيَنَّكُم مني هُدًى)).
٧- الرشاد، خوای گەورە دەفەرموێت ((عَسَى رَبِى أَنَ يَهدِيَنِي سَوَاءَ السَّبِيل)).
٨- أمر محمد (ص)، خوای گەورە دەفەرموێت ((إِنَّ الَّذِينَ يَكتُمُونَ مَا أَنزَلنَا مِنَ البَيِّنَت وَالهَدَى)).
٩- القرآن، خوای گەورە دەفەرموێت ((وَلَقَد جَاءَهُم من رَّبِهِمُ الهُدَى)).
١٠- التوراة، خوای گەورە دەفەرموێت ((وَلَقَد أَتَينَا مُوسَى الهُدَى)).
١١- الاسترجاع، خوای گەورە دەفەرموێت ((أُوْلَئِكَ عَلَيهِم صَلَوَاتٌ مِن رَّبِهِم وَرَحمَةٌ وَأُوْلَئِكَ هُمُ المُهتَدُونَ)).
١٢- لايهدي إلى الحجة ولايهدي من الضلالة إلى دينه، خوای گەورە دەفەرموێت ((وَاللّهُ لايهدي القَومُ الظَالمِينَ)).
١٣- التوحيد، خوای گەورە دەفەرموێت ((هُوَ الَّذِي أَرسَلَ رَسُولَهُ بالهُدَى)).
١٤- سُنة، خوای گەورە دەفەرموێت ((أُوْلَئِكَ الذِينَ هَدَى اللّهُ)).
١٥- لا يصلح، خوای گەورە دەفەرموێت ((وأنَ اللّهُ لايهدي كَيدُ الخائنينَ)).
١٦- الهام، خوای گەورە دەفەرموێت ((الَّذِي أَعْطَى كُلَّ شَيءٍ خَلقَهُ ثُمَّ هَدَى)).
١٧- تبنا، خوای گەورە دەفەرموێت ((إِنَّا هُدنَا إِلَيكَ)).

٢- **هاوواتایی**: ئەو وشانەن کە لە واتادا یەکن و دەتوانن لەشوێنی یەکتر لە هەر دەوروبەرێکدا بێن، ئالوگۆڕ بکرێن[٣١]. زمانی کوردی بەدرێژایی مێژوو ژمارەیەکی زۆری لە وشەکانی زمانی دەوروبەری خۆی بەگشتی وەرگرتووە و

بــەکاری هێنــاوە، بەتایبــەتی بەبڵاوبوونــەوەی ئــاینی ئیســلام لــە کوردســتان و بــەکارهێنانی چــەمك و زاراوە ئاینییــەکان و کاریگــەریی لــە خوێنــدن و ســرووتە ئاینییەکان و بۆنە کۆمەڵایەتییەکانی کۆمەڵگای کوردەواریدا، بەمــەش ژمارەیــەکی زۆری وشە ئاینییەکان هاتوونەتە نێو زمانەکەمانەوە، بەشێکیان هەمان مەبەست و واتای وشە خۆماڵییــەکان دەگەیــەنن و بوونــە بــەهاوواتای یــەکتر. بۆیــە خواســتنی وشەی بێگانە لەگەڵ وشەی ڕەسەنی زمانەکەدا هۆیەکە لە هۆیەکانی دروســتبوونی هاوواتــایی، ئەگــەر چــی ئــەو وشــانە لــەدەرەوەی زمانەکــەوە هــاتوون، بــەڵام لــە ئەنجامی بەکارهێنانیان دەبنە بەشێك لە واقیعی زمانەکە[٣٢]. بۆ نموونە:

هەژار = فەقیر
زەوی = عەرز/ئەرز
مرۆڤ = ئینسان
بێباوك = یەتیم
دادوەر = حاکم
بێباوەڕ = کافر
بڕوا = ئیمان
ستەمکار = زاڵم
خێرو خۆشی = بەرەکەت
باڵاپۆش = حیجاب
دواڕۆژ = ئاخیرەت
جەور = زوڵم
سەردان = زیارەت
ئەشکەنجە = عەزاب
فریشتە = مەلائیکە ....تاد.

**٣- کێڵگــەی واتــایی:** بریتییــە لــە کۆمــەڵێك وشــە/ دەربــڕاو کــە لەواتایــەکی گشــتیدا هاوبەشــن و لــەژێر وشــەیەکدا دابــەش دەبــن، کــە ئــەو واتــا گشــتییە دەنوێنێت[٣٣]. زاراوە ئاینییەکان کە تایبەتن بەئاینی ئیسلام و بــەهۆی کاریگــەریی

قورئانــەوە هاتوونەتــە نێــو زمانەکەمانــەوە، بــوارێکی یــان کێڵگەیــەکی واتاییــان دروست کردووە بەناوی کێڵگەی (زاراوە ئاینییەکان یـان زاراوەکـانی قورئـان)، کـە ئەمانەن: [ئەجر، مـەلیك، مەلائیکـە، جەنـەت، شـەیتان، جـن، جیهـاد، جەهەنـەم، حـەج، زەکـات، حەشـر، حـەق، دنیـا، دیـن، ڕەحـم، ڕەحمـەت، سـیحر، ئیسـلام، رەمەزان، تەسبیح، سوورەت، شـەرع، عـەمرە، غـەیب، فـەلاح، قەسـەم، قیامـەت، قەڵەم، کفر، کافر، کەفارەت، نەعمەت، تەقوا، سونەت، غەیبەت، غەیب، سـیفەت، وەعد، ئینسان، کتاب، عەرش، نیکاح، فەتوا، فەرز، عەقیدە، زاڵـم، قـەرز، عەسـر، زیکر، عەزاب، بەرەکەت، ...تاد].

**تەوەری چوارەم/ هۆکارەکانی کاریگەریی ئاینی ئیسلام لەسەر زمانی کوردی:**

ئـاینی ئیسـلام لـە سـەرەتای بڵاوبوونەوەیـەوە، کاریگەرییـەکی گـەورەی کردووەتــە ســەر زمــانی کــوردی و لــە وشــە و دەســتەواژە کوردییەکانـدا ڕەنگـی داوەتەوە، ئەمەش بۆ چەند هۆکارێك دەگەڕێتەوە:

١- نەتــەوەی کــورد بەدرێــژایی مێــژوو خــاوەنی دەوڵــەتێکی یــەکگرتووی ســــەربەخۆ نــــەبووە، هەمیشــــە نیشــــتمانەکەی داگــــیر کــــراوە و لــــەژێر بــــاری چەوساندنەوەدا ناڵاندوویەتی، زمان و ئاینەکەیشی لێ قەدەغە کراوە.

٢- ڕۆشـنبیران و شـاعیران و نووسـەرانی کـورد لـە کۆنـدا ڕۆشـنبیرییەکی ئاینییان هەبووە، چونکە لەو سەردەمەدا خوێنـدنیان لـە حـوجرەی مزگەوتەکانـدا بووە و بەزمانی عەرەبی بابەتە ئاینییەکانی ئیسلامیان خوێندووە و بوونەتە مەلا و فەقێ، بەمەش وشە و دەسـتەواژە ئاینییـەکانیان لـە وتارخوێندنـەوە و ئاخاوتنـدا هێناوەتە نێو زمانی کوردییەوە. بۆیە هەر لەڕێگای ئـەو کاریگەرییـەی قورئانـەوە، چەندین زانای کوردی وەك (عەلی تـەرەماخی، مـەلا مـەحمودی بایەزیـدی، شـێخ حوسێنی قازی، مەولانا خالیدی نەقشبەندی، مـەلا عەبـدوڵڵای جـەلیزادە، ...تـاد) بەزمانی کوردی بەرهەمی ڕۆشنبیریی خۆیان بڵاو کردووەتەوە، ئـەو نووسـینانەش دەبنــە ســەرەتای نووســینی دەقــی کــوردی، بــەواتای کاریگــەریی قورئــان وای لــە زانایانی کورد کردووە، گرنگی بەزمانەکانی خۆیان بدەن[٣٤].

**تەوەری پێنجەم/ ئاینی ئیسلام و بۆنە کۆمەڵایەتییەکان:**

زمـان دیاردەیـەکی کۆمەڵایەتییـە و لـەناو کۆمەڵـدا بـەکاردێت، لـە هـەمان کاتیشدا کۆمەڵ پشت بەزمان دەبەستێت بۆ تێگەیشتن و دروستکردنی پەیوەندییە کۆمەڵایەتییـەکان، کـە چـەندین بۆنـە و شـێوازی جیـاواز کۆیـان دەکاتـەوە، وەك: بۆنەی خێزانی و فەرمی و ئاینی و بازرگانی و ڕامیاری و...تاد، لەم بۆنانـەدا زمـان ڕۆڵ و کاریگەریی خۆی دەبینێت و دەربڕین و بەکارهێنانی جیاواز بەکار دەهێنێـت و دەکەوێتە ژێر دەسەڵاتی کۆمەڵەوە، تەنانەت بۆنە ئاینییـەکانیش لـەناو کۆمەڵـدا بـەجێ دەهێنـرێن و پەیوەندییـەکی تونـدیان بەکۆمەڵـەوە هـەبووە، بۆیـە زاراوە و دەربڕینـە ئاینییـەکان تێکـەڵ بەبۆنـە کۆمەڵایەتییـەکان بوونـە، بەمـەش بوونەتـە بۆنـەی کۆمەڵایـەتیی ئـاینی. لـە بۆنەکانـدا زمـان ڕۆڵـی سـەرەکی لەدروسـتکردنی پەیوەنـدیی نێـوان مـرۆڤ و خـوادا دەبینێـت، وەك بانگـدان و وتـار و مـارەکردن و جیابوونەوە و مردن و ناشتن و سوێنددان و پرسـیار و وەڵام و خـەڵوەت و زیکـری سۆفی و دەروێشاندا[٣٥]. کەواتە کۆمەڵ بەهۆی زمانەوە پارێزگاری لە ئاین دەکـات و ئاینیش لە هەموو بۆنە کۆمەڵایەتییە جیاجیاکانـدا ڕۆڵێکـی کاریگـەر دەبینێـت و لەهەر بۆنەیەك دەربڕینی جیاواز و ئاوازی جیاوازی دەوێت بەپێی کاریگەرییەکـەی بەئاینی ئیسلام، بۆیە ئەم بەکارهێنانانە بوونەتە شێوازێکی کۆمەڵایەتی، لەوانە:

١- پێشوازیکردن: یاخوا بەخێربێی، خوا موەفەقت کا، بێڕەحم بووی، ...تاد.

٢- خواحـافیزی: خواتـان لەگـەڵ، خـوا بتانپـارێزێ، لـە پـەنای خوایـا بـن، خـوا ئاگادارتان بێ، لەپەنای خوایا بن،...تاد.

٣- جەژنە پیرۆزە: خوا موبارەکی کا، پیرۆز بێ، گەردنمان ئازاکەن، یاخوا هـەموو جەژنێ بەخۆشی بێ، ...تاد.

٤- لەدایکبوون: خوا لێتان نەسێنێ، خوا بۆتان سالّح کا، سەر بـەرزق بـێ، یـاخوا بەنازی دایك و باوکی گەورە بێ، ...تاد.

٥- هاوسەری: خوا لێکتان نەکا، یاخوا پیرۆزتان بێ، خوا بۆ یـەکتان بهێڵـێ، خـوا موبارەکی کا، ...تاد.

٦- پرسە: خوا لە گونـاحی خۆشـبێ، خـوا عـافوی کـا، خـوا لێـی خۆشـبێ، خـوا جەزاتان باتەوە، خوا سەبووریتان باتەوە، ...تاد.

٧- دوعاکردن: خوا صالّحی کا، خوا ئیماندارت کا، خـوا رزقتـان بـا، خـوا دەسـت بەباڵتەوە بگریّ، خوا سەرفرازت کا، ...تاد.

٨- چاکوچۆنی: سەلاموعەلەیکم، مەرحەبا، عەلەیکە سـەلام، خـوا عـەفوتکا، خـوا سەلامەتت کا، خوا ئیماندارت کا، ...تاد.

٩- نەخۆش: ئینشائەڵلا کەفارەتی گوناحەکانت بیّ، ئینشائەڵلا چاك دەبـی، خـوا شیفات بۆ بنێریّ، خوا ڕەحمی پیّ بکا، ...تاد.

١٠- سـوێندخواردن: بـە فـەخری عالـەم، بـە سـی جزمـەی قورئـان، بـە خـوا، بـە پێغەمبـەر، بـەو ماڵـەی سـەرم پیـاکردووە، بـە غەوسـی گـەیلانی، بـەقورئان، ...تاد.

١١- خێرکردن: خوا بەزیادی کا، خوا قبوڵی کا، خوا خێر و پاداشتان بۆ بنووسیّ، خوا بکا بەچرای قیامەتتان، ...تاد.

١٢- نزاکردن: خوایە رزقمان بە، خوایە لە گوناحمـان خـۆش بـە، خوایـە قەڵـەمی عەفو بهێنیت بەسەر تاوانەکانماندا، ...تاد.

**ئە نجامەکان:**

١. زمـان و ئـاین لـەناو کۆمەڵـەوە سەرچـاوە دەگـرن، پەیوەنـدی و کاریگـەریی نێوانیـان پەیوەسـتە بەکۆمەڵـەوە، بۆیـە کۆمـەڵ دەتوانێـت بـەهۆی زمانـەوە گوزارشـت لـە پابەنـدبوونی خـۆی بـەئاینێکی دیـاریکراوەوە بکـات و تاکـەکانی لەژێر بیروباوەڕی ئەو ئاینەدا کۆبکاتەوە و پارێزگاری لە ئاینەکەی بکات.

٢. هەرچـــەندە فۆنیمـــە نەبزوێنـــەکانی /ث ، ذ ، ص ، ض ، ط ، ظ/و فۆنیمـــە بزوێنەکانی /الضمة، الفتحة، الکسرة/ لـە ژمارەیـەکی زۆری وشـە ئاینییەکانـدا دەبینرێن، کـە لەڕێگـەی ئـاینی ئیسـلامەوە هاتوونەتـە نێـو فەرهـەنگی زمـانی کوردییەوە، بەڵام زانایان و زمانەوانانی کورد دانەماون و توانیویانە ئەم وشـانە بخەنە ژێر باری یاسای فۆنەتیکی زمانەکەمانەوە و بەرامبەریان هێمایان دانـاوە و لەزمانی ئاخاوتن و نووسیندا خۆماڵییانە بەکاریان هێناوە.

٣. زمـانی کـوردیش وەك سـەرجەم زمانـەکانی تـری جیهـان لـە خواسـتنی وشـە بیانییەکانـدا بێبـەش نـەبووە، بەگشـتی ئـەو وشـانەی کـە لـە زمانـەکانی دەوروبەرەوە وەك عەرەب و فارس و تورك و.... بەتایبەتی وشـە ئاینییـەکانی قورئـانی پـیرۆز، کـە هاتوونەتـە نێـو فەرهـەنگی زمانەکـە و زمـانی کوردییـان لەبواری ئاینیدا دەوڵەمەند کـردووە، ئـەویش زیـاتر بەمەبەسـتی تێگەیشـتن لـە قورئـــانی پـــیرۆز و بـــەکارهێنانیان لـــە ســـرووت و وێـــرد و بۆنـــە ئـــاینی و کۆمەڵایەتییەکاندا.

٤. بەمەبەسـتی بـەرز و پیرۆزڕاگرتنـی نـاوە ئاینییـەکان، کۆمـەڵگای کـوردەواری بـەردەوام لەکۆنـەوە و تائێسـتاش ئـەو نـاوە ئاینییانـەی لـە پرۆسـەی ناونانـدا بەکارهێناوە.

٥. زمانی کوردی سوودی لە وشـە ئاینییـە خوازراوەکـان وەرگرتـووە بەمەبەسـتی داڕشتن و ڕۆنانی وشەی نوێ لە وشەسازیدا.

٦. هەروەها قورئانی پیرۆز و زمانی عەرەبی کاریگەریی لەسەر ئاستی سینتاکسی زمانی کوردی هەبووە، وەك لە دروستەی ڕستەی ناوی و فرێزی ناوی و فۆرم و بەکارهێنانی ئامرازی لێکدەری (و)دا دەبینرێت.

٧. وشە ئاینییەکان بە بەراورد لەنێوان قورئانی پیرۆز و زمانی کوردیدا، چەندین دیاردەی واتایی دروست دەکەن، وەك دیاردەی هاوبێژی و هاوواتایی، هەروەها ئەم وشانە کێڵگەیەکی واتاییان لە زمانی کوردیدا بەناوی (کێڵگەی زاراوە ئاینییەکان یان زاراوەکانی قورئان) دروست کردووە.

٨. زاراوە و دەربڕینە ئاینییەکان تێکەڵ بەبۆنە کۆمەڵایەتییەکان بوونە، بەمەش ڕۆڵ و کاریگەریی خۆیان لە هەر بۆنەیەکدا دەگێڕن و بوونەتە بۆنەی کۆمەڵایەتیی ئاینی.

## پەراویزەکان:

١. هادي نهر (١٩٨٨: ١٧).
٢. أ.د. رشيد عبدالرحمن العبيدي (٢٠٠٢: ٣١).
٣. شایانی باسە ژمارەیەکی زۆر لە سەرچاوە و زانستە جیاوازەکان باسیان لە چەمك و پیناسەی زمان کردووە، چونکە زمان پەیوەندی بە هەموو زانستەکانەوە هەیە و دیاردەکە لەزۆر روانگەی جۆربەجۆرەوە سەیری دەکریت و هەر شارەزایەك لەچوارچیوەی بۆچوون و میتۆدی خۆیەوە لیی دەکۆلیتەوە، بیگومان پیناسەی زانایانی کۆمەلناس و دەروونناس و زمانەوان و فەیلەسووف و زانستی پزیشکی و .... ناشیت وەك یەك بن.
٤. عەلی باپیر (٢٠٠٠: ١٧٦).
٥. مجدالدين محمد بن يعقوب الفيروز آبادي (٢٠٠٣: ٢٢٧).
٦. أبي القاسم الحسين بن محمد (٢٠٠٨: ١٨٢).
٧. لويس معلوف (١٩٩٨: ٢٣١).
٨. مصطلح الدين، وما هو تعريف الدين.
٩. سەلام ناوخۆش و نەریمان خۆشناو (٢٠١٠: ٢٢٥).
١٠. سەرچاوەی پیشوو (٢٤٠).
١١. القرآن ألكريم، سورة طه، الآية (١١٣).
١٢. كريستوف لوكسنبرگ (٢٠٠٠: ٨-٩).
١٣. سەلام ناوخۆش و نەریمان خۆشناو (٢٠١٠: ٢٦٧).
١٤. سەنگەر عەلی مامە (٢٠٠٧: ٤٨-٤٩).
١٥. پەروین عوسمان مستەفا (٢٠٠٩: ٣٤).
١٦. سەلام ناوخۆش و نەریمان خۆشناو (٢٠١٠: ٢٥٧).
١٧. سەرچاوەی پیشوو (٢٥٧).
١٨. دیوانی نالی (١٩٧٦: ٢٣-٢٥).
١٩. دیوانی مەحوی (١٣٨٤: ٣٦٧-٣٧٠)
٢٠. القرآن ألكريم، سورة البقرة، آية (١٧٢).
٢١. القرآن ألكريم، سورة النحل، آية (٤٥).
٢٢. محيي الدين الدرويش (١٩٨٠: ١٤).
٢٣. القرأن ألكريم، سورة التين، آية (١-٣).

٢٤. محەمەد مەعرووف فەتاح (١٩٩٠: ١٧٠).
٢٥. د.ابراهيم السامرائي (١٩٩٠: ٢٩).
٢٦. القرآن ألكريم، سورة ابراهيم، آية (٧).
٢٧. بڕوانـە: ١- فـەتاح مامـە عـەلی (١٩٨٩: ٣٣). ٢- عەبـدوڵلا عـەزیز محەمـەد بابـان (٢٠٠٥: ٤٠).
٢٨. القرآن ألكريم، سورة النساء، آية (٢٣).
٢٩. فەتاح مامە عەلی (١٩٨٩: ٢٠).
٣٠. د.ابراهيم السامرائي (١٩٩٠: ٤٢-٤٤).
٣١. ستيفن اولمان (١٩٨٦: ١٢٤).
٣٢. د. طالب حسێن على (٢٠٠٢: ٨٤).
٣٣. لە [فەرهاد تۆفیق حەسەن (٢٠١٢: ٢٧)] وەرگیراوە.
٣٤. سەلام ناوخۆش و نەریمان خۆشناو (٢٠١٠: ٢٥٤).
٣٥. هێمن عەبدولحەمید شەمس (٢٠٠٦: ١٧).

## سەرچاوەکان

**القرآن ألكريم.**

**به کوردی**


١. د. ئومێد بەرزان برزو، زمانەوانی، بەرگی یەگەم، چاپی یەکەم، چاپخانەی گەنج، سلێمانی، ٢٠١١.
٢. پەروین عوسمان مستەفا عەللاف، واتا و وەرگێڕان، چاپی یەکەم، چاپخانەی ڕۆژهەلاَت، هەولێر، ٢٠٠٩.
٣. دیوانی مەحوی، لێکدانەوە و لێکۆڵینەوەی: مەلا عەبدولکەریمی مودەریس و محەمەد مەلا کەریم، چاپی دووەم، بلاْوکەرەوەی کوردستان، سنە، ١٣٨٤ هەتاوی.
٤. دیوانی نالی، لێکۆڵینەوە و لێکدانەوەی: مەلا عەبدولکەریمی مودەریس و فاتح عەبدولکەریم، چاپی سێهەم، چاپخانەی کۆڕی زانیاری کورد، بەغدا، ١٩٧٦.
٥. ڕۆژان نوری عەبدوڵلاَ، فەرهەنگی زمان و زاراوەسازی کوردی، سلێمانی، ٢٠٠٧.
٦. سەلام ناوخۆش و نەریمان خۆشناو، زمانەوانی، بەرگەکانی (٤، ٥، ٦، ٧)، چاپی یەکەم، چاپخانەی مەنارە، هەولێر، ٢٠١٠.
٧. د. طالب حسێن علی، دیاردەی هاوواتایی لەزمانی کوردیدا، گۆڤاری زانستی مرۆڤایەتی، زانکۆی سەلاحەدین، ژ (١٦)، ٢٠٠٢.
٨. عەبدوڵلا عەزیز محەمەد بابان، هایپۆنیم و هەندێ پێوەندی واتایی لە زمانی کوردیدا، نامەی دکتۆرا، کۆلێجی زمان ـ زانکۆی سەلاحەدین، ٢٠٠٥.
٩. عەلی باپیر، خواناسیی..ئایین..ئیمان، نووسینگەی تەفسیر بۆ چاپ و بلاْوکردنەوە، چاپی یەکەم، هەولێر، ٢٠٠٠.
١٠. فەتاح مامە عەلی، هاودەنگ لەزمانی کوردیدا، نامەی ماستەر، کۆلێجی ئاداب ـ زانکۆی سەلاحەدین، ١٩٨٩.
١١. فەرهاد تۆفیق حەسەن، پەیوەندییە سیمانتیکییەکان و هەندێك دیاردەی واتایی لە زمانی کوردیدا، نامەی ماستەر، کۆلێژی زمان ـ زانکۆی سلێمانی، ٢٠١٠.
١٢. محەمەد مەعرووف فەتاح، زمانەوانی، چاپخانەی دار حکمەت، هەولێر، ١٩٩٠.
١٣. هێمن عەبدولحەمید شەمس، شێواز و دەربڕین لە بۆنە کۆمەلاْیەتییەکاندا، نامەی ماستەر، کۆلێجی پەروەردە ـ زانکۆی کۆیە، ٢٠٠٦.

## سەرچاوەکان بە عەرەبی


١٤. رشيد عبدالرحمن العبيدي، مباحث في علم اللغة واللسانيات، الطبعة الاولى، بغداد – العراق، ٢٠٠٢.

١٥. أبي القاسم الحسين بن محمد المعروف بالراغب ألاصفهاني، المفردات في غريب القرآن، دار احياء التراث العربي للطباعة والنشر والتوزيع، الطبعة الاولى، بيروت ـ لبنان، ٢٠٠٨.

١٦. د. أبراهيم السامرائي، في المصطلح الاسلامي، الطبعة الاولى، دار الحداثة للطباعة والنشر والتوزيع، بيروت ـ لبنان، ١٩٩٠.

١٧. سەنگەر علی مامه، أصواتُ اللُّغتين: العربيَّة والكرديَّة (دراسة تقابلية)، رسالة الماجستير، كلية التربية ـ جامعة بغداد، ٢٠٠٧.

١٨. ستيفن اولمان، دور الكلمة في اللغة، ترجمة/ كمال محمد بشر، مكتبة الشباب، ١٩٨٦.

١٩. كريستوف لوكسنبرك، معاني ألقرآن على ضوء علم أللسان، ت/ رالف غضبان، دار الكتاب العربي، برلين، ٢٠٠٠.

٢٠. لويس معلوف، المُنجد في اللغة، الخامسة واالثلاثون، دار المشرق، بيروت ـ لبنان، ١٩٩٨.

٢١. مجدالدين محمد بن يعقوب الفيروز آبادي، القَامُوس المحيط، اعداد وتقديم: محمد عبدالرحمن المرعشلي، دار احياء التراث العربي للطباعة والنشر والتوزيع، الطبعة الثانية، بيروت ـ لبنان، ٢٠٠٣.

٢٢. محيي الدين الدرويش، إعراب القُرآن الكَريم وَبَيانُه، مجلّد الأول، حمص – سورية، ١٩٨٠.

٢٣. مصطلح الدين، وما هو تعريف الدين، ويكبيديا.

٢٤. هادي نهر، علم اللغة الاجتماعي عند العرب، بيروت – لبنان، ١٩٨٨.

## ملخص البحث

هذا البحث الموسوم بـ (تأثير دين الاسلام على اللغة الكردية) وفيه تطرقت الى العلاقة القائمة بين اللغة والدين، وتأثير دين الاسلام على مستويات اللغة والتعبير في المراسيم الاجتماعية. ويتألف البحث من خمسة محاور رئيسية:

المحور الأول والثاني تحدثت فيهما عن مفهوم وتعريف اللغة والدين وعلاقة بعضهما ببعض. وفي المحور الثالث والرابع والخامس تكلمت عن تأثير الدين الاسلامي على مستويات اللغة الكردية وعوامل التعبير في المراسيم الاجتماعية.

وفي الخاتمة عرضنا أهم نتائج البحث، وبعدها جاءت قائمة المصادر والمراجع.

## Abstract

This paper which is entitled “The influence ofIslam on the Kurdish Language” explores the relationship and inter-influence between language and religion. It also tackles the impact of Islam upon the different levels of the language and expressions in the social contexts. The paper is divided into five sections:

The first two sections deal with the concept and definition of language and religion and the relationshipbetween them while the last three sections study the influence of Islam upon the different levels of the Kurdish language, its reasonsand its expressions in the social affairs.Finally, the study ends with number of conclusions with a list of references.

# دۆزینەوەی دوو ژمارەی دیکەی ڕۆژنامەی کوردستان!

**وتەیەکی پێویست**

لە مێژووی ڕۆژنامەگەریی کوردیدا دەیان پرس لە ئارادان، کە تا ئێستا پسپۆرانی ئەو بوارە وەڵامی وردیان بۆیان نییە. هەندێکیان بوونە بە گرێکوێرە بۆ ئەوانەی لەم بوارە دەکۆڵنەوە. ئەمە لە لایەکەوە، بەرهەم و ئەنجامی ئەو سیاسەتانەیە کە کاربەدەستانی دەوڵەتانی داگیرکەر بەرامبەر بە کورد پەیڕەویان کردووە. ئەوان تەنیا بەوە وازیان نەهێناوە کورد بتوێننەوە و زمان و کولتوورەکەی قەدەغە و بێبایەخ بکەن، بەڵکو هەوڵی زۆریشیان داوە شوێنەواری کورد لە مێژوودا بسڕنەوە و هەموو ئەو بەڵگەنامانە و میراتە کولتوورییە لە ناوببەن، کە نیشانەی هەبوونی کوردن و دەبنە بنەمایەك بۆ هەموو بووژانەوەیەکی نوێی ئەم گەلە. بە هۆی ئەم سیاسەتانەوە، بۆ ماوەیەکی دوورودرێژ زانیاریمان لە بارەی ڕۆژنامە و گۆڤارە کوردییەکانەوە، بە تایبەتی ئەوانەی لە کۆتایی سەدەی نۆزدەم و چارەکی یەکەمی سەدەی بیستەمدا بلاوکرانەوە. کاربەدەستانی تورك هەموو ئەوەی دەستیان پێی گەیشتبوو یا لە نێویان بردبوون، یا لە شوێنگەلێك قایمیان کردبوون، کورد دەستی پێیان نەدەگەیشت.

دیوەکەی دیکەی ئاڵۆزییەکە بە بۆچوونی من لەوەدایە، کە هەندێ جار ڕۆژنامە و گۆڤارەکان لە سەردەمی جیاوازدا لە ژێر هەمان ناوا بلاوکراونەتەوە، ئەمەش کێشەیەکی گەورەی بۆ توێژەران دروست کردووە و گەلێ پرسی هێناوەتە کایەوە، کە تا ئێستاش زۆریان بێ وەڵام ماونەتەوە.

خۆشبەختانە لەم ساڵانەی دواییدا، هەندێ گۆڕانکاری لەم بارەیەوە هاتوونەتە کایەوە، ساڵ لە دوای ساڵ بە هیمەتی ژمارەیەك لە خەمخۆرانی ئەم بوارە، ڕۆژنامە و گۆڤاری نوێ یاخود ژمارەی نوێی ئەو ڕۆژنامە و گۆڤارانە دەدۆزرێنەوە، کە پێشتر ئاگاداریمان لە بارەیانەوە هەبوو، بەڵام نەماندەزانی چەند ژمارەیان لێ دەرچوون. دۆزینەوەی ئەم ڕۆژنامە و گۆڤارانە زانیارییەکانمان لە بارەی مێژووی ڕۆژنامەگەریی کوردییەوە فراوانتر دەکات و دەتوانین وێنەیەکی باشتری ئەم بوارە گرنگەی مێژوومان بکێشین.

ئـەم وتـارەی مامۆسـتا عەبـدوڵلا زەنگەنـە لـە مـەڕ هـەردوو ژمـارە ۳ و ٤ ی ڕۆژنامـەی (کوردسـتان)ی دایـك لـە دەورەی دووەمیـدا لـە سـاڵی (۱۳۲۷ کۆچـی ۱۹۰۹ز)، تیشـکێکی نـوێ دەخاتە سەر ڕۆژنامەی کوردستان و کۆمەڵێ پرسیاری نوێ لەگـەڵ خۆیـدا دەهـێنێ. ئـەوەی کە لە سەر هەردوو ژمارەکە (ساڵی یازدەهەم) نووسـراوە، ئـەوەمان بـۆ ڕوون دەکاتـەوە، کـە ئەم ژمارانە هی دەورەی دووەمی هەمان ڕۆژنامەی کوردستانن، کە لە ساڵی ۱۸۹۸ لـە قـاهیرە دەست بە بڵاوکردنەوەی کرا.

ئەوەی مایەی تێڕامان و سەرنجە ئەو ژمـارە سـاڵەی ۱۳۱۳ ڕۆمییەیـە، کـە لـە ژێـر نـاوی کوردستان نووسراوە و، دەبێ بە ساڵی دەرکردنی یەکەمین ژمارەی ڕۆژنامەی (کوردستان)ی دابنێین، ئەمەش لەگەڵ ئەو ساڵەدا یەك ناگرێتەوە کە لە سەر یەکـەمین ژمـارە نووسـراوە، کە ساڵی ۱۳۱٤یە. هـەروەها ئـەو ژمـارەی (۲٦٤)، کـە دەبـێ ژمـارەی تـەواوی ڕۆژنامەکـە بێـت نیشـانەی پرسـیارێکی گـەورە دروسـت دەکـات و دەبـێ چـاوەڕوانی ئـەوە بـین، کـە مامۆسـتا عەبدوڵڵا بەخۆی هەندێ لێکدانەوەی لەبارەیەوە هەبێت.

**د. جەبار قادر**
**سەرنووسەر**

# دۆزینەوەی دوو ژمارەی دیکەی ڕۆژنامەی کوردستان!

**عەبدوڵڵا زەنگەنە**
**بەڕێوەبەری نووسینی گۆڤاری**
**ئەکادیمیای کوردی**

ڕۆژی ٢٢ نیسانی ١٨٩٨ تاوەکو ئێستا لە مێژووی کورداندا ڕۆژێکی پیرۆزە، لە ئەمڕۆدا تەنانەت ڕەشۆکیی خەڵکیش بەم ڕۆژە ئاشنان، چونکە ئەوە ماوەی پتر لە چل ساڵێکە نەك هەر ڕۆژنامەنووسان، بەڵکو حکومەتیش ، جا چ حکومەتی ئێستای خۆمان بێت یان تەنانەت لە سێبەری ڕژێمی دژە کوردی پێشووشدا، وەکو نەریتێك ساڵانە نەك هەر لە کوردستان، بەڵکو لە دەرەوەشدا دەیان کۆڕ و سیمینار بۆ ئەم یادە گێڕدراوە. ئەم ڕۆژە بەپێی هەردوو ڕۆژژمێری هیجری و ڕۆمی دیارکراوە کە لەسەر ڕووی ژمارە (١)ی (کوردستان)ی یەکەمین ڕۆژنامەی کوردی نووسراوە:

(**ڕوژا پینجشمی دە ٣٠ ذولقعدە سنە ١٣١٥ هـ (ك) پینجشنبە فی ٩ نیسان سنە ١٣١٤(ڕ)**).

هەروەها لەسەر ڕووی لاپەڕە یەکی هەمان ئەو ژمارەیەدا (**مقداد میدحەت**)ی خاوەنی نووسیویە: "**هەتا نۆهۆ کەسێ جەریدەکێ هۆلی نەنڤیسییە، ئەڤ جەریدەیا من ئا ها، یا عەولیە. لۆما وی گەلەك کێمای هەبتن، ئەز هێڤی دکم کێماییای جەریدەیێ ژ من ڕە بنڤیسن. هەمی تشت وەکی نوو چێ دبن، کێمن پاشنی هنگێ دکەڤە ڕێ دە**".

ئەوەی تاوەکو ئێستا لەبارەی ڕۆژنامەی (کوردستان)ەوە زانراوە، ئەوەیە کە لەنێوان ساڵانی ١٨٩٨ تاوەکو ساڵی ١٩١٨، سێ خولی لێ دەرچووە:

**خولی یەکەم:** لە ماوەی چوار ساڵاندا، (١٨٩٨ – ١٩٠٢)، (٣١) ژمارەی لێ دەرچووە. لە ژمارەکانی ئەم خولە تەنیا ژمارە (١٩) هێشتا نەدۆزراوەتەوە.

**خولی دووەم:** لە ساڵانی ١٩٠٨–١٩٠٩دا، بۆچوونەکان وان کە پێنج یاخود شەش ژمارەیەکی لێ دەرچووبێت. لە ژمارەکانی ئەم خولەش تاوەکو ساڵی ٢٠١١ هیچ یەکی لە ژمارەکانی نەدۆزرابوونەوە و هەموویان بە بزر دادەنران[1].

**لە خولی سێیەمدا،** تەنیا (١١) ژمارەی لێ دەرچووە، ئەم خولەش چەند لایەنی خولەکانی دیکەمان بۆ ساغ دەکاتەوە. کەواتە مێژووی ئەم رۆژنامەیە هێشتا زۆری ماوە ئیشی لەسەر بکرێت.

لە گەشتێکماندا بۆ ئەستەنبوڵ بەمەبەستی بەشداریکردن لە کۆنفرانسێك بە بۆنەی سەد ساڵەی دەرچوونی گۆڤاری (**رۆژی کورد**)ەوە و دووبارە چاپکردنەوەی هەر چوار ژمارەکەی ئەم گۆڤارە، بەخت یاوەرمان بوو دوو ژمارەی نوێی (کوردستان)مان چنگ بکەوێ و قەفێکی دیکەی مێژووی رۆژنامەکەمان بکەینەوە. ئەوانیش ژمارە (٣ و ٤) خولی دووەمی ئەم ڕۆژنامەیەیە.

ژمارە (٣)ی رۆژنامەی (**کوردستان**)ی دەورەی دووەم لە ١٢ شوباتی ١٣٢٤ ڕۆمی، (١٢ شباط سنە ٣٢٤) بەرامبەر بە ٥ سەفەری ١٣٢٧ کۆچی (٥ی صفر سنە ٣٢٧) بڵاوکراوەتەوە.

ژمارە (٤)یشی لە ٥ مارتی ١٣٢٥ ڕۆمی (٥ مارت سنە ٣٢٥)، بەرامبەر بە ٢٦ سەفەری ١٣٢٧ کۆچی (٢٦ صفر سنە ٣٢٧) بڵاوکراوەتەوە.

ئەو دوو ژمارەیەی رۆژنامەکە ئەگەرچی بە زمانی کوردی لە سەریان نووسراوە حەوت ڕۆژ جارێك بڵاو دەکرێتەوە (**هفت رۆژا جارکی دردکفە ژ بر خوش بوراندن و علماندنا صنعت و معرفتیە**) و بە زمانی تورکیش نووسراوە (**کردلری تحصیل علوم و فنونە و حسن آمیزشە تشویق ایچون هفتەلق ترکجە کردجە غزتەدر**). بەڵام وا دیارە هەفتانە دەرنەچووە و ماوەی نێوان ئەو دوو ژمارەیە (٢١) رۆژێکە. خاوەن ڕۆژنامەکە ئەحمەد سورەیا بەدرخانە لەلای چەپی لۆگۆی هەردوو ژمارەی رۆژنامەکە نووسراوە: ( **خوەیی جریدەیی مسئول: احمد ثریا لاو بدرخان حچی بوی کاغدی ژ جریدەیی رە بنویس سەر کاغدی هولی نفیسە: استانبولی پیش**

**مقابلى استاسيوتا سركەچيه جريدا كردستانى. حچ كاغدى وك ريا مه گرتى بيتن امى بنفسن سالا وى ٣٠ شش هيف (٢٠) قمرى يايه، يكاوى ١٠ پاره).**

هەموو ئەو زانیارییانەش لەلای راستی لۆگۆی رۆژنامەکە بە زمانی تورکی دووبارە کراونەتەوە.

هەردوو ژمارەی رۆژنامەکە لە چاپخانەی ئوخوەت (**مطبعة اخوت**) چاپ کراون. ئەو چاپخانەیەش بەپێی نووسینێك کە بە ئیمزای (**عینتاب نفوس ماموری حاجی حسن تحسین**) لە ژمارە (٤)دا بڵاوکراوەتەوە، وا دیارە مولکیماڵباتی بەدرخانییان بووە، نەك هەر ئەوەندە، بەڵکو بەم چاپخانەیە چەند کتێبێکیش چاپ کراوە و لە هەردوو ژمارەی ڕۆژنامەکەدا ریکلامیان بۆ کراوە.

وردبوونەوە لە هەموو ئەو زانیارییانەی سەرەوە بە ئاسایی دێنە پێش چاو، بەڵام ئەوەی لای ئێمە نەك هەر جێگای سەرسووڕمانە، بەڵکو بۆتە مایەی نیگەرانیش! ئەو ژمارەی (١٣١٣)یەیە، کە لە ژێر لۆگۆی رۆژنامەکەدا نووسراوە، دیارە ئەو ژمارەیەش ساڵی رۆمییەکەیە، کە لەسەر ڕووی ڕۆژنامەکانی ئەوسا دەنووسران. ئەگەر ئێوەش وەکو ئێمە بزانن ئەو ژمارەی (١٣١٣)یە ساڵی رۆمییە و ڕێك دەکاتە ساڵی (١٨٩٦)ی زایینی، دڵنیام ئێوەش سەرتان سووڕ دەمێنێت. خۆ ئەگەر تۆزەرێك بیەوێت ئەو نیگەرانییەمان برەوێنێتەوە بە پاساوی (**هەڵەی چاپ**) سەرسووڕمانەکەمان نەهێڵێت، زوو بە زوو پێی دەڵێین: باشە چ لەو هەردوو دەستەواژەی هەردوو زمانی تورکی و کوردییە بکەین، کە لە سەرەوەی ڕۆژنامەکەدا نووسراوە کە ساڵی یازدەیە (**اون برنجى سنه - سالا یازدەیی**). نەك هەر ئەوەندە لەوەش سەرسووڕهێنتر، کە لە سەرەوەی ڕۆژنامەکە و لە پاڵ هەردوو ژمارەی (٣، ٤)ی ڕۆژنامەکەدا نووسراوە: (عدد- ٢٦٤- ٣)، (عدد- ٢٦٤- ٤)، جگە لەوەش ئەو دوو ژمارەی ڕۆژنامەکە تەنیا وشەی (حب - ٣ و حب - ٤)یان بە زمانی کوردی لە تەك نووسراوە، هەردوو ڕۆژنامەکەش (٤) لاپەڕەیین.

ماوەتەوە پێتان بڵێم ناوەڕۆکی هەردوو ژمارەی رۆژنامەکە هەمووی بە زمانی تورکی عوسمانی و کوردی نووسراون، ئەوەش پێچەوانەی رۆژنامەی (**کوردستان**)ی پێشینە، واتە لەم خولەی رۆژنامەکەدا زمانە تورکییەکە بەسەر زمانە کوردییەکەدا زاڵە. هەروا بێتەوە ئەوانەی تیایدا نووسیویانە بریتین لە

حەسەن، خەلیل، میدحەت، عەبدولڕەحمان لە بنەماڵەی بەدرخان (**امیر بدرخان زاده حسن، خلیل، مدحت، عبدالرحمان**) و (**صالح بدرخان**) و (**لاوی امیر بدرخان حسین کنعان**). هەروەها نامەیەکی سەرۆکانی هەردوو عەشیرەتی (**قریش**) و (**بالان**) و شیعرێکی (مەلای جزیری)ش دەبینرێت.

پاشانیش لە ژمارە(٣)ی رۆژنامەکەدا بە زمانی کوردی و لە ژمارە (٤)یشدا بە زمانی تورکی لە ژێر ناوی (**کردستان**)دا نووسراوە: (**مالباتا ئەمیر بدرخان ژ قەنجیا کوردان دلخۆشی ژ خراپیا کوردان دل ناخۆشی دبن. مەقسەدا دەرخستنا ڤی جەریدەیی ژی سەلامەتا ولات رایە چ قەنجیا ژ دەستی مالباتا ئەمیر بەدرخان بت وی بکن هون ژی حالی ولات ژ مە را بنڤیسن دا ئەم بزانین چاوە خدمەتی ژ ولاتی خۆ رابکن**).

ناوەرۆکی بابەتەکانیش زیاتر بریتین لە نامە و باسی ڕووداوی کوشتنی (**ڕەزوان پاشا**) و باسی زمانی کوردی و هەندێ ئامۆژگاری و چەند بابەتێکی دیکە دەکەن. لەم ژمارەی (**گۆڤاری ئەکادیمیای کوردی**)دا کۆپی لاپەڕە (١ و ٤)ی هەردوو ژمارەی ڕۆژنامەکە، وەکو خۆی دەبینن، ئومێدەوارین تا ئەو جوامێرەی هەردوو ژمارەی رۆژنامەکەمان بۆ دەکاتە کوردی، توێژەرێکی لێهاتوومان بتوانێت گرێکان بکاتەوە و وەڵامی پرسیارەکانمان بداتەوە[٢].

---

(١) بەڵام هەر لەو ساڵەدا (**بنکەی ژین**) (٣) لاپەڕەی هەردوو ژمارە (٣ و ٤)ی بەبێ لۆگۆ و هیچ مێژوویەکی دیاری سەر رۆژنامەکە، نازانم چۆن لە کتێبخانەی زانکۆی ئەتاتورک لە ئەرزەڕۆم (EAU) چنگ کەوتبوو بڵاوکردەوە، ئەو بڵاوکردنەوەیە جگە لە سەلماندنی هەبوونی ئەم خولەی رۆژنامەکە، هیچ لایەنێکی دیکەی مێژووی رۆژنامەنووسیمانی پێ ساغ نەدەکرایەوە.

(٢) ئەم دوو ژمارەیەی رۆژنامەکەمان بە هەوڵ و کۆششی ئەو جوانانەی (**کۆما خەباتێن کۆردۆلۆژیی**) (**سەرهات بۆزکورت**) و (**یەنەر کۆچ**) و (**تاهیر بایکوشاک**) چنگ کەوتووە.

عدد ٢٦٤ — ٣ | اون برنجی سنه — سالا یازده‌یی | حب — ٣ .

مدیر مسئولی
بدرخان زاده احمد ثریا

آدرسی
استانبولده سرکه‌جی استاسیونی قارشیسنده « کردستان » غزته‌سی اداره‌خانه‌سی

مسلکمزه موافق آثار درج ایدیلر ایدیلمیان اوراق اعاده ایدلمز
سنه‌لکی (٣٠) آلتی آیلغی (٢٠) غروشدر




خوه‌یی جریده‌یی مسئول
احمد ثریا لاو بدرخان

حجی بوی کاغدی ژجریده‌یی ره بنویس سرکاغدی هولی بنفیسه

استانبولی پیش مقابل استاسیونا سرکه‌جی‌یه جریدا کردستانی
حج کاغدی‌وك ریامه کرنی بیتن
امی بنفسن سالاوی (٣٠) شش هیف (٢٠) قری پایه

نسخه‌سی ١٠ باره‌در | هفت روژا جارکی‌دردکفه ژبرخوش بوراندن وعلماندنا صنعت ومعرفتی‌یه | یکاوی ١٠ پاره

١٢ شباط سنه ٣٢٤ | کردلری تحصیل علوم وفنونه وحسن آمیزشه تشویق ایچون هفته‌لق ترکجه کردجه غزته‌در | ٥ صفر سنه ٣٢٧

## مداهنه

مداهنه ابنای جنسنه صفوت ، اخوت ، سلامت وحسن نیتدن عاری اوله‌رق حسن معامله کوسترمك ، حقیقی جهل برزاکت فدا ایتمکدر.

مداهنه ، اخلاق اوزرینه اولان سؤ تأثیری جهتیله پك مدهش برآفت اجتماعیه‌در . مداهنه‌یی تمامیله آکلامقله نتایج وخیمه وتأثیرات الیمه‌سنی کشف وادراك ایده‌بیله‌جکمزدن اعماقه‌قدر تحلیل وتشریح ایدمم .

اختلاط ومحادثه‌ده مداهنه‌ت سوء الاحکام حرالوجدان برینه بر سؤال ایراد ایتدیکمزده جدیت طبعنه تبعاً حقیقتدن باشقه هیچ بر شیئی آرامیه‌رق حق مخاطبی کندینه خصم ایده‌جکی بیله بیله دوشوندیکی کبی عینی سؤاله معروض اولان دیکر برینك ایسه صرف مخاطبه خوش کوروتمك ایچون حقیقتی تمامیله تحریف ایده‌رك جواب ویردیکنی کوریورز ؟ ایشته بوبر مداهنه‌در . بوخسته‌لغك مع التأسف بوکون بوتون حکم ودهشتیله شرقده حکمفرما اولدیغنی اعتراف ایتملی‌یز .

واقعا حریت وجدیت وجدانیه‌یی محافظه ایله برابر مخاطبك دخی قلبنی قیرمامق ، اوتاندیرمامق صورتیله حقیقتی درمیان ایتمك نزاکتی هرزمان ، هریرده مقبولدر شوشرط ایله که حقیقت هیچ بر زمان بونزاکته فدا ایدیلمه‌ملیدر . التزام خشونته کیرقلوبدن ـ ممکن اولدیغی تقدیرده ـ التزام لطف وملایمتله مخاطبی تطییب مع مافیه ینه حقیقتی بیان واوصورتله‌ده حیثیت شخصیه‌یی محافظه ایدیلمك شایان تقدیر برقدرت اولوب عالم سیاسیاتده محبت عمومیه‌یی مظهر اولمش ، اشتهار ایتمش اصحاب اقتدارهپ بویولسالك اولمقله نائل آمال اولمش داهیلردر .

حالبوکه شرقده حالا بومسئله کرزده قالمایوب تربیه درجه‌سی یکه‌رك ویاده جمسی بولیور ، اخلاق عمومیه‌مزی افراد ، بزی معروض درکهٔ هلاك ایدییور .

مداهنه ، ریا ، تملق تبصبص شرقده فطری اولمایوب کسبی ایسه‌ده طبعمزده اوقدر تمرکز ایتمشدرکه کندمزبیله اونك بزده فطری یا خلقی اولدیغنه حکم ایده‌جکمز کلیور ایسه‌ده عارضی اولدیغنه تاریخده پك بویوك مثاللرمز واردر .

حضرت فاروقك منبرده جیقوب نطق عامت‌سنده اکربك کوروب حس ایدرسه‌کز اخطار ایدیکز ] خطابنه قارشی برعربك قیامو [ یاعمر ، سنده اکربك کورسه‌ك قلیجمزله دوغریلته جغز ] دیه جواب ویرمسی بزده‌کی جدیت قول وعمله وبرهان بلیغ دکلیدر !

شایان تأسفدرکه ، بزیله بوکون ـ بوکبی روایات موثوقه تاریخیه‌یی ـ موضوع صانوب ایناعمق ایستمامکده یز . بوده بزه یوکله‌دیلمش اولان یارتقیل ذلواستبدادك تضییق شدید تحملفرساسی نتائج مضرمسیدر . جونکه آزاده قید اسارت اولان قوم ، عزت نفسی کوزه‌ده‌بیلیر وعزت نفسی کوزه‌دن ایسه حریت وجدانیه وجدیت طبیعیه‌سنی محافظه مجبوریتنده بولونیر . عزت نفسی قیرلمامش ، حریت وجدانیه‌سنه مجبور اولان قومه ایسه حکومت متبوعه‌سی‌ده بالضرور اظهار عدل واستعمال رأفته مکلوم بولونیر .

محکوم ذلواستبداد اولان برقومك مسکنتی کندیسنده کوریلان علت ریا ومداهنه‌نك درجهٔ تأثیریله متناسب اولور . بوکون هرفردمزك رهبر اعمالی درجه‌سنده اولان رزیله ریا ومداهنه اوله‌رق نزاکت وحسن مباشرت نام ورنکنی آلیورسه‌ده ینه جسم اجتماعیمزی محکوم درکهٔ انهدام وکاشانهٔ عمرانمزی معروض ورطهٔ انهدام ایتمکده‌درهیئت اجتماعیه‌نك یکدیکرینه قارشی مجبوری بولوندیغی وثوق واعتمادی محوایدیور ، هپمزی یکدیکرمزدن تفریق ایتدیرییور . یکریکرمزك نصح وپندینه ، القاآت خیرخواهانه‌سنه قولاق ویرمامك لزومنی احساس ایتدیرییور ؛ بوصورتله سبب یگانهٔ تعالی اولان رابطهٔ اتحادمز ، حصن تعاضدمز قیریلوب خراب اولیور جونکه برهیئت آراسنده محبت اوهیئتك یکریکره وثوق واعتمادیله حاصل اولور.

~~بیرونده ایجون اونلیان ایکی شخص هیچ برو جهله~~ سویشه‌ماز وسویشه میانلرده هیچ بر شیده عقد رابطهٔ اتفاق ایده‌مزلر . مابعدی‌وار

صالح بدرخان

---

## احرار بودره‌لی برمستبد افعی

نجم الدین ملا

نجم الدین ملا . . ایشته بر اسم‌که تلفظی هر صاحب ناموسی تترەتیر . نجم الدین ملانك اسمی آکیلدقجه هرصاحب حیت قلبنی بویوك بر نفرت استیلا ایتدیکنی حس ایدر .

نجم الدین ملا استبدادك الك فعال خادملرندن سرایك الك خونریز ، الك صادق بندکانندن‌ایدی:

معین ظالمك دنیاده ارباب دنائتدر
کوپکدر دوق آلان صیاد یی انصافه خدمتدن

بوکون وقتیله مقتل مظلومین اولان یاب ضبطیه بودرومارینه آتیلان قاتل نجیب ملحمه‌نك یاماش شناعتی اولان نجم الدین ملانك داخلیه ناظر سابقی حقی بك طرفندن بغداد کبی مهم برولایته انتخاب وتعیین اولنماسی ، اویادکارك ده بلامانع قالقوب کیده‌بیلمسی مشروطیت مبجله‌مز ایچون واجب الازاله برلکه دکلیدر ؟

محترم برمبعوث کچن کون مجلس مبعوثانده

نه بت خوشيا كسى نامينت خليك زار دبن خليك هندو دكوژن دبت سبيا خسارا آخرت و دنيايى زاروك ژنك زار وپريشان دبن. نيارى حتامرى نيارى دبت .

زبر فن حالى خراب جفا كتبى ژ آلى بى خودى هاتنه آرى كاريى امر دكيت . اطاعت كرناف امرى لسرمه فرضه دف فى امرى توجارا ام زبير نكن وكى آرى كرن لساف خلكيده. هياسه و هوة سال پريشانى غربى فقيرى زليلى كوشتن نه دبى مالا خلكى خراب نه دبى . حدى ژخودره بكن آزادى كن دستى مده . باش نهو آرى كرن و تفاق خوشترى دبت دف ام حى قدرى فى آزادىيى بزانين آرى هندو بكن نه بيژن اف ارمنىيه اف قتولكه .

فرق نكن هون حى مروف ولاط كته لساف ودە دائما تفاق وآرى كرن هبت وكى هون هرآرى هندو بكن ولاطى ده بى شك حتا قيامتى معمور .و مسعودبت ظلم واستبداد توجا نابيت ژارى وفقيرى نامينت وكى تفاق و آرى كرن ناف پينا و دبت صنعت ومعرفت ژى وى حاصل بيت هون حى ژى دولمند بين محتاج كسى نابن فى حاجى سائى هبت آرى كرن هر آرى كرن تفاق هرتفاق .

فى جا ام بچكى ژى بحثا سبيا آرى كرنى بكن كا آرى كرن چاوه حاصل دبت .

وك از زانم كس مالى كسى نخوت كس تعدابى لكسى نكت كسى دلى كسى نشكينت كى مروف دورى استبدادى مالى يكى خواربت يان حقى وى بدت يان دلى وى جيكت داو حقى لى حلال بيت دلى خوده نيارى نه هيت جفا قنجى ژدست مروف بيت آرى كاريا هندو بكيت امرى خودى وپيغمبر قانونا عثمانى توجا ژير نكيت ولى اطاعتى بكين ديك دل وجان بن

دف ام بحثا ارى كرنا عمومى ژى بكن ام قنج بزانن تفاقا عمومى ژمره فرخه كسى نه بيژه اف تركه كسى نه بيژه اف عربه كسى نه بيژه او ارنوده كس نه بيژه اف چركسه كس نه بيژه اف لازه كس نه بيژه اف بوشناقه كس نه بيژه اف فلهيه بيژمن ام حوبرانه آرى كاريا فان حيا بكيت حى ملت بى ناف عثمانيده خوبى تفاق و محبت بين كنكى يك دوملتا خو دان آليكى استبداد وپريشانى ظلم وتعداوك برى مهحيا خراب وژار بكيت . زبر فى سببى تفاق هرتفاق حتى ماقيقوكى تفاق هبت توفيقا خودى ژى وى هر هفالبت .

لاوى امير بدر خان

امين عالى

## الكردستانى جى هنه

بلى ولاطى خوه بجوينين : پرابدنهو . كلك مردن كرد هنه خوندايى وژيهاتينه . عمرى خوه لغربتا بورانده . حى تشتا وزانن . ابكى زوان ولاطى يه خوه ده خبرك ريكن . بخو ازن ويدرى . اوى بجه . فكره جهمعدن هنه لساو ولاطده صرف دبه . ابى نهوره امتيازاوى بخوازه وبدست دراينياوى تنه بكه . ژوى ژى فنداه مزن أوه پره بن ولاطيا لولاطده اى بينه . زارين كرواژى اين لولاطه ايشا بينين . ايدى خوه تاويژن غربتا . فابن اسيرى نه توا .

باشى ژى اى روژكيى . دولتى وانحيا جيكه . هر آلى يه ولاطوى شمندوفر بجتى .

مثلا نهولوانى فابريقهك با آرى ويا قانى جيكن. نيزيك وانداژى معدنىكورى بيتن . بشغلينن. پزحفه زحماوى پزى قاشاجيكن . شونا قانى جلين خوهژدر بينن بكرن . هندەپره بدن . هونى هربازى خوه بفروشن . ژوى فانداوهيى بيه . زاروين زارايى دزكون دشتى كياهن بوبايى ويك بدن بفروشن اوژى ژوى اى پرابدنهو . ميرين بى شغل اين لوان فابريقا بشغلن تغقاروژا خوهوى دريخن . وبلكى زيده دريخن . روژكيى بين خوى مال ونوال . كنجى هونى لويدرى بقنج بفروشن هونى قاشىهوكى تنهوادنان زيكرنده اوحى فاندهيى ونهكى ولاطيا بزمانكى هند كدهدولمند دكن.

هن عردى ولبط نهاى چاندنى يه لى پاوامزن فى چاندن وقنج بحصول دده . عردى ئاو فرات و دجلهيى . عردى جزيرهوه قابلى زراعتى يه . زعردى توالانيل چتره. لى چاندنى ژى قنج ژاتى. بصادتن برى دكرن . دوى ام وان عادتا بردن . نهو عادتن قنجوفاندهنه . اموان بكبدن وچاندنى ولى بكن . هنكه حكه نهو لسرى صداده بت بى لسرى صدا بجى بيت .

بحيا حكومت ژى كنكى وى بيت بيراخوه لولاطى كردانژى مكتبن صنعت وچاندنى وكت . هكه دولتى مكتب لواندراوه كر . كوچه ژى بعلماندنا . چاندن كلك بيا . هنكى فنداحكومتى زولاط ژنهو زيدهتر ، كلك زيدهتر نهدبى .

بوى كيرهژى اوابشن مهكوتى ، بى آرى كاريا حكومتى نابت . دوى دولت آرى كرد ابكت . هنكى اوحى اىبين وقنج بجبين .

## ولاطى دوى چاوه بن

برى چند روژكى عبداه ذهدى بك خوبى يكى فرنهيى : بانكليزكى خون قلم خورت شتنليه . انكليزى كوتيه :

« هكه مروه بوى خرابى ژيژاراد كوت وولاط

ترقى بكى . برى حيادوى هنى ولاطيا توبيه بكن ومزن بكن انكليز بيابورنى خوهيى شرىناوداته لنا ودولتاده ژحيا خورترين . اودولتا خورت ومزن ژيابورنى خوزيده پشتاخوه بهنى خلكى خوه قايم دكت و بهنى وان سر بلند دبت . اين ايشى وى دولتى جيد كت . بىچاو لايتى وى وه دكت ودده جيكرن حى هنى خلكى وچاو وكرينا خلكى وينه . لويدرى وكى ناظرك زوان روتينه مزلا ايشى خوهده دوشغله دزانهكى چوى خلكى حيا لسروى وكرى يه . ده ايدى يكى هولىبزانه كو حى خلك بهشن وچاودانه سرحركتن وى . توجا دكاره تشتى خراب بكه . او ييكاهتا مزن زوى دولتا خورت ومزن تنيرهيه . خلكى دولتا فرانسز كلك مروين بلزن ، ژتشتك تجك خوه دين دكن ، ژهنى خورت پتريى لزبينه دكهون . خرايين هاتى سرى وى دولتى حى زويكى بى لى اوان ژى اوخرابى لخوه دى وزانى .

دست هلاتيى ، شغلين دابردن . ريك قنج وفاندهبكرنى . نهوايدى ژحى تشتاره قنج فكر دكنى . بىخبرى ناكهون . برنهويك زوانى قنج بيژه ، آن قنج بنويسه ادبى ژاخربيا ناظرك دشتقل ، ونوپسى . حا اوخلك لهود كهتى ، تيكلهودبين . ناظريى خوهخى دكهارتى . نهونه ومه . كىبوى وكهدوى ابيژهه دنويسهاوژى كوهددنى . هكه خبرى دى راستبت دبژن راسته. ژدولتاخوهوى تشتى دخوازن . هكه نه وانخبر بشتوه داويژن وكوه نادنى .

دولتا آلمانيايى ژى دولتكى ژقنجياخلكى خوه وژبلنديا حكومتا خورهكلك دشنفه . وى دولتى هرهنى خلكى لسرمرانىيه ولسرعسكرتىيه خوبى كريه . مروان بينه دبيژهف حى عسكرن . قوماندارىرانژى حكومته. لىنهواوژى سرخووه هانن . ژانينكى مرانى تى ايشناكه . خوهبهش كرن ، دا ايش برانىيه ژىنبت بكاريى بكن . ايدى هون عثمانلىژى عثمانجىحش وحكمتىنه . دوى هونهردست هلبنن . بيژن بشقلن واهنى ولاطىيه خوه روخابى بكن . قنجى وخرابىيه ژانين . برمانكى سيس كوندى وبازارى بزانن .

باشاوى هيه

---

## اعلان

اخوت مطبعه‌سنده بودفعه طبع اولنان كتابلر

| | |
|---|---|
| ( نخبةالفكر ترجمسى ) | اصول حديثدن |
| ( بيك ايكيوز حديث شريف ) | كتب نادره‌دن |
| ( روض ورد ) | اسماء حسنا شرحى |

هر برى اوچر غروشه‌در .

احدثريا : [illegible] مطبعهٔ اخوت

دمـــیر بـــاش، بەگلـــەر، نەوتچـــییەکان، یـــدی قزلـــر، تەپـــەی مـــەلا عەبـــدوڵلا، گڵچییەکان)[٧٩].

**٢- گـەڕەکی بەگلـەر:** لـە گەڕەکـە کۆنـەکانی بەشـی قۆریەیـە. هـەر لـە ناوەکەیەوە دیارە کە دانیشتوانی بەگەکانی کۆمەڵگەی کەرکوکی و کاربەدەستە گـــەورەکانی تـــورکی عوسمانییـــە[٨٠]. ئـــەم گەڕەکـــە بـــە تەنیشـــت گـــەڕەکی (شاطرلو)ەوە لە باکوور و گـەڕەکی صـاری کەهیـە لـە باشـوورەوەیە. لـە کۆڵانـە بەناوبانگەکانی: (ئیمام عەباس، ئاغالار، هرمزلولەر، تـەعلیم تەپـە، سـەیید خضـر ئوجاغی، شام تورلو، زورناچیلەر)[٨١].

**٣- گەڕەکی صاری کەهیە:** گـەڕەکێکی کۆنـە، زیـاتر شـیمانەی لێـدەکرێت کاتی خۆی گوندێك بوو بێت لە نزیك شار و بە تێپەڕینی رۆژگار، لە نیوەی دووەمی ســـەدەی هەژدەهەمـــدا، کەوتبێتـــە نێـــو ســـنوورەکانی شـــارەوە. زۆرینـــەی دامودەزگاکـانی حکومـەتی عوسمـانی و دواتـریش داگیرکـاری (١٩١٨-١٩٢٠) و ئینتیـدابی بریتـانی (١٩٢٠-١٩٣٢) و دەوڵـەتی عیراقـی (١٩٢٤-١٩٥٨) لـەم سـێ گەڕەکەدا: (شاطرلو، بەگلـەر، صـاری کەهیـە) بەڕێوەچـوونە. بۆیـە بـێ هـۆ نییـە رێژەی زۆری دانیشتوانی ئەم گەڕەکانـە لـە چینی خانـەدان و زەنگـین و بنەماڵـە دەسترۆیشتووەکانی شار بوونە. بنەڕەتی نـاوی گەڕەکەکـە دوو وشـەی تورکییـە، کە بە مانای (زەردە کەهیـە) یـان (کوێخـا زەردە) دێـت[٨٢]. بۆچـوونێکیش هەیـە پێیوایە ناوەکە لە ناوی دامەزرێنەر و ئاوەدانکەرەوەی گەڕەکەکـەوە هاتبێـت کـە (محەمـەد پاشـای صـاری کەهیە)یـە و لـە رۆژگـاری خۆیـدا سـەرکردەی گشـتی و فەرمانڕەوای سەربازیی ناوچەی کەرکوك بووە، دواتر لە ئەنجامی شیاوبوونی، لە نێـــوان ســـاڵانی (١٦٥٨-١٦٦٨)دا، بـــووە بـــە والی کـــەرکوك[٨٣]. لـــە کۆڵانـــە بەناوبانگەکانی ئەم گەڕەکـە: (جنچیلەر، سـوکوتلەر، گاوربـاغی، سـەیید جیهـاد، جریت مەیدانی)[٨٤].

**٤- گـەڕەکی خاصـە:** گـەڕەکێکی دیـاری شـاری کەرکووکـە و لـە گەڕەکـە نوێیەکانە، تا ساڵانی پەنجاکان لە شێوەی گـەڕەکێك دەرنەکـەوتووە. دەکەوێتـە بەرامبەر قەڵا لەو بەری چـەمی خاسـە و هاوسـنوورە لەگـەڵ گـەڕەکی بەگلـەر لـە رۆژئاوادا. ناوەکەی لەوە هاتووە، کە ئەو ناوچـەیە کـاتی خـۆی بەشـێك بـووە لـە

موڵکە تایبەتەکانی سوڵتانی عوسمانی (الاملاك الخاصة للسلطان العثماني)، لە ڕۆژگاری ئەمڕۆدا هاوواتای زەوییەکانی ئەمیرییە[٨٥].

**٥- گەڕەکی ئەڵماس:** پێشتر شوێنەکەی دارستان بووە و ئینجا بووە بە بەشێك لە گەڕەکی شاطرلو. بەڵام لە دواتردا بە هۆی فراوانبوونی، لە ساڵانی لێکۆڵینەوەکەدا، بە وردیش لە پەنجاکانی سەدەی بیستەم، وەك گەڕەکێکی سەربەخۆ مامەڵەی لەگەڵ کراوە. گەڕەکی ئەڵماس دەکەوێتە بەشی ڕۆژئاوای گەڕەکی (شاطرلو)ەوە، کە گەڕەکێکی پەڕگەی شار پێکدەهێنێت. ناوەکەی وەك (جەمال بابان) دەڵێت: لە ناوی ئافرەتێکەوە هاتووە، کە پێدەچێت خاوەن موڵك و دەستڕۆیشتوو بووبێت لەو شوێنەی دواتر گەڕەکەکەی لێ پەیدا بووە[٨٦].

**٦- گەڕەکی نەوتی کەرکووك:** لە سییەکانی سەدەی بیستەم وەکو ناوچەیەکی ئاوەدان دەرکەوت، لە پەنجاکان بە گەڕەکێك لە گەڕەکەکانی شار لەقەڵەم درا. لە ناوەکەیەوە دیارە کە تایبەت بوو بە کاربەدەست و کرێکارانی نەوتی کەرکووك. ئەم گەڕەکە زیاتر بە (عەرەفە) ناوی دەرکردووە، کە کۆمپانیای نەوتی عیراقی سنووردار *(IPC)* بۆ کارمەندانی نەوتی کەرکووك لەسەر شێوازی نوێ بنیاتی نابوو[٨٧].

**٧- گەڕەکی تسن (تسعين):** ئەم گەڕەکە لەسەر داروپەردووی گوندی تسن دروست بوو، بە (ینکی تسن)ش (تسنی نوێ) ناوی دەبردرێت، لە دووەم سەرژمێریی فەرمی (١٩٥٧)دا، وەك گەڕەکێکی شاری کەرکووك مامەڵەی لەتەك کراوە. گەڕەکی تسن دەکەوتە ئەوپەڕی باشووری ڕۆژئاوای شاری کەرکووکەوە. دانیشتوانی لە چینی ناوەڕاستی کۆمەڵگەی کەرکووکی پێکدەهات. دەربارەی بنەڕەتی ناوەکەی بیر و بۆچوونی جۆراوجۆر هەیە، لەوانە: دەگەڕێتەوە بۆ بوونی نەوەد ئیمام لەم ناوچەیە، لەبەر ئەوەش عەرەبەکان بە مەبەستەوە بە (تسعين) ناوی دەبەن، یان ناوی تیرەیەکی تورکمانییە یاخود ناوەکە مێژوویەکی کۆنی هەیە و دەگەڕێتەوە بۆ ناوی کاربەدەستێکی ناوچەکە کە لە سەردەمە کۆنەکانی مێژوودا فەرمانڕەوایەتی کردووە[٨٨]. لە شوێنە دیارەکانی گەڕەکی تسن: (سلطان ساقی، صونا کولو، جیملیلەر، قاب قیران، جکلیر، قرە مریم، قابسی، شیخلەر،

حمزلی[*]..). کۆڵانە بەناوبانگەکانی ئەم گەڕەکە: (سفر ساقی سوقاقی، قیز باشی، اسلان باسان، ولی جین، افندی باغی)[٨٩].

**٨- گەڕەکی مەحەتە:** گەڕەکی مەحەتە لە گەڕەکە نوێیەکانی شاری کەرکووک بوو، لە دوای راکێشانی هێڵی شەمەندەفەری (بەغداد - کنگربان) بۆ شاری کەرکووک و تەواوبوونی لە ساڵی (١٩٢٥)دا، شار و ناوچەکە پەرەسەندنی نوێی لێ هاتە ئارا[٩٠]، یەکێك لەو پەرەسەندنانە گەشەکردن و ئاوەدانبوونی ناوچەیەك بوو لە رۆژئاوای گەڕەکی تسن بەناوی (حمزلی)[٩١]، کە وێستگەی شەمەندەفەری لێ دانرا، بۆیە دواتر بە گەڕەکی مەحەتە ناسرا. ئەو گەڕەکە وردە وردە ئاوەدان بۆوە تا کۆتاییەکانی ساڵانی چلی سەدەی رابردوو، ئینجا لە پاڵیدا گەڕەکێکی دیکە دروست بوو بەناوی مەحەتەی نوێی کەرکووکەوە.

**٩- گەڕەکی دادچی:** گەڕەکێکی نوێی کەرکووك بوو، لەبەر ئەوەی شوێنی دادگا لەو ناوچەیە بوو بۆیە ناوی (دادچی) بەسەردا بڕا، کە بە تەنیشت گەڕەکی صاری کەهیەوە بوو. ئەم گەڕەکە لە پەنجاکاندا، وەکو گەڕەکێك پەیدابوو[٩٢]، بەڵام لە رۆژگاری ئەمڕۆماندا بوونی نییە، چونکە دادگا لەو شوێنە نەما و گواسترایەوە و گەڕەکەکەش لەگەڵ صاری کەهیە لێکدرا.

بەشی قۆریە، وەك لە پێشەوەدا ئاماژەی پێدرا، بە ماوەیەکی پێوانەیی و لە ئاکامی چەند هۆیەکی تایبەتەوە ئاوەدانییەکی گەورە و فراوانی بەخۆوە بینی. گەشەکردن و گەورەبوونی ئەم بەشەی شار لە رۆژگاری پاشایەتی لە عیراقدا (١٩٢١-١٩٥٨) بەرچاوانەتر دەرکەوت. چونکە بە هەمان شێوەی رۆژگاری عوسمانی، لە قۆناغی داگیرکاری و ئینتیدابی بریتانی و دواتریشدا، شوێنی جێگیربوونی دامەزراوەکانی دەوڵەت بوو. هەر لە بینایەی موتەسەرپیفیەت و بنکەی تیپی دووەمی سوپای عێراق و فرۆکەخانە و وێستگەکانی گواستنەوە و گەیاندن و خانەی پوول و پۆستەوە بگرە تا هۆیەکانی کات بەسەربردن وەك سینەما و قاوەخانە بەناوبانگەکان و باخچە گشتییەکان. بۆیە ئەم بەشەی شار ئاڵوگۆڕێکی گەورەتر و گەشە و نەشونماییێکی زۆرتری بەخۆوە بینی لە ماوە مێژووییەکەی لێکۆڵینەوەکەدا. بە پێی سەرژمێریی ساڵی (١٩٤٧) ژمارەی گەڕەکەکانی قۆریە بریتییە لە سێ گەڕەك، کە ژمارەی کۆشك و خانووەکانی

خـۆی داوە لـە (٢٥٦٠) خـانوو، ژمـارەی دانیشتوانیشـی گەیشـتووەتە (٣٤٤٣٨) کەس، یان هاوتا بە (١٣,٤) کەس بۆ هەر خانوویەك. بڕوانە خشتەی ژمارە (٥).

**خشتەی ژمارە (٥)**

**پۆلێنکردنی گەڕەکەکانی قۆریە بەپێی چۆنیەتی خانووەکان و چڕیی دانیشتوان لە ساڵی (١٩٤٧)دا[٩٣].**

| ژ | ناوی گەڕەك | ژمارەی دانیشتوان | کۆشك و خانووی یەك خێزانی | | زیاتر لە یەك خێزان لە خانووێکدا | | |
|---|---|---|---|---|---|---|---|
| | | | ژ. خێزان | ژ. کەس | ژ. خانوو | ژ. خێزان | ژ. کەس |
| ١ | صاری کەهیە | ٢١٥٠٥ | ٨٩٥ | ٤٩٤٨ | ٥٧٢ | ٢٥٦٨ | ١٠٨٨٤ |
| ٢ | بەگلەر | ٨٦٠٣ | ٤٧٢ | ٢٥٤٤ | ٢٤٩ | ١٣٧٠ | ٦٠٢١ |
| ٣ | شاطرلو | ٤٣٣٠ | ٢٥٦ | ١٤٠١ | ١١٦ | ٥٩٣ | ٢٧٩٨ |
| **کۆی گشتی** | | **٣٤٤٣٨(*)** | **١٦٢٣** | **٨٨٩٣** | **٩٣٧** | **٤٥٣١** | **١٩٧٠٣** |

لە خشـتەکەدا، وەك دەرکـەوتووە، ژمـارەی یەکـەکانی نیشـتەجێبوون لەگـەڵ ڕۆژگاری پێشووتر گۆڕانی بەسەردا نـەهاتووە، هـەر وەکـو خـۆی بـە سـێ گـەڕەك ماوەتـەوە. بـەڵام لـە ڕووی ئاوەدانییـەوە، بـە بـەراورد لەگـەڵ ئـەو ڕۆژگـارەدا، پەرەسەندنێکی زۆری بەخۆوە بینیوە. باڵەخانە و خانوویـەکی زۆری تیـادا بنیـات نراوە، کە خۆی داوە لە (٢٥٦٠) خانوو. بە گـوێرەی خشـتەی سـەرەوە، لـە کـۆی گشتیی ژمارەی خانووەکانی بەشی قۆریە، ژمارەی ئەو کۆشـك و خانووانـەی یـەك خێزان بە شـێوەیەکی سـەربەخۆ تیایـدا دەژیـن، بریتییـە لـە (١٦٢٣) خـانوو، کـە (٨٨٩٣) کەسـی لـەخۆ گرتـووە یـان هاوتـا بـە (٥,٤) کـەس بـۆ هـەر خانوویـەك. هەروەها ژمارەی ئەو خانووانەی لە لایەن زیاتر لە یەك خێزانەوە بـەکاردەهێنرێت، بریتییە لە (٩٣٧) خانوو، کە (١٩٧٠٣) کەس ژیانیان تیایدا دەگوزەرێنن یان هاوتا

بە (٢١) کەس بۆ هەر خانوویەك. ئەوەش بەرزترین چڕیی دانیشتوان پێکدێنێت لە سەرتانسەری شاری کەرکووکدا.

لە رووی بایەخ و خواستی نیشتەجێبوونەوە، وەك لە خشتەی ژمارە (٥)دا دیارە، بەر گەڕەکی صاری کەهیە کەوتووە ئینجا گەڕەکی بەگلەر. خاڵی بەهێزی راکێشانی دانیشتوان بۆ ئەو گەڕەکانە بۆ ئەوە دەگەڕێتەوە کە ئەو گەڕەکانە، بە تایبەت صاری کەهیە، مەڵبەند و چەقی ئاوەدانی بووە و خودان باخچەی گشتی و ناوچەی سەوزایی و نزیك وێستگەی شەمەندەفەر بووە. بەپێی خشتەی سەرەوە ژمارەی ئەو خانووانەی یەك خێزانی تێدا دەژیت لە گەڕەکی صاری کەهیە، بریتییە لە (٨٥٩) کۆشك و خانوو، کە (٤٨٤٩) کەس تیایاندا نیشتەجێن یان بەرامبەر بە (٥,٦) کەس بۆ هەر خانوویەك. لە کاتێکدا ژمارەی ئەو خانووانەی کە لە لایەن زیاتر لە خێزانێك بەکاربراوە هەر لە هەمان گەڕەکدا بریتییە لە (٥٧٢) خانوو، کە ژمارەی دانیشتوانیان گەیشتووەتە (١٠٨٨٤) کەس یان هاوتای (١٩) کەس بۆ هەر خانوویەك. لەم راڤەکارییەوە ئەوە روون دەبێتەوە کە نیشتەجێبوون لەم گەڕەکە خواستێکی زۆری لەسەر بووە بە بەراورد بە گەڕەکەکانی دیکەی شار.

هەر بە گوێرەی زانیارییە تۆمارکراوەکانی سەرژمێریی ساڵی (١٩٤٧)، دەردەکەوێت کە زۆرترین دامودەزگاکانی حکومی بەر گەڕەکی صاری کەهیە کەوتووە. لە دوای ئەویش گەڕەکی (شاطرلو) دێت. هەرچی گەڕەکی بەگلەرە تاکە دامەزراوەیەکی حکومی تێدا نەبووە. سەبارەت بە دامەزراوە ئەهلییەکانیش، ئەوا دیسان گەڕەکی صاری کەهیە پشکی شێری بەرکەوتووە و زۆرترین دامەزراوەی ئەهلی تێدا بووە. لە دوای ئەویش گەڕەکەکانی (شاطرلو) و (بەگلەر) یەك بە دوای یەك دێن. دامەزراوە ئایینییەکانیش لەم بەشەی شار بەرجەستەبوونی خۆیان سەلماندووە، کە لەو رووەوە گەڕەکی (شاطرلو) بە پلەی یەکەم دێت و زۆرێك ژمارەی دامەزراوەی ئایینی تێدا بووە. ئینجا گەڕەکی (بەگلەر) و گەڕەکی (صاری کەهیە) دێن[٩٤].

دوای تێپەڕبوونی تەنها (١٠) ساڵ بەسەر سەرژمێریی (١٩٤٧)دا، لە ساڵی (١٩٥٧)دا گۆڕانێکی گەورە لە باری ئاوەدانی بەشی قۆریەدا هاتە ئارا، بەوەی

کۆمەڵێك گەڕەکی نوێ و ئاوەدان دروست بوون، کە ئەم گەڕەکانە بوون: (خاصە، ئەڵماس، دادچی، مەحەتە، مەحەتەی نوێ، تسن، کۆمپانیای نەوت). ئەوەی پێویست بە وتن دەکات چوار گەڕەکە نوێیەکەی دواییان (مەحەتە، مەحەتەی نوێ، تسن، کۆمپانیای نەوت) پێشتر گوند بوون، واتە ئاوەدان بوون، بەڵام دواتر لە ئاکامی گەشەکردنیان کەوتنە نێو سنووری شارەوانیی شارەوە. وەك گەڕەکێکی نوێی شار مامەڵەیان لەگەڵدا کرا. هەڵبەت دیاردەی ئەو گەشەکردنە بەرزەی گەڕەکەکانی بەشی قۆریە لەم ماوە مێژووییەدا، بۆ ئەوە دەگەڕایەوە کە لە ساڵی (١٩٥٢)دا کاری ئەنجومەنی ئاوەدانکردنەوەی عیراق (مجلس الاعمار العراقي) کەوتە بواری جێبەجێکردنەوە و ژمارەیەك یەکەی نیشتەجێبوون لە شارەکەدا دروست کران[٩٥].

ژمارەی گەڕەکەکانی بەشی قۆریە، بە پێی سەرژمێریی ساڵی (١٩٥٧)، بووەتە (١٠) گەڕەك، کە کۆی گشتیی ژمارەی دانیشتوانیان گەیشتووەتە (٧٠٧٣٨) کەس، واتە بە ئەندازەی زێدەبوونی (٩٥,١٪). بەوەش هەموو لۆژیك و ڕێسایەکی گەشەکردنی سروشتییانەی تێپەڕاندووە. بڕوانە خشتەی ژمارە (٦)، پێکهاتەی دانیشتوانی گەڕەکەکانی قۆریە لە نێوان ساڵانی (١٩٤٧–١٩٥٧)دا.

**خشتەی ژمارە (٦)**

**پێکهاتەی دانیشتوانی گەڕەکەکانی قۆریە لە نێوان ساڵانی (١٩٤٧–١٩٥٧)دا[٩٦].**

| ز | گەڕەك | ژمارەی دانیشتوان لە ساڵی ١٩٤٧ | ژمارەی دانیشتوان لە ساڵی ١٩٥٧ | جیاوازیی زێدەبوون (+ ، –) |
|---|---|---|---|---|
| ١ | بەگلەر | ٨٦٠٣ | ١٩٩٠٣ | ١١٣٠٠ + |
| ٢ | صاری کەهیە | ٢١٥٠٥ | ١٦٨١٣ | ٤٦٩٢ – |
| ٣ | خاصە | ... | ١٠٩٠٩ | ١٠٩٠٩ + |
| ٤ | ئەڵماس | ... | ٦٥٥٨ | ٦٥٥٨ + |
| ٥ | شاطرلو | ٤٣٣٠ | ٥٤٧٨ | ١١٤٨ + |
| ٦ | تسن | ... | ٤٣١٢ | ٤٣١٢ + |

| | | | | |
|---|---|---|---|---|
| ٧ | مەحەتە | ... | ٢٩٥١ | ٢٩٥١ + |
| ٨ | دادچی | ... | ١٥٢٣ | ١٥٢٣ + |
| ٩ | کۆمپانیای نەوتی کەرکووک | ... | ١٣٦١ | ١٣٦١ + |
| ١٠ | مەحەتەی نوێی کەرکووک | ... | ٩٣٠ | ٩٣٠ + |
| | **کۆی گشتی** | **٣٤٤٣٨** | **٧٠٧٣٨** | **٣٦٣٠٠ +** |

لە کاتی بەراوردکردنی باری چڕیی دانیشتوانی گەڕەکەکانی قۆریە، لە نێوان ساڵانی (١٩٤٧-١٩٥٧)، دەردەکەوێت گەڕەکی صاری کەهیە پاشەکشەی کردووە بۆ پلەی دووەم، پێدەچێت بەشێکی دیار لە یەکەکانی نیشتەجێبوونی ئەم گەڕەکە خرابێتە سەر گەڕەکە تازە داکەوتووەکانی وەك: (خاصە و دادچی و مەحەتە و مەحەتەی نوێ)، بۆیە ژمارەی ئەم گەڕەکە کەمی کردووە. لە بەرامبەردا گەڕەکی بەگلەر پلەی یەکەمی داگیر کردووە و ژمارەی دانیشتوانی زیادی کردووە بە ئەندازەی زێدەبوونی (١٣١,٣٪). لەم راستییەوەش ئەوە دەسەلمێندرێت، کە گەڕەکی بەگلەر هۆی کێشکردنی بەشێکی زۆری دانیشتوانی شارەکە بووە لەو ماوەیەدا. بۆیە گەڕەکەکانی بەرقەڵا، وەك: (گەڕەکی چای و چقوور و بولاق) بەو رادەیە رێژەی دانیشتوانیان لە سەرژمێریی دووەمدا نزم بۆتەوە. (بگەڕێوە بۆ خشتەی ژمارە (٤)). هەروەها لەبەر ئەوەی گەڕەکی (شاطرلو) گەڕەکی ئەڵماسی لێ جیا کرایەوە، بۆیە زێدەبوونێکی کەم لەو گەڕەکە، لەم ماوە مێژووییەدا، هاتووەتە ئارا. لە رۆشنایی داتا و زانیارییە تۆمارکراوەکانی سەرژمێریی ساڵی (١٩٥٧)دا، روون دەبێتەوە کە پلانەکانی گەشەپێدان و هێنانە ئارای پرۆژە پیشەسازییەکان، بە هەموو جۆرەکانییەوە، لە ساڵانی پەنجادا کاریگەریی قووڵی لەسەر فراوانبوونی قەبارەی تەواوی شارەکەدا هەبووە، کە لە هیچ قۆناغێکی مێژووییدا شاری کەرکووک گەشەکردنی لەم چەشنەی بەخۆوە نەدیوە. لە ئاماژەکانی ئەم فراوانبوون و گەشەکردنەش دروستکردنی چەند شەقامێکی سەرەکی و شوێنی گشتی بوو لە شاری

کەرکووکدا، بە مەبەستی بەستنەوەی گەڕەکە تازەکان بە گەڕەکە کۆنەکان و دابینبوونی کارئاسانی لەپێناو هەڵسووڕاندنی کاروبارەکانی حکومەت و دانیشتوان.

بە شێوەیەکی گشتی باری ئاوەدانیی گەڕەکەکانی شاری کەرکووک، لە سەرژمێریی ساڵی (١٩٤٧)دا، بەم شێوەیە بووە وەك لە خشتەی ژمارە (٧)دا خراوەتە ڕوو.

**خشتەی ژمارە (٧)**

**پێکهاتەی شاری کەرکووك لە سەرژمێریی ساڵی (١٩٤٧)[٩٧].**

| ز | بەشەکانی شار | کۆی ژمارەی خانوو | کۆی ژمارەی خێزان | کۆی دامەزراوە حکومی و ئەهلی و ئایینییەکان(*) | کۆی گشتیی دانیشتوان |
|---|---|---|---|---|---|
| ١ | قەڵا | ٦٦٩ | ١٢٠٢ | ٧٣ | ٥٧٦٤ |
| ٢ | بەرقەڵا | ٢٩٥٣ | ٥٣٧٦ | ٦٧٧ | ٢٨١١٥ |
| ٣ | قۆریە | ٢٨٢٣ | ٦٤٣٢ | ٥٧٨٠ | ١٩٧٠٣ |
| کۆی گشتی | | ٦٤٤٥ | ١٣٠١٠ | ٦٥٣٠ | ٥٣٥٨٢ |

ئەوەی جێی لێوردبوونەوە و سەرسوڕمانیشە، لە هەمان کاتدا، کۆی گشتیی دامەزراوە حکومی و ئەهلی و ئایینییەکانە، کە ژمارەیان لە کۆی گشتیی خانووەکانی شاری کەرکووك زیاترە! ئەم زانیارییە دووپاتەی ئەو ڕاستییە دەکاتەوە کە شاری کەرکووك هەمیشە شارێکی گرنگ بووە سەبارەت بە دەسەڵاتی ناوەندی و هێز و ڕایەڵی دەسەڵاتی ناوەندی باڵادەست بووە بەسەر شارەکەدا. هەروەها بوونی دیاردەی فرەڕەگەزی و فرەئایینی کاریگەری هەبووە لەسەر زۆربوونی ژمارەی دامەزراوە حکومی و ئەهلی و ئایینییەکانی شارەکە و زاڵبوونی بەسەر باری ئاوەدانی لەنێو شاردا، کە هەر نەتەوە و ئایین و ئایینزایەك بە جیا لە یەکتر خاوەن دەزگای ئەهلی و ئایینی بوون. تەنها دامەزراوە حکومییەکان نەبن کە کۆکەرەوەی هەموو لایەنە هەمەچەشنەکانی پێکهاتەی کۆمەڵایەتی کەرکووکی بوون.

## پەراوێز و سەرچاوەکان:

(*) بەشێك لە نامەی دکتۆرا

(١) ماهر النقيب، كركوك وهويتها القومية والثقافية، ترجمه من التركية: حبيب الهرمزي، استانبول، ٢٠٠٨، ص ص٨٣-٨٤.

(٢) بەپێی وتەی سەرچاوەیەك رووپێوی ئاوەدانی کەرکووك لە نێوان ساڵانی (١٨٩٠-١٩١٤)دا، دوو هێندەی پێشووی زیادی کردووە.

S. H. Longrigg, Iraq: 1900 To 1950 (A Political, Social And Economic History), Oxford University Press, Great Britain, 1953, P.53.

(في نسخته المترجمة الى العربية: الجزء الاول، ص٩٧).

(٣) بڕوانە:، ليونهارت راوولف، رحلة المشرق الى العراق وسوريا ولبنان وفلسطين (١٥٧٣)، ترجمة وتعليق: سليم طه التكريتي، دار الحرية للطباعة والنشر، بغداد، ١٩٧٨، ص١٩٨؛ هلكوت حكيم، كركوك في كتابات الرحالة الفرنسيين، في: كركوك مدينة القوميات المتآخية، وقائع الندوة العلمية التي عقدها مركز كربلاء للبحوث والدراسات، لندن، ٢٠٠١، ص١٤٢.

(٤) بڕوانە: موصل ولايتى ايجون ايكنجى دفعه، ترتيب اولنان سالنامەدر، ترتيب ايدن، حسن توفيق، موصل ولايت مطبعەسى، (١٣١٠هجرى/١٨٩٢ميلادى)، ص٢٠٥؛ موصل ولايتى سالنامه رسميسى، ترتيب ايدن، صفوت، موصل، مطبعه ولايت، (١٣٢٥ هجرى / ١٩٠٧ ميلادى)، ص٢١٢.

(*) قۆریە: ئەم وشەیە، وەك (تۆفیق وەهبی) باسی کردووە، ڕەنگە ناوێکی وەسفی بێت بۆ ئەو ناوچەیەی ئەم ئاوەدانییەی لێ پەیدا بووە، کە مانای (نزم) دەبەخشێت. توفيق وهبي بك، الآثار الكاملة، الجزء الاول، (اعداد: رفيق صالح)، السليمانية، ٢٠٠٦، ص٢٥٥.

(٥) گەڕەك: بە یەکەیەکی بنچینەیی دەژمێردرێت لە پێکهاتەی شارەکاندا، کە ڕوخسارەکانی پێکەوە ژیانی کۆمەڵایەتییانەی تێدا دەردەکەون و دەمارگیریی شارنشینیشی لە خانەی خۆیدا کۆ دەکاتەوە. هەموو شارێکی ناوچەکەش، وەك نەریتە، چەند گەڕەکێك دەگرێتەخۆ. هەر گەڕەکێك لە گەڕەکەکانی شار لە شەقامێکی پان و کۆڵانە تەسك و تەنگ و پێچاوپێچەکانی، کە لقی شەقامە گەورەکەن، پێکدێت. ئەم پێناسەیە هەرچەندە بۆ کەرکووك نەکراوە، بەڵام دەکرێ بۆ کەرکووکیش هەمان شت بوترێت. بڕوانە: عماد عبدالسلام رؤوف العطار، الحياة الاجتماعية في العراق ابان عهد المماليك (١٧٤٩-١٨٣١)، اطروحة دكتوراه غير منشورة، مقدمة الى مجلس كلية الاداب بجامعة القاهرة، القاهرة، ١٩٧٦، ص٦٧.

(٦) بە پشتبەستن بە چەند سەرچاوەیەکی هەمەچەشن، بە تایبەت ساڵنامەکانی ویلایەتی موسڵ. بڕوانە: موصل ولایتی سالنامەسی، ترتیب ایدن، مکتوبی ولایت صادق افندی، موصل ولایتی مطبعەسی – (١٣١٢هجری/ ١٨٩٤میلادی)، ص٢٩٩.

(٧) سعدي عثمان حسين، كوردستان الجنوبية في القرنين السابع عشر والثامن عشر (دراسة في علاقاتها الادارية والسياسية والاقتصادية مع ايالتي بغداد وموصل)، الطبعة الاولى، مطبعة سيما، السليمانية، ٢٠٠٦، ص٥١.

(٨) بۆ زانیاریی زیاتر بڕوانە: بەختیار سەعید مەحموود شوانی، کەرکووك لە سەدەی نۆزدەهەمدا (لێکۆڵینەوەیەك لە بارودۆخی رامیاری و ئابووری)، نامەی ماستەری بڵاونەکراوە، پێشکەش بە ئەنجوومەنی کۆلێژی ئەدەبیات لە زانکۆی سەڵاحەددین – هەولێر کراوە، ٢٠٠٨، ل١٢–١٨.

(٩) بڕوانە: صبحي ساعتجي، أحياء كركوك ومعالمها، ترجمة: نصرت مردان، "ميزوبوتاميا" (مجلة)، العددان (٥–٦)، جنيف – بغداد، تموز ٢٠٠٥، ص ٤٠٢.

(١٠) بڕوانە: يوسف شريف، مدن الطرق القديمة وتخطيطها ومبانيها وما حصل من تطور في بعضها، "آفاق عربية" (مجلة)، العدد (١٦)، بغداد، شباط ١٩٧٦، ص٢٢؛ سليم طه التكريتي، مدونات الرحالين عن النفط في العراق، "النفط والعالم" (مجلة)، العدد، (٦)، بغداد، ١٩٧٣، ص٥٥.

(١١) بەڵگەی ئەم راستییە، زۆر بە روونی، لە راپۆرتە جیاجیاکانی شارەوانیی کەرکووك تێبینی دەکرێت، کە ئێستا هەندێکیان لە خانەی کتێب و بەڵگەنامەکانی عیراقی لە بەغدا (دار الكتب والوثائق العراقية)دا پارێزراون. بۆ نموونە، بڕوانە: د.ك.و.ع، الوحدة الوثائقية، وزارة الداخلية، تقارير بلدية كركوك، الموضوع: امور بلدية كركوك، (١٩٣٤/٨/٨ – ١٩٣٩/٦/١٥).

(١٢) بۆ یەکەم جار داڕێشتنی نەخشەکێشانی بنەڕەتی (Master Plan) شاری کەرکووك لە نێوان ساڵانی (١٩٧٣–١٩٧٥)دا بوو، کاتێك نەخشەکێشانی بنەڕەتی شار بەخشرایە دەزگای دۆکسیادیس (Doxiadis) کە حەوت راپۆرتی هەمەچەشنی لەو بارەوە پێشکەش دەسەڵاتدارانی ئەو رۆژگارە کردووە. بۆ نموونە، بڕوانە:

Doxiadis, Kirkuk Master Plan, Final Report, No. 7, December 1975.

(١٣) الملا جميل روزبياني، كركوك في عهد الاستعمار البريطاني والعهود التالية، (ترجمة: انور مندلاوي)، "سردم العربي" (مجلة)، العدد (٢)، سليمانية، خريف ٢٠٠٣، ص119؛ نوري خليل البرازي، البداوة والاستقرار في العراق، القاهرة، ١٩٦٩، ص١٢٨.

(١٤) مؤيد ابراهيم الونداوي، العراق في التقارير السنوية للسفارة البريطانية (١٩٤٤–١٩٥٨)، بغداد، ١٩٩٢، ص١٢٩.

(١٥) محمد هادى الدفتر وعبدالله حسن، العراق الشمالى، بغداد، ١٩٥٨، ص ص٢١٣–٢١٦.

(16) K.M. Ahmed, The Northern Transtigris in the first half of second millennum, M.A. thesis, unpublished, Leiden, 2003, P.52.

(١٧) توفيق وهبي بك، المصدر السابق، الجزء الاول، ص٢٤٧.

(١٨) جليل العطية، قلعة كركوك: أهميتها التاريخية وقيمتها الحضارية، في: كركوك مدينة القوميات المتآخية، ص٦٣٢.

(١٩) موصل ولايتى سالنامه رسميسيدر، موصل ولايتى مطبعەسى – (١٣٣٠هجرى/ ١٩١٢ميلادى)، ص٢٤٤.

(20) E.B. Soane, To Mesopotamia and Kurdistan in Disguse (With Historical Notices of the Kurdsh Tribes and the Chaldeans of Kurdistan),Printed by Oliver and Boyd Edinburgh, London, 1912, P.338.

(في نسخته المترجمة الى العربية: الجزء الثاني، ص ص٩٧–٩٨)

(٢١) درێژیی شەقامی سەرەکیی قەڵا جێی سەرنجی (سۆن) بووە، بۆیە لەم بارەوە ئاماژەی پێداوە بەوەی شەقامێکە بە دووری یەك مایل درێژە.

(في نسخته المترجمة الى العربية: الجزء الثاني، ص٩٨). Ibid, P.338.

(*) جریت: یارییەکی سوارچاکییە، لە دوو تیپی سوار چاك پێکدێت، هەر تیپێك لەوانە هەوڵ دەدات لایەکەی دیکە بە هۆی گۆپاڵێکەوە لەسەر ئەسپەکەی بخاتە خوارەوە. لە ڕۆژگاری عوسمانی ئەم یارییە باو بوو، بەڵام لە سەدەی نۆزدەهەم قەدەغە کرا.

Yeni Turk Ansiklopedisi, Cilt: (2), Otuken, Istanbul, 1985, S.515.

(٢٢) صبحي ساعتجي، المصدر السابق، ص٤٠٣؛ عەلی مەحمود محەمەد، کەرکووك (شاری قەڵا و ئاگر و خوێن، چارەسەر: نموونەی برۆکسل یان بەرلین؟)، چاپخانەی ئارابخا، کەرکووك، ٢٠٠٦، ل١٠٦.

(٢٣) گەڕەکەکانی قەڵا، لەوەتی هەن، تا چۆڵکردنیان لە ساڵی (١٩٩١)دا، بە بیانووی نۆژەنکردنەوە و ڕاگرتنی وەك شوێنەوارێکی دێرین و جێگەیەکی گەشتیاری بەشێکی دیاری شاری پێکهێناوە. نصرت مردان، اغتيال قلعة كركوك، "قارداشلق=الاخاء" (مجلة)، العدد (٦)، حزيران ٢٠٠٠، ص٤٣ .

(٢٤) عبدالرزاق الحسني، موجز تاريخ البلدان العراقية، الطبعة الثانية، سورية، ١٩٣٠، ص١٨٦؛ آنجى طارق، الحنين الى القلعة، في: موسوعة كركوك قلب العراق، جنيف، نيسان ٢٠٠٨، ص١٨٠.

(٢٥) بەشێك لە بینای ئەو كڵێسایە ئێستاش لە قەڵادا ماوە و دەكەوێتە پشت مزگەوتی دانیاڵ پێغەمبەر.

(٢٦) بۆ زانیاریی زیاتر دەربارەی باڵەخانە و تەلارەكانی قەڵای كەركووك، بڕوانە: جرجيس محمد الرملاوي، الابنية التراثية في قلعة كركوك، "التراث الشعبي" (مجلة)، العدد (٢)، بغداد، شباط ١٩٨٢، ص ص١٤–١٧.

(٢٧) صبحي ساعتجي، المصدر السابق، ص٤٠٣–٤٠٤؛ عەلی مەحمود محەمەد، سەرچاوەی پێشوو، ل١٠٦.

(*) گوك گومبەت یان گومبەزی شین،ساڵی (١٩٣٩) بە فەرمی وەك شوێنەوارێكی دێرین ڕاگەیەندرا. "الوقائع العراقية" (جريدة رسمية)، العدد (١٦٨٧)، بغداد، (١٩٣٩/٣/٣).

(٢٨) بەڵگەی یەكلاكەرەوە بەدەستەوە نییە بۆ سەلماندنی ئەوەی ئەو مەزارگانە شوێنی ڕاستەقینەی ئەو كەسایەتییانە بووبێت كە ناومان بردوون. چونكە لە شوێنی دیكەش مەزارگەیان هەیە. لەوانە: مەزارگەی عوزێر پێغەمبەر لە هەولێر، هەروەها مەزارگەی دانیال پێغەمبەر، وەك لە دائیرەی مەعاریفی ئیسلامیدا هاتووە لە (سوسە) لە ئێران. ئەوە بە چاوپۆشین ئەگەر ئەو مەزارگانەی كەركووك بوونیان لە شارەكە ڕاست بێت، ئەوا ئەوە دەسەلمێت، كە قەڵای كەركووك شوێنێكی كۆن و گەورەی نیشتەجێبوونی جووەكان بووە پاش پەرش وبڵاو بوونیان. سترك، مادة (السوس)، في: دائرة المعارف الإسلامية، المجلد الرابع، ١٩٣٤، ص٥٩٤.

(٢٩) آنجى طارق، المصدر السابق، ص ص١٨١–١٨٢.

(٣٠) زين العابدين علي صفر، التجديد الحضري لقلعة كركوك،"المورد" (مجلة)، العدد (٦٩)، بغداد، ربيع ١٩٨٩، ص٧٩.

(٣١) المملكة العراقية، وزارة الشؤون الاجتماعية (مديرية النفوس العامة)، إحصاء السكان لسنة ١٩٤٧، الجزء الثاني، بغداد، ١٩٥٤، ص ص١٠٨–١٠٩.

(*) دوای لێوردبوونەوە، بەپێی ئامارەكان، دەركەوت (٧٤) كەس لە دانیشتوانی قەڵا لە ژێر هیچ جۆرە چەشنێكی نیشتەجێبووندا تۆمار نەكراون. بۆیە لە كاتی كۆكردنەوەی ژمارەكانی خشتەكە ناگەینە ئەنجامێكی دروست و دەقاودەق.

(٣٢) پاش كنە و پشكنینێكی وردیش، وا دیارە سەركەوتوو نەبووین لە دەستنیشانكردنی پێناسێكی ورد بۆ ئەو دامودەزگایانە، بەڵام لە ڕوویەكی گشتگیردا، دەتوانرێت پەنجە بۆ كارخانە و ئۆفیس و شوێنە بازرگانی و ڕۆشنبیری و كۆمەڵایەتییەكان درێژ بكرێت.

(٣٣) مەبەست لە دەزگای ئایینی مزگەوت و تەكیە و خانەقا و هەموو ئەو شوێنانەیە كە سەروكاری ئایینییان هەیە.

(٣٤) إحصاء السكان لسنة ١٩٤٧، الجزء الثاني، ص١٠٨.

(٣٥) الجمهورية العراقية، وزارة الداخلية (مديرية النفوس العامة)، المجموعة الإحصائية لتسجيل عام ١٩٥٧، لوائي السليمانية وكركوك، مطبعة العاني، بغداد، دون سنة الطبع، ص١٥٤.

(٣٦) بە گوێرەی سەرچاوەیەك داهاتی تاكی كەركووكی لە ساڵی (١٩٥٦)دا، بەرزترین ڕێژەی هەبووە لە دوای بەغدادی پایتەخت. بڕوانە: خيرالدين حسيب، تقرير الدخل القومي في العراق (١٩٥٩–١٩٦١)، بيروت، ١٩٦٤، ص ص٤٢٠–٤٢١.

(٣٧) المديرية العامة لارشيف الدولة التابعة لمجلس وزراء الجمهورية التركية، رئاسة دائرة الارشيف العثماني، دفتر التحرير المفصل المرقم (١١١) الخاص بلواء كركوك. وەرگیراوە لە: ماهر النقيب، المصدر السابق، ص ص٨٣–٨٤.

(38) Dr. Mirella Galleti, Report on Kirkuk by Modern European Visitors, in: Kirkuk the City of Ethnic Harmony, First Edition, Karbala Centre for Research & Studies, London, 2002, PP.A1-31.

(في نسخته المترجمة الى العربية: ص ص١٨٧–٢٠٦).

(٣٩) لەم بارەوە بڕوانە: سعدي عثمان هروتي، دراسات اكاديمية في تاريخ كردستان الحديث، عمان، ٢٠١٢، ص ص١١–٨٧.

(٤٠) لەنێو ئەو شاڵاوە سەربازییانەدا، شاڵاوی شا عەبباسی گەورەی سەفەوی (١٦٢٣) و شاڵاوی نادرشای ئەفشار (١٧٤٣) دوو نموونەی بەرچاون لە ڕوودانی زۆرێك كاولكاری لە شارەكەدا. لەو بارەیەوە بڕوانە: الشيخ رسول حاوي الكركوكلي، دوحة الوزراء في تأريخ وقائع بغداد الزوراء، ترجمه عن التركية: موسى كاظم نورس، بيروت، دون سنة الطبع، ص٥٠؛

S.H. Longrigg, Four Centuries of Modern Iraq, Oxford University Press, England, 1925, PP.54, 138. (في نسخته المترجمة الى العربية: ص١٧٠).

(*) نیبور، كە بە بنەچە ئەڵمانییە و لە گەڕیدە پێشەنگەكانی ئەورووپییە، لە نیوەی دووەمی سەدەی هەژدەیەمدا سەردانی ناوچەكەی كردووە. زۆربەی زۆری گەڕیدە ئەورووپییەكانی سەدەی نۆزدەیەم سەبارەت بە كەركووك پشتیان بە ئاماژەكانی ئەو بەستووە.

Dr. Mirella Galleti, Op.cit, P.A6. (في نسخته المترجمه الى العربية: ص ص١٩٠–١٩١).

(٤١) كارستن نيبور، رحلة نيبور الى العراق في القرن الثامن عشر، ترجمه عن الالمانية: د.محمود حسين الامين، مراجعة وتعليق: سالم الآلوسي، وزارة الثقافة والارشاد، بغداد، ١٩٦٥، ص٨٥.

(42) J. S. Buckingham, Travels in Mesopotamia, Vol: (1), Printed by D. S. Maurice, London, 1827, PP.115-116.

(في نسخته المترجمة الى العربية: الجزء الاول، ص ص١٤٢–١٤٣).

(٤٣) نخبة من أساتذة التاريخ، المدينة والحياة المدنية، الجزء الثاني، الفصل الثامن: مدن القلاع، دراسة من اعداد: علاء موسى كاظم نورس، دار الحرية للطباعة، بغداد، ١٩٨٨، ص ص٢٧٢-٢٧٤.

(٤٤) مێژوونووسی ناسراو (عبدالرزاق الحسني)، لە سەرەتای ساڵانی بیستی سەدەی بیستدا، سەردانی شارەکەی کردووە و سەرنج و تێبینی لەسەر گرنگیی شارەکە و خۆشیی ئاووهەوا و پاکی و فراوانی شەقام و جوانی باڵەخانەکانی کەرکووك تۆمار کردووە. بڕوانە: موجز تاريخ البلدان العراقية، ص١٨٧.

(٤٥) بڕوانە: عبدالرزاق الحسني، رحلة في العراق أو خاطرات الحسني، الطبعة الثالثة، المطبعة العصرية، بغداد، ١٩٢٥، ص١٥٢.

(٤٦) بڕوانە: صبحي ساعتجي، المصدر السابق، ص٤٠٤.

(٤٧) جمال بابان، اصول أسماء المدن والمواقع العراقية، الجزء الاول، الطبعة الثانية، بغداد، ١٩٨٦، ص٢٥٠.

(٤٨) موعتەسەم ساڵەیی، ناوودارانی گەڕەکی ئیمام قاسم لە شاری کەرکووك، "کەرکووك"(گۆڤار)، ژمارە (٢٤)، کەرکووك، بەهاری ٢٠٠٥، ل٩٧-٩٨.

(٤٩) نجاة كوثر، بحث حول أسماء الاماكن والمناطق في كركوك، في: موسوعة كركوك قلب العراق، ص١٤٨.

(٥٠) موعتەسەم ساڵەیی، سەرچاوەی پێشوو، ل٩٩-١٠٦.

(*) ئەخیان: دامەزراوەیەکی کۆمەڵایەتییە، لە سەدەی سیانزەهەمەوە لەنێو خاوەن پیشە ئازادەکان و کاسبکاران و بازرگانەکانی ئەنادۆڵ بڵاوبۆوە. دواتر شێوازێکی سەربازییان وەرگرت و لە شەڕەکانی عوسمانی دژی بێزەنتە بەشدارییان دەکرد. سهيل صابان، المعجم الموسوعي للمصطلحات العثمانية التاريخية، من منشورات مكتبة الملك فهد الوطنية، الرياض، ٢٠٠٠، ص١٣.

(٥١) ماهر النقيب، المصدر السابق، ص٨٧.

(٥٢) (جەمال بابان) پێی وایە بنەڕەتی ناوی پیریادی لە ناوی کەسایەتییەکی ئایینییەوە هاتبێت، کە (پیر) واتا شێخ و (یادی) واتا ژیانم، کە دەکاتە (شێخی ژیانم) و گوندێك لە نزیك چەمچەماڵ بە ناوی ئەو کەسەوە کراوە و بەشێك لە دانیشتوانی ئەو گوندە دواتر لە گەڕەکی پیریادی نیشتەجێ بوون و گەڕەکەکەیان بە ناوی گوندەکەی خۆیانەوە ناوناوە. اصول أسماء المدن والمواقع العراقية ، الجزء الاول، ص٢٥٠.

(٥٣) ساڵی (١٩٥٠)، حکومەتی عیراق بە مەبەستی کۆچپێکردنی جووەکان بۆ ئیسرائیل، بڕیاری لێسەندنەوەی ڕەگەزنامەی جوو نەژادەکانی عیراقی دەرکرد. بڕوانە: يعقوب يوسف كورية، يهود العراق (تأريخهم، أحوالهم، هجرتهم)، لبنان، ١٩٩٨، ص ص١٥٥– ومابعدها.

(٥٤) جمال بابان، المصدر السابق، الجزء الاول، ص٢٥٠؛ سمكۆ بەهرۆز، مێژووی سەردەمە کارگێڕیی، ل٧٣.

(٥٥) نجاة كوثر، بحث حول أسماء الاماكن، ص١٤٨.

(٥٦) سمكۆ بەهرۆز، مێژووی سەردەمە کارگێڕیی، سەرچاوەی پێشوو، ل٧٣.

(٥٧) جمال بابان، المصدر السابق، الجزء الاول، ص٢٥٠.

(٥٨) ئەم ناوانە رۆژهەڵاتناسان لێکدانەوەی زۆریان بۆ کردوون و دەیان بەڵگە و سەرچاوەیان لە زمانە جیاوازەکانەوە لەسەر بەراورد کردووە، بەڵام هیچیان بە بنج نەگەیشتوون، بۆیە ئەو لێکدانەوانە پێویستییان بە توێژینەوەی زیاتر هەیە. بڕوانە:

V. Minorsky, Mongol Place – Names in Mukri Kurdistan (Mongolica, 4) in: Bulletin of the School of Oriental and African Studies, University of London, Vol: (19), No. 1, 1957, PP. 58-81.

(٥٩) جمال بابان، المصدر السابق، الجزء الاول، ص٢٥١؛ سمكۆ بەهرۆز، مێژووی سەردەمە کارگێڕیی، ل٧٢. دەبێت سەرنج بۆ ئەوە رابکێشرێت گومان دەکرێت نوێژی جەژن لە دەرەوەی شاردا کرابێت، بەڵکو ڕەنگە نوێژەبارانە بووبێت.

(٦٠) نجاة كوثر، بحث حول أسماء الاماكن.. المصدر السابق، ص١٤٨.

(٦١) جمال بابان، المصدر السابق، الجزء الاول، ص٢٥١.

(٦٢) بهاء الدين نوري، مذكرات بهاء الدين نوري، الطبعة الثانية، اربيل، ١٩٩٥، ص٧٩.

(*) شیرج: پیشەی گرتنی رۆنی کونجییە، کە جووەکانی بەغدا ئەو کارەیان دەکرد، بۆیەش لە شاری بەغداش بازاڕ و گەڕەکێکی بەناوبانگ بەو ناوەوە هەیە. ئەوەی شایانی باسە لەسەر رێی دیبەگە و مەخموور گوندێکیش هەیە بە ناوی شۆریجە.

(٦٣) دوو گوند لە لیوای کەرکووك بەو ناوەوە هەن: یەکێکیان سەر بە ناحیەی قەرەحەسەنە و ئەوی دیکەیان سەر بە ناحیەی ئاغجلەرە. جمال بابان، المصدر السابق، الجزء الاول، ص٨٨.

(٦٤) لە شاری هەولێریش گەڕەکی (تعجیل) بە دوو یەکەی نیشتەجێبوونی جیاواز مامەڵەی لەگەڵ کراوە: (تعجيل اسلام، تعجيل يهود). بڕوانە: هاشم خضر الجنابي، مدينة اربيل دراسة في جغرافية الحضر، الموصل، ١٩٨٧، ص ص٤٥و٤٩.

(٦٥) إحصاء السكان لسنة ١٩٤٧، الجزء الثاني، ص ص١٠٨–١٠٩.

(*) دوای لێوردبوونەوە، بەپێی ئامارەکان، دەرکەوت (٧١٥) کەس لە دانیشتوانی گەڕەکەکانی بەرقـەلا لـە ژێـر هـیچ جـۆرە چەشـنێکی نیشـتەجێبووندا تۆمـار نـەکراون. بۆیـە لـە کـاتی کۆکردنەوەی ژمارەکانی خشتەکە ناگەینە ئەنجامێکی دروست و دەقاودەق.

(٦٦) إحصاء السكان لسنة ١٩٤٧، الجزء الثاني، ص ص١٠٨–١٠٩.

(٦٧) المجموعة الإحصائية لتسجيل عام ١٩٥٧، لوائي السليمانية وكركوك، ص ص١٥٢–١٥٤.

(*) ژمارەی دانیشتوانی گەڕەکی (پیریادی مووسەوی) لێ دەرهێنراوە، کە لە سەرژمێریی ساڵی (١٩٤٧)دا، (١٦٤٦) کەس بوونە.

(٦٨) بڕوانە: فهمي عرب آغا وفاضل محمد ملا مصطفى، ماذا؟ في: كركوك، كركوك، ١٩٥٧، ص ص٤٨–٤٩.

(٦٩) صبحي ساعتجي، المصدر السابق، ص٤٠٦.

(70) E.B. Soane, Op.cit, P.348. (في نسخته المترجمة الى العربية: الجزء الثاني، ص١١١)

(٧١) صبحي ساعتجي، المصدر السابق، ص٤٠٨.

(٧٢) عبدالرزاق الحسني، رحلة في العراق أو خاطرات الحسني، الطبعة الثالثة، المطبعة العصـرية، بغداد، ١٩٢٥، ص ص١٥١–١٥٢.

(٧٣) پردی بـەردین لـە سـاڵی (١٩٥٤) رووخێنـرا و لـە نزیـك ئـەو پردێکـی نـوێ دروسـت کـرا. مراسل، في كركوك: اعمار وتجديد، "أهل النفط"(مجلة)، العدد (٧١)، كركـوك، ايلـول ١٩٥٧، ص٤٤.

(74) J. S. Buckingham, Op.cit, P.116.

(في نسخته المترجمة الى العربية: الجزء الاول، ص١٤٣)

(*) واتە خانووەکان بە پێی لێکۆڵینـەوە و حیسـاباتی ورد نەخشـەکێش کـراون، کـە لـە رووی شـــکڵەوە دووربیـــەکی رێکوپێکیـــان هەیـــە (منتظمـــة الابعـــاد) و لایەنـــەکانی شـــارەوانی سەرپەرشتی دەستنیشانکردنی مـەوقیعیان کـردووە. بـە دەگمـەن لـەو خـانووە نوێیانـەش هەڵکەوتووە حەوشەکەی لە ناوەڕاستی خانووەکەدا بێت، بە پێچەوانەی خانووە کۆنـەکان. ئـەو پەنجەرانـەی دەکەونـە رووی پێشـەوەی خـانووە نوێیـەکان گـەورە و فـراوان و هـەروا باخچە و پارکی ئۆتۆمبێل و سیاجیان هەیە و دەرگایان نزمە.

(٧٥) وجـدي انـور مـردان، مـن دفـاتر ايـام زمـان (زيـارة جديـدة لمدينـة كركـوك القديمـة)، (http://www.alturkmani.com/makalaat/mindafater3.htm)

(٧٦) علاءالدين سجادی، گەشتێك لە کوردستانا، چاپخانەی معارف، بەغدا، ١٩٥٦، ل٧٧.

(٧٧) جمال بابان، المصدر السابق، الجزء الاول، ص ص٢٥٠–٢٥١.

(٧٨) سمکۆ بەهرۆز محەمەد (ئەژی)، مێژووی سەردەمە کارگێڕیی، سەرچاوەی پێشوو، ل٧٢.

(٧٩) نجاة كوثر، بحث حول أسماء الاماكن.. المصدر السابق، ص١٤٩.

(٨٠) (جەمال بابان) تەنها بە رستەیەك دەربارەی گەڕەكی بەگلەر دواوە، بەوەی ناوەكە وشەیەكی توركییە و مانای شوێنی یان گەڕەكی (بەگ) یان (بەگەكان) دەبەخشێت. اصول اسماء المدن والمواقع العراقية، الجزء الاول، ص٢٥٠.

(٨١) نجاة كوثر، بحث حول أسماء الاماكن.. المصدر السابق، ص١٤٩.

(٨٢) جمال بابان، المصدر السابق، الجزء الاول، ص٢٥١.

(٨٣) عصمت حسن رفيق كهية، آل صاري كهية في كركوك، "الاخاء" (مجلة)، العدد (٨٧)، بغداد، ١٩٨٩، ص ص٢٥–٢٦.

(٨٤) نجاة كوثر، بحث حول أسماء الاماكن.. المصدر السابق، ص١٤٩.

(٨٥) جمال بابان، المصدر السابق، الجزء الاول، ص٢٥٠. هەندێك پێیانوایە ناوەكە زۆر كۆنترە و بنەڕەتەكەی بریتییە لە: (حاشا). بڕوانە: روفائيل ميناس، كركوك ومحلة خاصة، "الاخاء" (مجلة)، العددان (٧–٨)، بغداد، ١٩٨١، ص٢١.

(٨٦) اصول اسماء المدن والمواقع العراقية، الجزء الاول، ص٢٥٠.

(٨٧) فهمي عرب آغا وفاضل محمد ملا مصطفى، المصدر السابق، ص٥٣.

(٨٨) دەربارەیان، بڕوانە: جمال بابان، المصدر السابق، الجزء الاول، ص٢٥٠؛ نائل حنون، اربيل ونينوى وكركوك مدن آشورية، "بين النهرين" (مجلة)، العددان (٩١–٩٢)، بغداد، ١٩٨٥، ص١٦١؛ سالم محمد تسنلي، تسعين، "صوت الاتحاد" (مجلة)، العدد (٤)، بغداد، كانون الثاني ١٩٧٢، ص٨.

(*) لە ساڵانی دواتردا بووە گەڕەكێكی سەربەخۆ بە نێوی گەڕەكی مەحەتە.

(٨٩) نجاة كوثر، بحث حول أسماء الاماكن، ص ص١٤٩–١٥٠.

(٩٠) علي ناصر حسين، تاريخ السكك الحديد في العراق (١٩١٤–١٩٥٨)، رسالة ماجستير، مقدمة الى مجلس كلية الاداب بجامعة بغداد، ١٩٨٧، ص٣٥.

(٩١) بڕوانە: سمكۆ بەهرۆز محەمەد (ئەژی)، مێژووی سەردەمە كارگێڕیی و بەڕێوەبەرییەكانی پارێزگای كەركوك، ل٧٥.

(٩٢) المجموعة الإحصائية لتسجيل عام ١٩٥٧، لوائي السليمانية و كركوك، ص١٥٤.

(٩٣) إحصاء السكان لسنة ١٩٤٧، الجزء الثاني، ص ص١٠٨–١٠٩.

(*) دوای لێوردبوونەوە، بەپێی ئامارەكان، دەركەوت (٦٢٧٦) كەس لە دانیشتوانی گەڕەكەكانی قۆریە لە ژێر هیچ جۆرە چەشنێكی نیشتەجێبووندا تۆمار نەكراون. وا پێدەچێت لەنێو باڵەخانە حكومییەكان و دەزگا ئەهلییەكان ژیانیان گوزەراندبێت. بۆیە لە كاتی كۆكردنەوەی ژمارەكانی خشتەكە ناگەینە ئەنجامێكی دروست و دەقاودەق.

(٩٤) إحصاء السكان لسنة ١٩٤٧، الجزء الثاني، الجدول الثاني، ص ص١٠٨–١٠٩.

(٩٥) دەربارەی هەموارکردنەوەی جیاووك و هاوپشکیی نێوان عیراق و کۆمپانیای نەوتی عیراق لە داهاتەکانی نەوتی کەرکووك، بڕوانە: نوري عبدالحميد خليل، التاريخ السياسي لامتيـازات النفط في العراق، (١٩٢٥–١٩٥٢)، بغداد، ١٩٨٠، ص ص٣٣٧–٤١٧.

(٩٦) المجموعة الإحصائية لتسجيل عام ١٩٥٧، لوائي السليمانية وكركوك، ص ص١٥٢–١٥٤.

(٩٧) إحصاء السكان لسنة ١٩٤٧، الجزء الثاني، ص ص١٠٨–١٠٩.

(*) ئەم ژمارانە بەدەرە لە کۆی ژمارەی باڵەخانەی قوتابخانەکان، کە ژمارەیان لە بەشی قـەڵا (١)، بەشی بەرقەڵا (٦)، بەشی قۆریە (٥٢) قوتابخانەیـە، واتـە هـەموویان بەسـەر یەکـەوە (٥٩) باڵەخانە بوونە لە شاری کەرکووك.

## ملخص البحث

## أحياء مدينة كركوك في العهد الملكي ( ١٩٢١ – ١٩٥٨ )

يلقي هذا البحث الضوء على التطورات التي شهدتها أحياء مدينة كركوك في العهد الملكي، الذي شهدت كغيرها من المدن نموا بطيئا في القرن الاخير من العهد العثماني، ولكنها تأثرت بطبيعة الحال بالآثار التي خلفتها أحداث الحرب العالمية الاولى على العالم والمنطقة.

مع إلحاق ولاية الموصل بالعراق ومن ثم أكتشاف النفط في كركوك، تحولت المدينة الى مركز جذب إقتصادي مهم، كانت من بين آثاره هجرة أعداد كبيرة من السكان اليها، من مختلف الالوية العراقية، وبخاصة تلك الطاردة للسكان بسبب أوضاعها الاقتصادية السيئة. لعب هذا العامل بطبيعة الحال دوره الكبير في تغيير التركيبة السكانية من الناحيتين الاثنية والدينية، كما أدى الى ظهور أحياء جديدة في المدينة.

شهدت المدينة في العهد الملكي تطورا ملحوظا يمكن رصده من خلال مرحلتين:

١. الأولى الممتدة من بدايات العهد الملكي وحتى تشكيل مجلس الاعمار. شهدت هذه المرحلة نهاية مشكلة الموصل، الانتهاء من بناء سكة حديد بغداد-كركوك (١٩٢٥)، اكتشاف النفط (١٩٢٧) وانتقال مركز شركة نفط العراق الى المدينة وتصدير النفط بدءاً من عام (١٩٣٤) وغير ذلك من الاحداث التي ساهمت في نمو المدينة بشكل ملحوظ مقارنة بالعهد العثماني السابق، ولكنه ليس بالمستوى الذي شهدته المدينة في المرحلة التالية.

٢. المرحلة الثانية، و تبدأ من تشكيل مجلس الاعمار عام ١٩٥٢ وحتى ١٤ تموز ١٩٥٨، اليوم الذي شهد نهاية العهد الملكي في العراق. نتيجة للأتفاقيات النفطية الجديدة بين الحكومة والشركات النفطية، التي منحت الحكومة العراقية نصيبا اكبر من الموارد المالية الناتجة عن استخراج وبيع النفط، قررت الحكومة صرف ٧٠٪ من هذا الدخل في مجالات الاعمار، كان من بينها البدء ببناء مجموعة من الوحدات السكينة في كركوك عام ١٩٥٢. و شهدت المدينة النمو والتطور في مجالات أخرى أيضا.

رصد البحث التطور التاريخي لأحياء المدينة في قطاعاتها الثلاث ( القلعة، محيط القلعة و القورية) وحاول تحليل المعلومات والمعطيات الاحصائية الرسمية المتعلقة بالمدينة وأحيائها في مختلف المجالات، عدد السكان وتوزيعهم على الاحياء، عدد المؤسسات الحكومية والاهلية في تلك الاحياء و طراز البناء. كما عرض البحث مستندا الى المصادر المعتبرة العلاقات بين السكان وأنماط حياتهم والقيم والعادات التي كانت تتحكم بحياتهم في هذه المرحلة التاريخية القريبة.

## Abstract

### Kirkuk neighborhoods in the Monarch Iraq (1921-1958)

This study highlights the developments witnessed by Kirkuk neighborhoods in the monarchy era; the city, like other cities, had had been making a slow progress during the last century of the Ottoman rule. Yet, it was influenced by the consequences of the First World War on the world in general and the region in particular.

With the annexation of Mosul Vilayat to Iraq and the subsequent oil exploration in Kirkuk, the city converted into a significant economic attraction. This led to a substantial immigration process by people from different Iraqi provinces to Kirkuk, especially those fleeing harsh economic conditions. Obviously, this immigration played a large part in changing the demographic composition of the city from both ethnic and religious standpoints, and led to the rise of new neighborhoods in the city.

However, the city witnessed outstanding progress during the monarchy era, which can be summed up in two stages:

1. The first starts from the early times of royal Iraq and extends to the time when the Reconstruction Council was formed. This stage marked the end of Mosul question, the completion of Baghdad-Kirkuk railway (1925), oil exploration (1927), the transfer of Iraqi Police Headquarter to the city, oil exportation from 1934 and other developments which contributed to the remarkable progress of the city compared to the former Ottoman rule even though being far below the standards of the subsequent stage.
2. The second stage begins after the Reconstruction Council was formed in1952, and which continued to work until 1958 when the monarchy was overthrown.

As the result of the oil extraction and exploration contracts signed by the Iraqi government and the oil companies, which gave the latter larger shares of financial revenues, the government decided to spend 70% of the revenues on reconstruction which included, among other things, building residential units in Kirkuk in 1952. The city developed in many other ways, however.

Thus, the present study tackles the historical development of the city's neighborhoods in all their three areas; the citadel, the citadel's immediate surroundings, and Qoriya. Hence, it analyzes the city's official statistical data in different walks of life, the population and its distribution in the neighborhoods, the number of state and private institutions therein, and the prevalent architectural modes. Depending on reliable sources, the study also explores the relation between the city's inhabitants, their lifestyles, values, and traditions, which shaped their lives during the aforementioned historical stage.

# سنجاقەکانی
# شارەزوور (کەرکووك) و سلێمانی
# لە کۆتایی سەدەی نۆزدەدا

نووسینی: ڤیتال کیونێ
وەرگێڕانی لە فڕەنسییەوە: د. نەجاتی عەبدوڵڵا

( بەشی دووەم )

**پێشباری وەرگێڕ**

ئـەم باسـەی ئێـرە بەشـێکە لـە کتێبێکـی فڕەنسـایی بـە نـاوی (تورکیـای ئاسیەوی: جوگرافیای کارگێڕی)، کە ساڵەکانی ١٨٩٠–١٨٩٥ لە پاریس، بـە چـوار بەرگی گەورە لەلایەن ڤیتال کیونێ بڵاو کراونەتەوە. ئەم کتێبە بـاری جـوگرافی و ئاماری زۆر وردی تێدایە لەبارەی سـەرلەبەری ویلایەتـەکانی دەوڵـەتی عوسمـانی. بەشی زۆری بەرگی دووەمی ئەم کتێبە، کـە (٨٧٥ لاپەڕەیـە) تـەرخان کـراوە بـۆ ویلایەتە کوردییەکانی عوسمـانی و لـەم بەرگـەدا زانیـاری و ئامـاری ورد لـەبارەی سەرجەم شار و شارۆچکە و هەرێم و ویلایەتە کوردییەکانی دەوڵەتی عوسمانی لـە کۆتاییەکانی سەدەی نۆزدەم بەدەستەوە دراون، کە بۆ مێژوونووسیی کـورد زۆر گـرنگ و پـڕ بایـەخن. لـە ژمـارە (٢٤) ی (**گۆڤـاری ئـەکادیمیای کـوردی**) بەشـی یەکـەمی ئـەم وتارەمـان بڵاوکـردەوە، کـە تایبـەت بـوو بـە سـنجاقی شـارەزوور (کەرکووك) و وا لەم ژمارەیشدا لە بەشی دووەمی وتارەکـەدا، ئـەوەی تایبەتـە بـە قـەزاکانی: کۆیسـنجاق، شـەقڵاوە، سـەڵاحییە و قەرەتەپـە و هـەروەها سـنجاقی سلێمانی ڕاستەوخۆ لە فڕەنسییەوە دەکەینە کوردی.

## قەزای کۆیسنجاق

قەزای کۆیسنجاق کەوتۆتە ڕۆژهەڵاتی پێدەشتەکانی ئەربیل. ئەم قەزایە یەك ناحیە و ٢٥٢ ئاوایی هەیە.

**دانیشتوان:**

دانیشتوانی گشتیی قەزاکە بریتییە لە (١٨٠٠٠) کەس بەم شێوەیەی خوارەوە:

| | |
|---|---|
| موسڵمان (کورد) | ١٧٤٤٠ کەس |
| کریستیان (کلدانییەکان) | ٥٠٠ کەس |
| جوو | ٦٠ کەس |
| ـــــــــــــــ | |
| کۆی گشتی | ١٨٠٠٠ کەس |

کۆیسنجاق، ناوەندی قەزایە، نشینگەی ڕەسمیی قایمقام و دەسەڵاتدارانی بەڕێوەبەرایەتی قەزاکەیە، شارۆچکەیەکی بچووکە و کەوتۆتە ئەوپەڕەکەی پێدەشتێکی جوان، لە دامێنی کۆشکێکی بەهێزەوە.

دانیشتوانی قەزاکە بە ژمارەی وردییەوە لەم قەزایە (١٠٠٠٠) کەسن بەم شێوەیەی خوارەوە:

| | |
|---|---|
| موسڵمان (کورد) | ٩٦٤٠ کەس |
| کریستیان (کلدانییەکان) | ٣٠٠ کەس |
| جوو | ٦٠ کەس |
| ـــــــــــــــ | |
| کۆی گشتی | ١٠٠٠٠ کەس |

ئاووهەوای ئەم شارە و دەوروبەری زۆر (تا) دارە و ئاووهەوای لە هاویندا زۆر ساغ نییە. لە دەوروبەری شارەکە بڕێك باخچەی تا ڕادەیەك سەوزی لێیە.

دەسەڵاتدارانی کۆیسنجاق بریتین لە: قایمقام، جێگری قایمقام، ئەنجومەنێکی بەڕێوەبەرایەتی بە هەمان ئەو پێکهاتەی کە لە سەرەوەدا ئاماژەمان پێکرد بەشداری تێدا دەکەن، قازی، موفتی، باجگر و سێ کارمەندی حیسابات، کارمەندی باری شارستانی و باج. ئەم شارۆچکەیە شارەوانییەك و دادگایەکی پلە یەکی لێیە.

لە شەش کیلۆمەتری دەوروبەری شاری کۆیسنجاق ئاواییەکی بچووك بەناوی هەرمۆتە هەیە: ئەوە باغی عەدەنی وڵاتەکەیە. لەوێ لە کەناری جۆگەلەیەکی بچکۆلە، داروردەختێکی چڕ، کە هەموو چەشنە دارێکی بە بەری لێیە و بە تایبەتی دار هەناری تێدا ڕواوە، کە لەوەوە ناوی هەرمۆتە بە بەر گوندەکەدا بڕاوە. ئەم ناوچەیە هەتا بەر لە ماوەیەك سەرلەبەری دانیشتوانەکەی کریستیان بوون، بەڵام ئاغا کوردەکانی قەزاکە دەستیان بەسەر ئەم پارچە جوانەدا گرت و ژیانی دانیشتوانەکەیان تاڵ کرد.

وەك ئەوەی ژمارەیەکی زۆر کەلاوەی دێر و کڵێسەی لێیە، کە ئێمە لە هەموو لایەك تووشی بووین، ئەوە دەسەلمێنن کە دانیشتوانی ئەم دەر و ناوچەیە بەر لەوەی ببنە موسڵمان کریستیان بوون و شوێنیان بۆ موسڵمانەکان چۆڵ کردووە، کە ئەوە شیمانەی کەمترە، چونکە ئێمە ئەوە دەزانین، یان بەلای کەمییەوە ئەوە بیروڕای گشتییە، کە کوردەکان لە بنچینەی کاردۆخەکانن و لەو ئەنجامەشدا خەڵکی ڕەسەنی ناوچەکەن. ئەمڕۆکە، هەموو موسڵمانن، کوردەکان بەنزیکەیی تەواوی دانیشتوانی ناوچەکە پێك دەهێنن. دابەشی سەر چەندین هۆز دەبن کە هەر یەکێکیان لە لایەن سەرۆکێکەوە سەرۆکایەتی دەکرێ کە هەمیشە لەنێوان خۆیاندا لە شەڕ و جەنگدان. هۆزە سەرەکییەکان بریتین: لە میر مەحمەلی، میر ئاسۆیی و پاشتاغی.

کریستیانەکان هەموویان سەر بە مەزهەبی کلدانین*.

**ئاووهەوا**: ئاووهەوای کۆیسنجاق بەشێوەیەکی گشتی ساردە، بەڵام ئاووهەواکەی پاکە، جگە لەناو شارەکە خۆی نەبێت.

**کشتوکاڵ**: هەرچەندە خاکەکەی زۆر بە پیتە، بەڵام بەرهەمی کشتوکاڵی بە ئاستەم بەشی دانیشتوانەکەی دەکات. بڕێك جار لە کاتی قاتوقڕیدا چەندین جۆر

نۆك دەچێنن کە لەگەڵ ڕۆناس[1] بەهەڵە تێکەڵ دەکرێن، وێڕای ئەوەی کە ئەم درەختانە کەم لەیەك دەچن. لە دەورانی ئاساییدا، لە پێدەشتەکاندا برنج، پەمۆ، تووتن و جۆرە پاقلەیەك بەناوی ماشەوە[2] دەچێنن. لەناو چیاکاندا درەختگەلی بەردار دەچێنن.

## شەقڵاوە

شەقڵاوە، ناوەندی ئیداریی ناحیەیەکە بەم ناوەوەیە، کەوتۆتە ١٢ کاتژمێری ڕۆژهەڵاتی ئەربیلەوە.

دانیشتوانەکەی ژمارەیان (١٥٠٠) کەسە بەم شێوەیەی خوارەوە:

| | |
|---|---|
| موسڵمان (کورد) | ١٠٥٠ کەس |
| کریستیان (کلدانییەکان) | ٤٠٠ کەس |
| جوو | ٥٠ کەس |
| ------- | |
| کۆی گشتی | ١٥٠٠ کەس |

دانیشتوانی ئەم ناوچەیە بەشێوەیەکی تایبەتی خەریکی ڕەزەوانی و درەختگەلی میوەدارن. یاقووت ناو و شۆرەتی بەناوبانگی ترێیەکانی ئەم شارۆچکەیە باس دەکات. شوێنی شەقڵاوە لە وەرزەکانی هاویناندا بە سێبەری زۆر و جۆگەلە سازگارەکانی، شتێکە نایاب. لەوکاتەوە کە میوەکان پێدەگەن، خەڵکەکە گوند جێدەهێڵن بۆ ئەوەی بچنە باغ و باغاتە فراوانەکانی دەوروبەری شارەکە، لێرە دەست دەکەن بە دروستکردنی نەوای لقەداران ، کە بە کلدانی پێی دەڵێن کوپرانە[٣] کە تاوەکو پایز تیایدا دەمێننەوە بۆ ئەوەی میوەکان لە دزان بپارێزن. قەشەکان زیاد لەوە، یەك کابینی زۆر فراوان دروست دەکەن، کە تەنها بۆ ڕێوڕەسمی پەرستن بەکاردەهێنرێن. خێزانەکان دێن بۆ ئەوەی تێیدا بەشداری لە ڕێوڕەسمی ئایینی، لە نوێژ و ئەرکە خوداییەکاندا بکەن. بەڵام وەك ئەوەی دانیشتوان دەڵێن ئەم بەهەشتە کە بە بەهەشتی عەدەن دەچێت: شەیتان دێتە ناویەوە و هەموو خۆشییەکیان لێ دەکات بە تاڵی. قەڵەمڕەوی کورد زۆر بە

قورسی و له هەموو لایەکەوە باڵی بەسەر ئەم وڵاتەدا کێشاوە. میرێکی بەهێز نشینگەکەی لە شەقڵاوەیە و گەرچی لەڕووی پرەنسیپەوە دان بە دەسەڵاتی حکوومەتدا دەنێت. بەڵام لە ڕاستیدا ئەوە میری کوردە، کە حوکمڕانی ناوچەکە دەکات و لە ڕێگەی ئاغا و سەییدەکانی خۆیەوە دەیانچەوسێنێتەوە و بە جێیان دەهێڵن و ڕێگە دەدەن هەزاران تاوانی تێدا دەکەن، بە بێ ئەوەی هیچ کەسێك زاتی ئەوە بکات لە دادگاکان سکاڵایان لەسەر تۆمار بکات. ڕاستییەکەی، بۆ یەك کەس کە بویسترێ لە ڕێگەی دادگاوە تۆڵەی لێ بسەنرێتەوە، خەنجەر بەدەستە کوردەکان چواری دیکە دەکەنە قوربانی.

**سەرنجدانە مێژووییەکان و وەسفی شارەکە:** دیمەنی شەقڵاوە زۆر جوانە. لە بناری چیایەکی بچووکی پڕ دارودرەخت دروستکراو، بانیژەیەك پێکدەهێنێت، ئەو گەڕۆکانەی کە لە لایەکەوە تەماشای دەکەن وا بەدیار دەکەوێ کە ئەم بانێژەیە بە دەستی مرۆڤ دروست کراوە، کە ئەمە شتێکە لەم بەشانە زۆر ئاساییە کە نیشانەی دەورانی کۆن بەدەستەوە دەدات. لاکانی رۆژهەڵات و باکوری ناحیەکە چیا بەرزەکانی ڕەواندز و ئێران چەقیون، بەفرێکی هەمیشەیی داپۆشیوە و بناری ئەم چیایانە سەوزایی بە فراوانی داپۆشیوە و بە نۆرە لەگەڵ بارستگەلی دارودرەختی سەدان ساڵە.

دەگێڕنەوە کە شەقڵاوە لە دەورانی سولێمان پاشا[٤] دروست کراوە، هیچ شتێکی دیاریکراو پاڵپشتی ئەم ئەفسانەیە ناکات، لەگەڵ ئەوەشدا کە ئەم واقیعە هیچ گەواهێکی نییە پێچەوانەکەی بڵێ. هەرچۆنێك بێت، ئەوە دڵنیایە کە هەر هیچ نەبێت لانیکەم لە سەدە بەراییەکانی مەسیحییەتیدا هەبووبێت وەك ئەوەی ژمارەیەك دێر، کە بەناو چیاکان و پێدەشتەکان بڵاون ئەوە دەسەلمێنن. ئێمە مێژووی ئەم دێرانە نازانین، لەوانە کە دەبێت ئاماژەی پێ بدەین دێری بابان بایە[٥] ( قەشە یان خوداوەند بایە) و ئەوەی سانت گۆرگیسە[٦]. ئەم دوو کۆنە شوێنەوارە لەناو دوو گاشە بەرد هەڵکەندراون. یەکەمیان پێکهاتووە لە کڵێسەیەك و خانەیەکی نەخشەسازیی نایاب. هەرچی ئەوەی دووەمە لە سێ نهۆم پێکهاتووە، دروستکردنەکەی زۆر سەمەرە و نائاسایی دادەنرێت، کە ناتوانرێت بچیتە یەکەم نهۆم، بەڵکو دەبێ لە نهۆمەکانی سەرەوە بۆی بچیت.

**قەزای سەلاحییە یان کفری**

ئەم قەزایە یەك ناحیە و (١٥٨) ئاوایی هەیە. سەرلەبەری دانیشتوانەکەی (١٤٠٠٠) کەسە.

سەلاحییە یان کفری، ناوەندی ئیداریی قەزاکە، نشینگەی ڕەسمیی قایمقام، جێگری قایمقام و دەسەلاتدارانی بەڕێوەبەرایەتییە، شوێنی چەندین خزمەتگوزاریی گشتی و گەورەترین شارە، کە لەنێوان کەرکوك و بەغدادا ببینرێت. کەوتۆتە ناو دۆڵێکی زۆر بە پیت، چەندین ڕووبار دۆڵەکە ئاو دەدەن و یەکێکیشیان بەناو شارەکەدا ڕەت دەبێت. دەروازەگەلی لە بەرد، لە ڕەوشێکی زۆر خراپدا، بەیەکگەیشتنەکانی نێوان چەندین شەقام ڕێکدەخات. کفری شیمانەی زۆر هەیە لەسەر شوێنی شارێکی گرنگی کۆندا دروست کرابێت، لە چەند کیلۆمەترێك لە باشوورەوە، گردێکی خۆڵی لێیە بەناوی تەل-شاهان(٧)، واتە گردی پاشایان، بە بێ گومان دەگەڕێتەوە بۆ ڕۆژگارێکی کۆن. دانیشتوان بانگەشەی ئەوە دەکەن، کە ئەوە شارێکی کۆن بووە.

دەسەلاتکارانی بەڕێوەبەرایەتیی سەلاحییە یان کفری بریتین لە قایمقام، جێگری قایمقام، ئەنجومەنێکی بەڕێوەبەرایەتی لەسەر هەمان شێوەی پێکهاتەی ئەنجومەنەکانی ویلایەت، سنجاق و قەزاکانی دیکەی لە پێشدا باسکراو، بەشداری بەڕێوەبردنی قەزاکە دەکەن، قازی، موفتی، باجگر، بەڕێوەبەری پۆستە و تەلەگراف و پێنج کارمەندی حیسابات، بەڕێوەبەرایەتی یارمەتییەکانی قایمقام، دامەزراوەکانی مزگەوتەکان، مالییەی گشتی و دائیرەی تووتن. ئەم شارە شارەوانییەك و دادگایەکی بەرایی لێیە.

**دانیشتوان:**

دانیشتوانی ئەم شارە بریتییە لە (٦٥٢٨) کەس بەم شێوەیەی خوارەوە:

| | |
|---|---|
| موسڵمان (شیعە) | ٦٤٤٨ کەس |
| جوو | ٨٠ کەس |
| کۆی گشتی | ٦٥٢٨ کەس |

خانووەکانی سەلاحییە یان کفری لە خشت دروست کراون. بەگوێرەی ژمارە ڕەسمییەکانی تورك قەزاکە: ١٠٨٨ماڵ، ٦ مزگەوت و ٣ تەکیە، ٢ قوتابخانە، یەك سەرا یان کۆشکی حوکمڕانی، ٢ حەمام یان گەرماوی گشتی، ٩ خان یان هۆتێل، یەك نووسینگەی تەلەگراف، ١٧٠ دووکان، ٤ قاوەخانەی تورکی، ٦ خومچی، ٣٥ ئاسیاو، ٣٠ باخچە و باغ، ٢٩٢ کێڵگەی کشتوکاڵی لێیە.

لە دەوروبەری سەلاحییە، کانێکی ڕەژووی لێیە کە لە لایەن حکوومەتەوە دەردەهێنرێت.

**بەروبوومی کشتوکاڵی**: بەرهەمی سەرەکی کشتوکاڵیی ئەم قەزایە کە زۆر بە پیت و فەڕن بریتین لە: گەنم، جۆ، دارخورما و داری لیمۆ.

**قەرە تەپە**: قەرە تەپە:[٨] ناوەندی ئیدارییی ناحیەیەکە بەم ناوەوە، دانیشتوانەکەی (٧٥٠) کەسن، هەموویان موسڵمانی شیعەن، واتە لە تایەفەی عەلین.

خەڵکەکەی بە چاندنی دانەوێڵە و بە دارخورما و لیمۆوە خەریکن.

## سنجاقی سلێمانی

**سنوورەکان**: سنجاقی سلێمانی لەنێوان ئێران لە ڕۆژهەڵات و سنجاقی شارەزوور لە ڕۆژئاوادا دەورە دراوە.

**دابەشکردنی ئیداری**: لە ڕووی ئیدارییەوە سنجاقی سلێمانی دابەشی سەر ٥ قەزا بووە و ١١ ناحیەی هەیە بەم شێوەیەی خوارەوە:

| قەزایەکان | ناحیەکان |
|---|---|
| سلێمانی (ناوەندی قەزا) | سەرچناری ڕۆژهەڵات– سەرچناری ڕۆژئاوا– قەرەداغ–بیلگ ئودا [٩]. |
| بازیان | سەنگەسەر– کەلەك[١٠]–سپوکە |
| گولعەنبەر (هەڵەبجە) | قزلجە– سرۆچك |
| شارباژێر | ماوەت |
| مەرگە | پشدەر– سووورداش |
| ٥ قەزا | ١١ ناحیە |

**دانیشتوان:** دانیشتوانی سنجاقی سلێمانی بریتییە لە (٥١٦٠٠) کەس، کە بەم شێوەیە دابەشی سەر (٥) قەزا و(٣٥٣) ئاوایی سەر بە سنجاقەکە بوون:

| قەزایەکان | دانیشتوانی هەر قەزایەك | ئاواییەکان |
|---|---|---|
| سلێمانی (ناوەندی قەزا) | ٢٦٠٠٠ | ١٠٤ |
| بازیان | ٥٤٠٠ | ٥٤ |
| گوڵعەنبەر | ٧٠٠٠ | ٩٥ |
| شارباژێر | ٦٦٠٠ | ٤٠ |
| مەرگە | ٦٦٠٠ | ٦٠ |
| کۆی هەمووی | ٥١٦٠٠ | ٣٥٣ |

لە ڕووی ڕەگەز، ئایین یا کۆمیۆنیەتە، کۆی ئەم (٥١٦٠٠) کەسە زۆر بە نزیکەیی بەم شێوەیەی خوارەوە دابەش بوون:

موسڵمان ٤٨٦٠٠ کەس

مەسیحی ٩٠٠ کەس

جوو ٢١٠٠ کەس

سەرجەم ٥١٦٠٠ کەس

**مێژوو و وەسف** : زەویوزاری سنجاقی سلێمانی لە دەورانی کۆنەوە بەشێك بووە لە دەوڵەتی ئاشووری، کەوایە هیچ شتێکی زیادە نییە بخرێتە سەر ئەو مێژووە گشتییە کە لە سەرەوەدا یادداشت کراوە. ئەم هەرێمە جاران وەك ئەوەی ئەمڕۆ هەیە ئەو هێندە گرنگ نەبووە. ئەم وڵاتە بە دیمەنە دڵڕفێنەکانی زنجیرە چیایەکان و بە پیت و فەڕی خاکەکەیەوە بەناوبانگە کە ئەگەر چاك بچێندرێت دەبێتە یەکێك لە دەوڵەمەندترین هەرێمی وڵاتەکە. ڕاستە دانیشتوانەکەی بە نزیکەیی هەر هەموویان بە کشتوکاڵ و ئاژەڵدارییەوە خەریکن، بەڵام بە بێ مشورخواردن و بە بێ میتۆد، بە ئامێری خراپ و ئامرازی سادە کار دەکەن.

**قەزایەکانی سنجاقی سلێمانی**

**قەزای سلێمانی:** ئەم ناوەندی قەزایە (٤) ناحیە و (١٠٤) ئاوایی دەگرێتەوە.

**دانیشــتوان:** ســەرلەبەری دانیشــتوانەکەی، بــە دانیشــتوانی ناوەنــدی قەزاکەشەوە (٢٦٠٠٠) کەسن.

**ناوەندی قەزا:** سلێمانی مەڵبەند و شوێنی موتەسەریف، حاکمی سنجاق و ناوەندی قەزایە، ئەنجومەنێکی ئیداری لێیە کە لە هەمان پێکهاتەی ئەوەی ویلایەتی کە لە پێشدا باس کراوە پێکهاتووە، بەشداری دەکەن. لە ناوەندی قەزا: موفتی، قازی، یەك خەزێنەدار، سەرۆکی موحاسەبە، بەڕێوەبەرانی پۆستە و تەلەگراف، بەڕێوەبەری قەرزی گشتی و باجگری توتن، بەڕێوەبەری بوارەکانی لیستی سڤیل، مەکتووبچی، کارمەندەکانی باجگری ناڕاستەوخۆ[11] و پزیشکێکی قەرەنتینەی لێیە.

دوو دادگەی بەرایی لە سلێمانی هەیە، یەکێکیان سڤیل و ئەوی دیکەشیان دادگەی تاوانکارییە. یەك حاکمی گشتی و حاکمێکی قەزایی بەشداری تێدا دەکەن. شار لە لایەنی موتەسەریفەوە بەڕێوە دەبردرێت.

ئۆردووی سلێمانی لە یەکەم و دووەم بەتالیۆنی فەوجی ٤٥ —ەمینی هێزی سوارە و یەکەم و دووەم بەتالیۆنی فەوجی ٤٦—ەمین پێکهاتووە.

کامپی ژاندەرمری ئەم شارە بریتییە لە (٢) سریەی ژاندرمە، یەکێکیان پیادە و ئەوی دیکەیان سوارە، کە بە هەمووی (١٦) ئەفسەر و (٥٠) سوارە و (٨٠) پیادەن.

**دانیشتوان:** دانیشتوانی ناو شار و دەوروبەری (١٥٠٠٠) کەسن بەم شێوەیەی خوارەوە:

| | |
|---|---|
| موسڵمان (کورد) | ١٣٨٢٥ کەس |
| مەسیحی (کلدانی) | ١٧٥ کەس |
| جوو | ١٠٠٠ کەس |
| کۆی گشتی | ١٥٠٠٠ کەس |

**قوتابخانە:** لە سلێمانی جگە لەو قوتابخانانەی کە لە گەڕەکەکاندا سەر بە مزگەوتەکانن، قوتابخانەیەکی ڕوشدیەشی لێیە. بەڵام مەسیحییەکان و جووەکان قوتابخانەیان نییە.

دەتوانین جگە لەو بینایانەی کە بۆ پەرستنی هەمەچەشنە تەرخان کراون، باسی (٤٠) مزگەوت، یەك کڵێسەی بچووکی مەسیحییەکان و یەك سیناگۆگی بچووك و دوو بینایەی دیکەی تاڕادەیەك گرنگ ئاماژە پێ بدەین: کە ئەوانیش سەرای حکومەت و ئۆردووخانەن.

پێدەشتی سلێمانی لەنێوان دوو زنجیرە چیادا درێژ دەبێتەوە. شارەکە کاتێك لە کەرکووکەوە دێین، لە ناوەڕاستی دارستانێکی بچووکی پڕ درەختی سەوز هەڵکەوتووە. سلێمانی مێژووەکەی دەگەڕێتەوە بۆ سەدەی پێشوو بەم شێوەیە هیچ پاشماوەیەکی کۆنی تێدا نابینین. هەموو ماڵەکان وەك ئەوەی لەناو گوندێکی سادە بن بە خشت دروست کراون. ئەم شارە جۆرە کۆگەیەکی بازرگانییە لەنێوان تورکیا و ئێران. یەکێك لە بەرهەمە هەرە پڕ فرۆشەکان جاو (کەتیرە)یە، کە کاروانەکان لە ئێرانەوە بە بڕی زۆر دەیهێنن، بەڵام لە ناو وڵاتیشدا کۆی دەکەنەوە بە ناوی کەتیرە. ئاو و هەوای لە هاوینان ناوەندییە، شارەکە لە شوێنێکی دڵگیرە و ئاوێکی زۆری تێدایە کە ئەمە وای کردووە هەر ماڵێك باخچەیەکی دار و درەختی بە بەر و حەوزێکی لە ناوەڕاستە کە ئاوەکەی هەمووو شەوێك نوێ دەبێتەوە. ئەم ئاوە زۆرەی سلێمانی بە ڕێگەیەکی دەستکرد لە ڕێگەی سیستمێکی تایبەتی بە پێچەوانەی ئەوەی هەولێر و کۆیسنجاق بەرهەم دێت. ئەم سیستمە بریتییە لە هەڵکەندنی ژمارە بیرێك کە لە قووڵاییدا یەك دەگرنەوە. بەم شێوەیە بیرێك دەڕژێتە ناو ئەوی دیکە و دواجار لە هەموو ئەو ئاوانەی کە کۆدەبنەوە، بڕە ئاوێکی بەقەد ڕووبارێکی ڕاستەقینەی لێ دەکەوێتەوە. ئەم جۆرە بیرانە پێیان دەوترێت کارێز[١٢].

دانیشتوانە موسڵمانەکانی سلێمانی هەمان داب و نەریتی کوردەکانی دیکەیان هەیە و لە ئەنجامدا هاوسۆزییان بۆ مەسیحییەکان کەمە، ئەوەی کە ژمارەی کەمی ئەمانەی دوایی لێك دەداتەوە. لە لایەکی دیکەوە، مەسیحییەکان کە لە لایەن قەشەکان بەڕێوە دەبردرێن کە سەر بە مەترانی کلدانی سنەیە و

بارەگەکەی کەوتۆتە ناو ئێران و حەوت ڕۆژە ڕێ لە سلێمانی دوورە ، هەرگیز ناتوانن پشت بە سەرۆکی خۆیان ببەستن بۆ ئەوەی بەرگری لە بەرژەوەندییەکانیان بکات، بێئەوەی حسابکردنی ئەوەی کە ئەم مەترانە، فەرمانی لە لایەن شای ئێرانەوە بۆ دێت نەوەکا سوڵتانی عوسمانی، دەسەڵاتدارانی عوسمانی بە هیچ شێوەیەك بە هانایانەوە ناچن.

کۆمەڵێك پیشەسازی سلێمانییان ئاوەدان کردووەتەوە بە تایبەت خوری چنین، خومچی و (چەقماقچی) واتە دروستکردنی جۆرە دەمانچەیەك کە لە هەموو سنجاقەکە و سنجاقی شارەزووریش داوای دەکەن.

**زمان:** زمانی قسەکردن سەرلەبەری لەم شارەدا کوردییە، بەڵام عەرەبی بازاڕی، کلدانی و کەمێك تورکییش قسەی پێدەکریٚ بە تایبەت لە پێوەندییەکان لەگەڵ حکومەت و دامەزراوە گشتییەکانی دیکە بەکاردەهێنریٚ.

**ئاووهەوا:** ئاووهەوای ئەم قەزایە بە گشتی ساغە، پلەی گەرما ساردە، خاك لە بەشە چیاییەکاندا زۆر بە پیتە، بەڵام زەویوزارێکی زۆر و بەر بڵاو بەجیٚ هێڵدراون و لەبەر کەمی دەستی کار بە بەیاری ماونەتەوە.

**بەرهەم:** بەرهەمەکانی دەشت بریتین لە گەنم، جۆ، برنج، توتن و لای عەرەبەکان گەنمە شامی. لە چیایەکاندا کشتوکاڵی سەرەکی بریتین لە دار مێو، لیمۆ و هەنار و درەختی دیکەی میوە.

### قەزای بازیان

ئەم قەزایە (٢) ناحیە و (٥٤) ئاوایی هەیە و ژمارەی دانیشتوانەکەی بەسەریەکەوە (٥٤٠٠) کەسە.

بەرپرسانی بەڕێوەبەرایەتی بریتین لە قایمقام (بەڕێوەبەری قەزا)، ئەنجومەنێکی بەڕێوەبەری بە هەمان ئەو پێکهاتەی کە پێشتر لە پێشەوەدا ئاماژەی پێکراوە بەشداری دەکەن: قازی، خەزێنەدار و فەرمانبەرێکی موحاسەبە.

لە مەڵبەندی قەزادا یەك دادگەی بەرایی و یەك ئەفسەری ژاندرمری لێیە.

دشامشامان[١٣] یان چەمچەماڵ مەڵبەندی قەزای بازیانە و کەوتۆتە سەر سنوورەکەیەوە لە لای کەرکووکەوە. تەواو هاوسێی نزیکی دەربەندە چیاییکی

بچووك، کە بە ناو تونێلێکدا دەڕوات و وا پێدەچێ بە دەستی مرۆڤ هەڵدرابێ کاروانەکانی پێدا تێپەڕ دەبێت. لەم ئاواییەدا کۆشکێك بۆ حاکم، ئۆردوویێك، مزگەوتێك و تەلگرافخانەیەکی تێدایە. لە قەزای بازیان کە دەکەوێتە نێوان شارەزوور و سلێمانی، لە پێدەشتێکی بە پیت بەڵام کەم چێندراو کە هەمەوەندەکانی لێ دەژین، ئەو عەشیرەتەی کە جاران هەر خەریکی ڕاووڕووت بوون، وەك چۆن لە سەرەوەدا بە درێژی بینیمان. ئەمڕۆ خەڵکەکەی بە تەواوی سەرقاڵی کشتوکاڵ و ئاژەڵدارین.

### قەزای گوڵعەنبەر

ئەم قەزایە بریتییە لە (٢) ناحیە و (٩٥) ئاوایی.

سەرلەبەری دانیشتوانەکەی بریتییە لە (٧٠٠٠) کەس. هەڵەبجە مەڵبەندی ئەم قەزایە شوێنی نیشتەنی پاشا، سەرۆکی هۆزی کۆچەری کوردی جافە.

دانیشتوانی ئەم شارە نزیکەی (٣٠٠٠) کەسە کە بەم شێوەیەی خوارەوەیە:

| | |
|---|---|
| موسڵمان | ٢٠٠٠ کەس |
| جوو | ١٠٠٠ کەس |
| کۆی گشتی | ٣٠٠٠ کەس |

دانیشتونی ئەم شارە و هەروەها ئەوەی باقی قەزایەکە سەرلەبەری موسڵمانن، تەنها وەرزێرن.

پاشماوەکانی شارەزوور (سیازۆرۆس)[١٤] کۆنە پایتەختی کوردستان، کە سەرەتا پێیان دەگوت شەهر–فەیرۆز[١٥] بە ناوی دامەزرێنەرەکەیەوە قوباد کوڕی فەیرۆز، لە بنەماڵەی ساسانی، کەوتۆتە قەزای گوڵعەنبەرەوە. لە قووڵایی خەرەندەکەوە کە شارەزوور دەیپارێزێ، ئەشکەوتێکی بەناوبانگی لێوە دەبێتەوە کە بە ناوی ئەشکەوتی جادووبازی شین[١٦] بەناوبانگە. لەبەردەم ئەم ئەشکەوتەدا، لەسەر بەردێکی شاقوولییە و قەڵایەکی لێیە بەناوی سەلیم عەلی قەلعەسی (قەڵای سەلیم عەلی). لە دەوروپشتی شارەکەدا، جاران یەك گومبەتی لێ بووە، کە بۆتە کەلاوە و ئێسك و پرووسکی ئەلیکساندەری گەورەی لێ بووە پێش گواستنەوەی بۆ ئەلکسەندرییە کە وا پێناچێ هەرگیز بێرەدا ڕەت بووبێت.

شارەزوور مەترانێکی نەستووری لێیە کە سەر بە پایتەختی ئەدیابین یا ئەربیل-ە و مەترانێکی یەعقووبی لێیە کە سەر بە مافرین -ە.

گوڵعەنبەر لە بناغەدا کۆشکێك بووە لە لایەن سولتان سولێمان قانوونی (١٥٢٠-١٥٦٦) دروست کراوە بۆ ئەوەی ببێتە شوێنی نیشتەنی پاشایەکان و حاکمانی عوسمانی. لە سەرەتای سەدەی حەڤدە، شا عەباس ( ١٥٨٧-١٦٢٩) تێکی داوە، بەڵام بیست ساڵ دواتر، لە ساڵی (١٦٣٠) سەدری ئەعزەمی سولتان مورادی چوارەم، کە لە شارەزوور لێی هەڵدابوو، دانیشتنێك ساز دەکات و لەوێدا بڕیاریان دا کە ئەگەر کۆشکەکە پێویست نەبوایە، ئەوا سولتان سولێمان لەم شوێنە دروستی نەدەکرد و خۆ ئەگەر جێگەی مەترسیش نەبوایە بۆ دوژمن ئەوا شا عەباس نەیدەڕووخاند. لە ئەنجامدا ئەنجومەن گەیشتە ئەو بڕیارەی، کە دەبێ کۆشکەکە دروست بکرێتەوە. لە ماوەی حەوت هەفتەدا کارەکە تەواو بوو.

### قەزای شارباژێڕ

ئەم قەزایە یەك ناحیە و (٤٠ ) ئاوایی هەیە. سەرجەمی دانیشتوانەکەی (٦٦٠٠) کەسە. شیوەکەل، مەڵبەندی قەزایە، کە شارباژێڕ-یشی پێ دەڵێن، بەرهەمی توتن، برنج، و ترێ بەناوبانگە. دانیشتوانەکەی ١٥٠٠ کەسە و هەموویان موسڵمانن و یەك مزگەوتی لێیە.

ئەم قەزایە کەم ناسراوە، تەنها ئەوە دەزانین کە زۆربەی دانیشتوانەکەی ترێ، برنج، توتن و داری بەردار دەچێنن.

### قەزای مەرگە یا مەرکە

ئەم قەزایە (٢) ناحیە و (٦٠) ئاوایی هەیە. دانیشتوانەکەی (٦٦٠٠) کەسن.

**بەرهەمە کشتوکاڵییەکانی:** بەشی گەورەی ئەم قەزایە کەوتۆتە ناوچە چیاییەکان بەڵام تا ڕادەیەك بەشی چاندنی جۆ، گەنم، برنج زەویوزاری هەیە. خەڵکی مەرگە بە گشتی سەرقاڵی باخچەوانین.

LA

# TURQUIE D'ASIE

## GÉOGRAPHIE ADMINISTRATIVE

STATISTIQUE
DESCRIPTIVE ET RAISONNÉE DE CHAQUE PROVINCE
DE L'ASIE-MINEURE

PAR

VITAL CUINET

TOME DEUXIEME

PARIS
ERNEST LEROUX, ÉDITEUR
28, RUE BONAPARTE, 28
1891

# SANDJAK DE SULÉIMANIÈH

**Limites.** — Le sandjak de Suléimanièh est enclavé entre la Perse à l'est et le sandjak de Chehrizor à l'ouest.

**Division administrative.** — Il est divisé administrativement en 5 cazas et possède 11 nahiés, comme suit :

| CAZAS | NAHIÉS |
|---|---|
| Suléïmanièh (merkez-caza) | Sar-Achinar-Chark. — Sar-Achinar-Gharb. — Kara-dagh. — Belg-Ouada. |
| Bazian | Sankas. — Kalek-Sioka. |
| Gul-ambar | Kizildja. — Saroudjik. |
| Chehr-Bazar | Mavat. |
| Marga | Pichter. — Sourtâch. |
| 5 cazas | 11 nahiés |

**Population.** — La population du sandjak de Suléïmanièh est de 51,600 habitants qui se trouvent répartis dans les 5 cazas et les 353 villages du sandjak comme suit :

| CAZAS | TOTAUX PAR CAZAS | VILLAGES |
|---|---|---|
| Sulémanièh (merkez-caza) | 26.000 hab. | 104 |
| Bazian | 5.400 — | 54 |
| Gul-ambar | 7.000 — | 95 |
| Chehr-Bazar | 6 600 — | 40 |
| Marka ou Marga | 6.600 — | 60 |
| Totaux | 51.600 hab. | 353 |

**پەراوێزەکان:**

* کلدانی مەزهەب نییە، بەڵکو زیاتر ڕەگەز، تۆرەمەیە، (وەرگێڕ).

(1) garance
(2) masha
(3) koprana
(4) Salomon
(5) Baban-baya
(6)Saint-Georges
(7) Tell-Chahân

(٨) لە تێکستە فرەنسییەکەدا بەم شێوەیە نووسراوە: kérème-Tepé واتە (کەرەم–تەپە)، بەڵام پێم وایە دەبێ ڕاستەکەی هەر (قەرە تەپە) بێت، (وەرگێڕ).

( 9 ) Belg-Ouada
(10) Kalek
(11) Contribution indirecte
(12) kariz
(13) Dchamchaman
(14) Siazuros
(15) Chehr-Firouz
(16) Caverne de la sorcière bleue

**سەرچاوە:**

Cuinet Vital, *La Turquie d'Asie: géographie administrative, statistique, descriptive et raisonnée de chaque province de l'Asie-Mineure*, Paris, 1890, p : 860-873

# چالاکی پیشەگەری لە کوردستانی سەردەمی عوسمانی لەژێر ڕۆشنایی گەشتنامەکاندا

پ.د. سەعدی عوسمان هەروتی
کۆلێژی ئەدەبیات/ زانکۆی سەلاحەددین – هەولێر

## پێشەکی

مێژوونووسانی سەردەمی عوسمانی بەشێوەیەکی سەرەکی تەنیا بایەخیان بەتۆمارکردنی ڕووداوە سیاسییەکان دەدا، بۆیە زۆربەی هەرەزۆری کتێبە مێژووییەکانیان زانیاری ئەوتۆیان سەبارەت بە باری کۆمەلآیەتی و ئابووری و لایەنەکانی تر تێدا نەبوو. هەرچی ئەو گەڕیدانە بوون کە بەناوچەکانی سەر بە ئیمپراتۆریای عوسمانیدا گەشتیان دەکرد، ئەوا بە پێچەوانەی ئەوان، سەرنجی ژیانی میللەتان و شێوازی بژێوی و هەروەها چالآکییە ئابوورییەکانیان دەدا و دواتر سەرنج و تێبینییەکانی خۆیان لەمەڕ ئەم لایەنانە لەو کتێبانە تۆمار دەکرد کە بۆ ڕووداوەکانی گەشتەکەیان تەرخان کردبوو. بۆیە هەندێ لەو گەڕیدانەی کە بەناوچە کوردییەکاندا تێپەڕیون، زانیاریی گرنگیان لە بارەی چالآکی پیشەگەری و بەرهەمی پیشەسازی ئەم ناوچانە بۆ بەجێ هێشتووین. ئەمەش جێگەی بایەخی ئێمەیە لەم توێژینەوەیەدا. لەمیانەی ئەم توێژینەوەیەدا هەوڵ دەدەین بەدوای ئەم زانیارییانەدا بچین، لەپێناو هەڵوەستە لەسەرکردنیان و بەراوردکردنیان. تا لەکۆتاییدا بزانین ئەم گەشتنامانە وەکو سەرچاوەی مێژوویی چەندە بەسوودن بۆ نووسینەوەی مێژووی چالآکی پیشەگەری لە کوردستانی سەردەمی عوسمانیدا.

بابەتی ئەم باسە وا دەخوازێ کە ڕێبازی پێکهاتەیی (ترکیبي) پەیڕەو بکەین لە توێژینەوەدا، چونکە دەمانەوێ ئەم زانیارییە پچڕپچڕانە کۆ بکەینەوە کە لەم گەڕیدانەوە بۆمان جێ ماوە، لەپێناو وێناکردنی باری پیشەگەری ئەو سەردەمەی کوردستان بە لایەنە جیاوازەکانییەوە. بەتایبەتی بۆ ناسینی گرنگترین پیشە باوەکانی ئەو سەردەمە و ئاستی لێهاتوویی پیشەگەرانی کورد لە بەرهەمهێنانی

کالاَ پێویستەکان، هەروەها زانینی ڕادەی پەرەسەندنی بەرهەمی پیشەگەری لە کوردستاندا. بەلاَم ڕێبازی شیکاری (تحليلي)ش بەکاردێنین لە هەمبەر زانیارییەکانی بەردەستمان، بۆ هەلَێنجانی ڕاستییەکان و زیاتر ڕوونکردنەوەی بارودۆخەکە. بەتایبەتی کاتێ دەمانەوێ ئەو کۆسپ و تەگەرانە دیاری بکەین کە دەهاتنە بەردەم چالاکی پیشەگەری لە کوردستاندا. مەسەلەیەکی بەلَگەنەویستیشە کە بەشێوەیەکی سەرەکی پشت بە گەشتنامەکان ببەستین بۆ نووسینی ئەم توێژینەوەیە. بەلاَم کە پێویست بێ سەرچاوەی تریش بەکار دەهێنین، بۆ زیاتر ڕوونکردنەوە.

لە کۆتاییدا دەبێ ئەوە ڕوون بکەینەوە کە ئێمە لەو توێژینەوەیەدا لە بەکارهێنانی زاراوەکانی (پیشە) و (پیشەگەری) مەبەستمان پیشەسازی دەستییە، کە بەعەرەبی پێی دەگوترێ (الحرفة) یان (الصناعات اليدوية) و بە ئینگلیزیش (craft). واتا ئێمە زاراوەی پیشە بە واتا گشتییەکەی بەکار ناهێنین کە هەموو کار و فرمانێك لەپێناو پەیداکردنی بژێوی، دەگرێتەوە. ئەمەی دوایی لە عەرەبیدا وشەی (المهنة)ی بۆ بەکاردێ.

**دەروازە:**

**دیارترین ئەو گەڕیدانەی سەردانی کوردستانیان کردووە لەم ماوەیەدا**

چەندین هۆکار هەبوون کە هانی ئەورووپییەکانیان دەدا بۆ ناسینی ڕۆژهەلاَت[1] و گەشتکردن بۆی. بەلاَم ئەوەی لەنێویاندا بەلای ئێمەوە گرنگە، هۆکاری ئابوورییە کە بریتی بوو لە هەولَی زانیاری پەیداکردن لەسەر سامانی ناوچەکە و توانا ئابوورییەکانی. ئەویش لەپێناو ڕێگا خۆشکردن بۆ ولاَتەکانیان تا سوود لەم سامان و توانایانە وەربگرن. لەم بارەیەوە دەتوانین بلَێین تەنانەت ئەو گەشتانەی لە چوارچێوەی شاندی زانستیش کراون، ئامانجیان ئەوە بوو لە نزیکەوە شارەزای ناوچەکە و چالاکییە ئابوورییەکانی بن، هەروەکو لە دێرەکانی داهاتوودا بەدیار دەکەوێ. ئەوەی گرنگە ئەوەیە کە ئەم هۆکارە بووەتە هاندەر بۆ گەڕیدەکان کە بایەخ بەلایەنی ئابووری بدەن لەکاتی سەرنجدانی بارودۆخی ئەو ناوچانەی کە بۆی دەچوون. بەلاَم دەبێ ئەوەش بلَێین کە ئەم گەڕیدانەی ئەم توێژینەوەیە

دەیانگرێتەوە، هەموویان خەڵكی ڕۆژئـاوا نـین ئەگەرچـی ئـەوان زۆرینـەن. ئـەوەتا گەڕیدەی عوسمانی (ئەولیا چەلەبی)مان هەیە كە لەناوەڕاستی سـەدەی حەڤـدەم ئارەزووی بینین هانی دا بۆ سەفەركردن و گەڕان، ئنجا تۆماركردنی زانیاری لەسەر ئەو ناوچانەی كە سەردانی كردوون. هەروەها گەڕیدەی هیندی بە ڕەچەڵەك ئێرانی (ئەبو تالیب خـان / ١٧٥٣-١٨٠٦ز) كـە لـە سـاڵانی سـەرەتای سـەدەی نـۆزدەم بەناوچە كوردییەكانی سەر بەئیمپراتۆریای عوسمانی تێپەڕی، كاتیَ لـە گەشـتێكی بۆ ئـەوروپا دەگەڕایـەوە.[٢] ئـەم گەڕیدەیـەش هەنـدیَ زانیـاری بـۆ نووسـیوین كـە دەكریَ سوود لە هەندێكیان وەربگرین لە بواری نووسینەوەی مێژووی پیشـەگەری لە كوردستاندا.

لەبەرئـەوەی ئـەم توێژینەوەیـە پشـت بەكتێبـەكانی گەڕیـدە و گەشـتیارەكان دەبەسـتیَ، بۆیـە پێویسـتە بـەكورتی دیـارترین ئـەم گەڕیدانـە بناسـین، كـە بەشێوەیەكی بەرچاو سوودمان لە زانیارییەكانیان بینیوە. ئەگەر بەپێی زنجیرەی زەمەنی بڕۆین، دەبیَ سەرەتا لە (ئەولیا چەلەبی)یەوە دەست پیَ بكەین.

گەڕیدەی بەناوبانگی عوسمانی (ئەولیا چەلەبی) لە ساڵی ١٦٥٥ كتێبی (أوليـا چلبی سياحتنامەسی) داناوە كە شەش بەرگە. هەرچەندە ئەم كتێبە لـە بنەڕەتـدا بەزمانی توركی نووسراوە، بەڵام ئێمە سوودمان لە وەرگێڕانە كوردییەكەی بینیوە كـە هـی (ناكـام) ـە. ئـەم وەرگێـڕە ئـەو بەشـانەی كتێبەكـەی هەڵبـژاردووە، كـە پەیوەنـدییان بەكوردسـتانەوە هەیـە و وەری گێڕاوەتـە سـەر زمـانی كـوردی بەناونیشـانی (كـورد لـە مێـژووی دراوسـێكانیدا/ یـان: سـیاحەتنامەی ئـەولیا چەلەبی).[٣] كتێبەكە ئەم سەرنج و تێبینییانە لەخۆ دەگریَ، كە گەڕیدەی نـاوبراو لە بارەی ئـەو ناوچـانەی بینیـوێتی تۆمـاری كـردووە. سـەرنجەكانیش لایەنـەكانی كـارگێڕی، ئـاوەدانی، ئـابووری، كۆمەڵایـەتی، مێـژوویی و هـەروەها سیاسـیش دەگرێتـەوە. بۆیـە ئـەم كتێبـە كەرەسـتەیەكی فـرەی تێدایـە لـە بـارەی لایەنـە جیاوازەكـانی ژیـان لـەم ناوچـانە. لەنێویانـدا چـالاكی پیشـەگەری لـە ناوچـە كوردییەكان كە جێگەی بایـەخی ئـەم گەڕیدەیـە بـوو. هەرچـەندە ئـەولیا چـەلەبی بێلایـەن نییـە و لـە گێڕانـەوەی ڕووداوەكانـدا بـەلای دەوڵـەتی عوسمانیـدا دەشـكێنێتەوە، بـەو پێیـەی ئـەو فەرمانبـەرێكی عوسمـانی بـوو، بـەڵام وردیـی

تێبینییەكانی ئەم گەڕیدەیە و هاوچەرخبوونی لەگەڵ زۆربەی ئەو ڕووداوانەی نووسیویێتی، لەگەڵ سەرنجی فراوان و زۆریی زانیارییەكانی، بایەخێكی دیار دەبەخشنە كتێبەكە.

لە بەرایی ئەو گەڕیدە ئەوروپییانەش كە پشتمان بەكتێبەكانیان بەستووە، كارستن نیبور (١٧٣٣-١٨١٥ز)ی بەڕەچەڵەك ئەڵمانی و بەڕەگەزنامە دانیماركییە، كە لەچوارچێوەی شاندێكی زانستی (Danish Arabia Expedition) بۆ هەندێ لە وڵاتانی ڕۆژهەڵات، دەستی بە گەشت كرد و لەساڵی ١٧٦٦ هاتە كوردستان. نیبور زانیاری زۆری تۆمار كردووە لە بارەی ئەو ناوچانەی كە پێیاندا تێپەڕیوە، لەنێویشیاندا هەندێ زانیاری تایبەت بە باری ئابووری كوردستان هەیە كە دەكرێ سوود لە هەندێكیان وەربگیرێ بۆ زانینی بارودۆخی پیشەگەری. ئێمە پشتمان بە وەرگێڕانە عەرەبییەكەی ئەم كتێبە بەستووە كە گەشتی نیبور لە عیراقدا دەگرێتە خۆ و بەناونیشانی (رحلة نيبور الى العراق في القرن الثامن عشر) چاپ كراوە.[٤]

هەرچی گەڕیدەی فەرەنسی (ئۆلیڤیێ/ ١٧٥٦-١٨١٤ز)یە، لەسەر ڕاسپاردەی دەسەڵاتدارانی وڵاتەكەی و زیاتر بەمەبەستی سیاسی بەڵام لە پێناو بەرژەوەندی ئابووری و زانستیش، لە هەرێمەكانی ئیمپراتۆریای عوسمانی و وڵاتی فارس، دەستی بەگەڕان كردووە. ئەنجومەنی ڕاپەڕاندنی كاتیی شۆڕشی فەرەنسی لە ڕێگەی ئەم گەشتەوە دەیویست شارەزایی لە بارەی ئەم ناوچانە پەیدا بكا، بەتایبەتی لە ڕووی پەیوەندیی بازرگانی و چالاكی كشتوكاڵی و پیشەسازی و هەروەها مێژووی سروشتی و جوگرافیا، سەرباری ئاشنابوون بە هەلومەرجی سیاسی. ئۆلیڤیێ لە ماوەی ساڵانی ١٧٩٤-١٧٩٦دا سەردانی ناوچە كوردییەكانی كرد. ئەم گەشتنامەیە بەسەرچاوەیەكی زۆر گرنگ دادەنرێ بۆ مێژووی ناوچەكە لە ماوەی كۆتایی سەدەی هەژدەمدا، چونكە ئۆلیڤیێ لە چوارچێوەی ئەركەكەیدا تێبینییەكانی بەوردی تۆمار كردووە و لێهاتووانە "شوێنەكانی دیاری كردووە و دوورییەكانی ساغ كردۆتەوە، هەروەها داهاتە سروشتی و بەروبوومە كشتوكاڵی و بەرهەمە دەستكردەكان و پیشەگەری و ڕێگاكانی هاتوچۆی وەسف كردووە، لەگەڵ باری ئابووری و سەربازی و سیاسی"، ئەمەش بەپێی دەربڕینی (يوسف حبي) كە كتێبەكەی وەرگێڕاوەتە سەر عەرەبی.[٥]

(کلۆدیۆس جێمس ریچ)ی بریتانیش کە جێنشینی ئەم وڵاتە بوو لە بەغدا لە ماوەی ساڵانی ١٨٠٨–١٨٢١دا، لە ساڵی ١٨٢٠ گەشتێکی بۆ کوردستان کرد و سەردانی ناوچەکانی باشووری کوردستانی کرد، بەتایبەتی کەرکووك و سلێمانی و هەولێر و مووسڵ. ئنجا لە سنووری عوسمانی– قاجاری پەڕییەوە بۆ بینینی ناوچەکانی ڕۆژهەلاتی کوردستان بەتایبەتی (سنە)ی مەڵبەندی میرنشینی ئەردەلان و هەندێ ناوچەی تری دەوروبەری. دواتر ڕووداوەکانی گەشتەکەی لە کتێبێکدا نووسیوە بەناوی (باسی مانەوە لە کوردستان و نەینەوای کۆن)، کە بینین و سەرنجەکانی لە بارەی ئەو ناوچانەی سەردانی کردوون، لەخۆ دەگرێ. ئەم کتێبە بە یەکێك لە سەرچاوە گرنگەکان دادەنرێ لە بارەی هەلومەرجی سیاسی، ئابووری و کۆمەلایەتیی کوردستان لەم ماوەیەدا. ئێمەش پشتمان بە وەرگێڕانە عەرەبییەکەی کتێبەکە بەستووە، کە هەندێ لە بەشەکانی دەگرێتەوە و بەناونیشانی (رحلة ريج في العراق عام ١٨٢٠) چاپ کراوە.[٦]

لەنێو گەشتنامەکانی ئەم گەڕیدانەدا، کتێبەکەی دیپلۆماتکاری بریتانی (جیمس برانت) بایەخێکی زێدەی هەیە. لەبەرئەوەی زانیاریی زۆر وردمان دەداتێ لە بارەی چالاکی پیشەگەری و باری پیشەسازی لە باکووری کوردستاندا. ناوبراو کە کونسوڵی بریتانیا بوو لە ئەرزەڕۆم، لە ساڵی ١٨٣٨دا گەشتێکی لە بارەگاکەی خۆیەوە بۆ (بایەزید) کرد و بەهەردوو شاری (وان) و (مووش)دا تێپەڕی. هەرچەندە (برانت) هەڵوێستێکی نەرێنی هەبوو لە هەمبەر کورد، بەلام هەندێ جاریش پەسنی ئەوان دەدات و بەداخەوە باسی بارودۆخی نالەباری کوردان دەکات لە ژێر حوکمی عوسمانیدا، بەمەش بێلایەن و بابەتییانە دێتە بەرچاو.[٧]

سەبارەت بەهەلومەرجی کوردستان و چالاکی پیشەگەری دانیشتووانی لە کۆتاییەکانی سەدەی نۆزدەمدا، گەڕاینەوە بۆ بینینەکانی گەڕیدەی فەرەنسی (هێنری بێندەر) کە لە ساڵی ١٨٨٥دا گەشتێکی بەرەو گورجستان و ئەرمەنستان و ئێران و کوردستان و عیراق کرد، دواتر لە ڕێگەی ئێران و ڕوسیاوە گەڕایەوە بۆ وڵاتەکەی. ئێمە سوودمان لە وەرگێڕانە کوردییەکەی ئەم گەشتنامەیە بینی کە (ئەبوبەکر خۆشناو) ئەنجامی داوە.[٨]

سەبارەت بە کۆتاییەکانی سەردەمی عوسمانی، پشتمان بەگەشتنامەی (ئیلی بانستەر سۆن/ ١٨٨١-١٩٢٣) بەستووە کە کەسێکی ئینگلیزە بەڵام وەك بازرگانێکی ئێرانی ناو (میرزا غولام حوسێن شیرازی) گەشتی کردووە، و لە ساڵی ١٩٠٧ هاتۆتە وڵاتی میزۆپۆتامیا و کوردستان. چونکە کتێبەکەی ( through Mesopotamia and Kurdistan in disguise) کە وەرگێڕدراوەتە سەر زمانی عەرەبی بەناونیشانی (رحلة متنكر الى بلاد مابين النهرين وكردستان) و لە دوو بەرگ پێکهاتووە، زانیاریی گرنگی تێدایە کە دەکرێ لە بواری نووسینەوەی مێژووی پیشەگەری لە کوردستاندا بەکاربهێنرێن. بەتایبەتی کە (سۆن) پەیوەندی بەتینی لەگەڵ خەڵکی وڵاتەکە دروست کردبوو، بەخەڵکی ڕەشۆکی و بازرگان و زەبرەبەدەستانیشەوە. ئەو تەنانەت لە هەندێ ناوچە وەك کوردێکی باشووری کوردستان خۆی دەردەخست. زانینی زمانی کوردیش لەم بارەیەوە یارمەتیدەری بوو.[٩]

سەرباری ئەم گەڕیدانە، گەڕیدەی تریش هەن کە لە سەردەمی عوسمانیدا هاتوونەتە ناوچەکە، بەڵام ئێمە بەڕێژەیەکی کەمتر سوودمان لێ بینیون یان زانیارییەکانیان بەکەڵکی ئەم توێژینەوەیە نەهاتوون. بۆیە بەپێویستی نازانین لێرەدا باسیان بکەین.

## أ- ئەو پیشانەی لەو سەردەمەدا لە کوردستان هەبوون:

هەرچەندە زۆرینەی دانیشتووانی کوردستان لە سەردەمی عوسمانیدا خەریکی کشتوکاڵ بوون، بەو پێیەی کشتوکاڵ بڕبڕەی پشتی ئابووری کوردستانی پێکدەهێنا. بەڵام ڕێژەیەکی بەرچاوی دانیشتووانیش بەتایبەتی لە شارەکاندا، خەریکی کاری پیشەگەری بوون بۆ بەدەستهێنانی بژێویی خۆیان. زۆربەی ئەم پیشانەش دەخرانە چوارچێوەی چالاکیی پیشەسازی کە بەهۆیەوە بەشێك لە پێداویستییەکانی کۆمەڵگەی کوردستانی دابین دەکرا. لەبەرئەوەی ئەمانە ڕۆڵ و ئەرکی کەرتی پیشەسازییان دەبینی کە لە سەردەمی ئێستاماندا بە بناغەی پەرەسەندنی وڵاتان دادەنرێ.

زانیارییـــەکانی گەڕیـــدە و گەشـــتیارەکان یارمەتیـــدەرێکی باشـــن بـــۆ زانـــینی گرنگترین ئـەو پیشـانەی کـە لـەم ماوەیـەدا لـە کوردسـتان بـاو بـوون. بەتایبـەتی گەڕیدەی عوسمانی ئەولیا چەلەبی کە لەم بارەیـەوە زانیـاریی تـەواومان دەداتـێ. ئەم گەڕیدەیە لە میانەی ئاماژەکانی بۆ پیشەی دانیشتووانی هەندێ لە شـارەکانی باکووری کوردستان (بەتایبەتی: ئامـەد، وان، مـاردین، بـەدلیس، مەلاتیـە)، نـاوی چـەندین پیشـە دەهـێنێ کـە لـەم سـەردەمەدا ناسـراو بـوون، وەکـو: زێڕنگـەری و زیوگـەری، مسـگەری و نەقاشـی، ئاسـنگەری، بـەننایی، پـێڵاودروو، کورتانـدروو، بەرگـدروو و نەخشـاندن، دەبـاغی و چەرمسـازی، بۆیەسـازی، جـۆلایی و چـنین، ڕستنی خوری و لۆکە و خاوی ئاوریشم. هەروەها ئاماژە بە حەکیمی و برینپێچیش دەکات وەکو پیشەیەك کە هەندێ خەڵکی شارەزا لەم بوارەدا کردوویانە.[10]

هەرچـی کونسـوڵی بریتـانی (جـیمس برانت)ـە بـەوردی سـەرنجی پیشـەی دانیشـتووان و کـالا و بەرهەمـە خۆماڵییـەکانی داوە، ئەمـەش لـە چوارچـێوەی هەوڵەکانی بۆ کۆکردنەوەی زانیاری لە بارەی چالاکییە ئابوورییەکان لەو ناوچانەی سـاڵی ١٨٣٨ سـەردانی کـردوون. بەوردبوونـەوە لـەو زانیارییانـە دڵنیـا دەبـین لـە هەبوونی چەندین پیشە لەو ناوچانە، ئەوەتا ناوبراو ئاماژە بەپێڵاوی دروستکراوی ئەرزەڕۆم دەکات، و پەسنی ئەو کەلوپەلانەش دەکـات کـە لـە دەوروبـەری مـووش دروست دەکران. هەروەها هـەبوونی کارخانەیـەکی خۆشـکردنی پێسـتە لـە شـاری پالۆ و بۆیەخانەیەکی کووتاڵ لە هەریەکە لـە پـالۆ و بـەدلیس دووپـات دەکاتـەوە. ئەوەش دەزانین کە لە چیاکانی بـاکووری ئـەم ناوچـانە هەنـدێ خـەڵك بەپیشـەی دروستکردنی خەڵووزی دار خەریك بوون. لە ڕێگای چوونیشی بۆ بەدلیس، (برانت) ئاگـاداری دروسـتکردنی عەرەبانـەی دار دەبێـت. هـەروەها دەڵـێ کـوردان لـە کەنارەکانی دەریاچەی وان سابوونیان بەرهـەم دەهێنـا و هەندێکیشـیان خـەریکی ڕاوە ماسی بوون.[11] ئەمە سەرباری ئاماژە زۆرەکانی بۆ پیشەی چـنین و جـۆلایی لە زۆربـەی ئـەو ناوچـانەی کـە بینیویـەتی، بەگوتـەی ئـەو کارخانـەکانی کووتـاڵی خوری ولۆکەیی لە چەندین شاری باکووری کوردستان بلاو ببوونەوە.[12]

زانیارییەکانی هەندێ گەڕیدەی تریش گـەواهی لەسـەر بلاوبوونـەوەی پیشـەی چنین و دروسـتکردنی کووتـاڵ لـە دەڤـەرەکانی تـری کوردسـتان دەدەن. ئـەوەتا

گەڕیدەی ئینگلیزی (ئیڤز) لە ساڵی ١٧٥٨دا ئاماژە بەوە دەكا كە دانیشتووانی شارۆچكەی (داقووق) كە دەكەوێتە باشووری كەركوك ، بژێویی خۆیان لە پەروەردەكردنی كرمی ئاوریشم و چنینی كووتاڵی ئاوریشم بەدەست دێنن. هەروەها دەڵێ خەڵكی شارۆچكەی (كرملیس) لە دەوروبەری مووسڵ، بەچنینی هەندێ چنراوی كەتانی زبر خەریكن.[١٣] (ئۆلیڤیێ)ش باسی چنینی هەندێ كووتاڵی خوری و لۆكەیی دەكا، كاتێ دێتە سەر باسی پیشەی دانیشتووان لە باكووری كوردستان، بەتایبەتی لە شاری ماردین.[١٤] لە ساڵی (١٩٠٧)یش (مێجەر سۆن) كەسێكی لە (پردێ / ئاڵتون كۆپری) بینی كە خەریكی پیشەی چنینی ڕایەخ بوو. هەر لەم شارۆچكەیەدا پینەدۆزێكیشی بینی كە پێڵاوی چاك دەكردەوە.[١٥]

ڕووداوە مێژوویییەكان لە چارەكی سێیەمی سەدەی هەژدەم بەڵگەی هەبوونی پیشەگەران لە قەڵاچواڵانی مەڵبەندی میرنشینی بابانیش بەدەستەوە دەدەن.[١٦] كاتێكیش لە ساڵی ١٧٨٤دا شاری سلێمانی بنیاد نرا و كرایە ناوەندی میرنشینەكە، ئەم شارە چەندین پیشەی دەگرتەخۆ.[١٧] بەتایبەتی پیشەسازی سابوون كە لە ڕێی زانیارییەكانی جێنشینی بریتانی (ریچ) كە لە ساڵی ١٨٢٠دا هاتۆتە سلێمانی، دەزانین لەم شارەدا هەبووە و تەنانەت پەرەسەندنیشی بەخۆوە بینیوە. هەروەها ئاماژەكردنی ناوبراو بۆ هاوردەكردنی ئاسن و مس و پۆڵا بۆ ئەم شارە،[١٨] بەڵگەیە لەسەر هەبوونی هەردوو پیشەی ئاسنگەری و مسگەری لەوێ. (سۆن)یش لە كۆتایییەكانی سەردەمی عوسمانی، باس لە هەبوونی توێژی پیشەگەران دەكا لەم شارەدا، و بەشێوەیەكی تایبەت ئاماژە بە پیشەكانی "دروستكردنی پێڵاو و كورتاندروو، و چێكردنی خەنجەر و تفەنگ" دەكات.[١٩] لە شاری كەركووكیش ئەم گەڕیدە ناوبراوە لە دووكانی كورتاندرووێك دانیشت. هەروەها ئاشنایەتی لەگەڵ كوردێكی ڕۆژهەڵاتی كوردستان پەیدا كرد، كە لە ئەستانبوڵ پیشەی شیرنەمەنی دروستكردن فێر ببوو ئنجا دووكانێكی دروستكردن و فرۆشتنی شیرنەمەنی لە كەركووكدا كردبۆوە.[٢٠] بێگومان خەڵكی ئەم شارە لەم ماوەیەدا زۆر پیشەی تریشیان هەبوو، لە هەندێكیشیاندا ناوبانگییان پەیداكردبوو. چونكە ساڵنامەكانی[٢١] عوسمانی باس لە هەبوونی چەندین بواری پیشەگەری

دەکەن لەم شارەدا، لەوانە: بەرگدوورین، دارتاشی، ئاسنگەری، کورتاندروو، چنین و تەونکردن، دروستکردن وچاکردنەوەی پێڵاو، چەخماخسازی، سەعاتچی، دروستکردنی قاپ و قاچاغی مس، گلێنەسازی، زێڕنگەری و زیوگەری.[22] لە کتێبی (قاموس الاعلام)یش کە لە کۆتاییەکانی سەدەی نۆزدەمدا دەرچووە، هاتووە کە لەم شارەدا (٢٠) دەستگای چنینی کوتاڵی لۆکەیی و خوری و کەتان هەیە. سەرباری پیشەسازی کندڕ و پێستەخۆشکردن و دروستکردنی ڕایەخ و هەروەها چەقۆ و ئامرازە برینداركەرەکان.[23]

گومان لەوەدا نییە، ئەم پیشانەی پێشتر باسمان کردن، هی دانیشتووانی شارەکان بوون، چونکە چالاکی پیشەگەری زیاتر پەیوەستە بە شار، هەروەها ئەم زانیارییانەشی کە خستمانە ڕوو بەڵگە بوون لەسەر ئەمە. بەلام خەڵکی گوندەکانیش هەندێ کاری پیشەگەرییان دەکرد. بۆ نموونە (ریچ) دەڵێ "جووە دێهاتییەکان لە کوردستان بەپیشەی بۆیەسازی خەریك بوون"،[24] بێگومان مەبەستی بۆیەسازی کوتاڵە کە دەکاتە خمچێتی. هەروەها (ئەبوتالیب خان)ی گەڕیدەش لە گوندێکی کوردان کە ٢٤ میل لە نسێبینەوە دوور بوو، لەماڵی دارتاشێکی کورد مێوانداری کرا. ئەم گەڕیدەیە دەڵێ لەم ماڵەدا خواردنێکی باشی خوارد و لە پێخەفێکی گەرم و نەرمدا نووست.[25] ئەمەش بەڵگەیە لەسەرئەوەی ئەم دارتاشە کەسێکی زەنگین بووە. لەوانەشە پیشەی دارتاشی و دەستکەوتی باشی هۆکاری ئەمە بووبێ. هێنری بێندەری گەڕیدەی فەرەنسی و هاوەڵەکانیشی لە یەکێك لە شەوەکاندا لە دووکانێکی ئاسنگەری مانەوە، کاتێ لە ڕێگایان بەرەو شاری وان لایاندایە گوندێك.[26] هەر ئەم گەڕیدەیە ئاماژە بە پیشەی دروستکردنی لباد دەکات لە دەواری یەکێك لە هۆزە کوردییەکان.[27] لەم بوارەدا جێگەی سەرنجە کە هەندێ کاری پیشەگەری تەنیا لە دەرەوەی شارەکاندا هەبوون، بەتایبەتی لە شوێنە دوورەدەستەکان. وەکو پیشەی بەرهەمهێنانی خەڵووزی دار، کە خەڵك لە شاخەکاندا دەیانکرد. چونکە لەوێ دارستان هەبوو کە سەرچاوەی دار و تەختەیە.[28]

ئەگەر لێرە هەڵوەستەیەك بکەین، دەبێ بڵێین هەبوونی ئەم پیشەگەرە تایبەتمەندانە لەم گوندانە لە تەك جووتیاران کە زۆرینەی دانیشتووانی

گوندەكانیان پێكدەهێنا، بەڵگەیە لە سەر هەنگاوە بەراییەكانی كرداری جیابوونەوەی پیشەگەری لە كشتوكاڵ و پەیدابوونی تایبەتمەندی لە كار. بێگومان ئەم كردارەش ئاساییە كە لە ماوەی لاوازبوون و لێكهەڵوەشانەوەی ڕژێمی دەرەبەگایەتیدا ڕوودەدات.

پێش تەواوكردنی باسی پیشەكان، پێویستە بگوترێ بەشێ لە گەڕیدەكان تێبینی ژمارەیەكی زۆری ئاشی ئاویان كردووە لە هەندێ ناوچەی كوردستاندا. ئەمەش بەڵگەیە لەسەر هەبوونی پیشەی (یان لە ڕاستیدا: پیشەسازی) هاڕینی دانەوێڵە لەم وڵاتە لە ماوەی ناوبراودا. بۆ نموونە نیبۆر "ژمارەیەكی زۆر لە ئاشی ئاوی" لە ڕێگای نێوان كەركووك و پردێ (ئاڵتون كۆپری) بینی.[٢٩] هەرچی (ریچ)ـە ئاماژە بەزنجیرەیەك ئاش دەكات لەسەر هەردوو كەناری ڕووباری لەیلان لە ڕۆژهەڵاتی شاری كەركوك. هەروەها ژمارەیەك ئاشی تری لە ڕێگای نێوان كۆیە و پردێ بینی.[٣٠] ئەم ئاشە ئاوییانە لە باكووری كوردستانیشدا هەبوون، وەك لە زانیارییەكانی گەڕیدەی عوسمانی (ئەولیا چەلەبی)،[٣١] و بریتانی (جیمس برانت) دەردەكەوێ.[٣٢] شایانی باسە، دانەوێڵە بەتایبەتی گەنم و ئەو ماددانەی لێی بەرهەم دێن، لە ڕابردوودا و ئێستاش خۆراكی سەرەكی دانیشتووانی كوردستان پێكدەهێنن.[٣٣] بۆیە گومان لەوەدا نییە كە ئەم ئاشانە ڕۆڵێكی گرنگیان بینیوە لە ئاسانكردنی ژیانی تاك لەم ماوەیەدا.

لە كۆتاییدا تێبینی ئەوە دەكەین كە لەدوادواكانی سەردەمی عوسمانیدا پیشەی بەرگدوورین لە كوردستاندا بەربڵاو بووە، بە بەڵگەی ئەوەی كۆمپانیای (سنجەر) بۆ ئامێری دروومان لەم ماوەیەدا لە كەركووك وەكیلێكی هەبووە. مێجەرسۆن دەڵێ ئەم پێداویستییە گەیشتبووە "ناوچە دوورەدەستەكانیش".[٣٤] بەڵام ناتوانین بڵێین هەموو ئەوانەی ئەم ئامێرەیان كڕیوە پیشەی بەرگدروویان هەبووە، چونكە لەوانەیە هەندێكیان تەنیا بۆ كاری ناوماڵ بەكاریان هێنابێ.

### ب- دەرهێنانی كانزاكان:

كوردستان لە ڕووی سامانی سروشتییەوە دەوڵەمەندە، بەجۆرێك كە لە پێداویستی خۆماڵی زیاد دەكات و دەتوانێ هەندێكیان هەناردەی هەرێم و وڵاتانی

دەوروبەر بکات. بەتایبەتی ناوچە شاخاوییەکانی کە دارستانی چڕ و دارودرەختی جۆراوجۆری وای هەیە کە دانیشتووان دەتوانن هەندێ کاڵای بازرگانی گرنگیان لێ دەستکەوێ.[٣٥] وەکو مازوو[٣٦] کە بەپێی گوزارشی (تاڤەرنێ)ی گەڕیدەی فەرەنسی "بۆ بازرگانی بەرەواج بوو".[٣٧] و بەڕێژەی زۆر هەناردەی وڵاتە ئەوروپییەکان دەکرا.[٣٨] هەروەها خاکی کوردستان چەندین جۆری کانزای لەنێو ناخی خۆیدا هەڵگرتووە، کە دانیشتووان هەندێکیانی دۆزیوەتەوە و توانیویەتی دەریانبهێنێ و بۆ پێداویستییەکانی خۆی بەکاریان بهێنێ، هەروەکو لەم دێرانەی داهاتوو بەدیار دەکەوێ:

زۆربەی گەڕیدەکان بەهەبوونی هەندێ جۆری ئەم کانزایانەیان زانیوە کاتێ بەناوچە کوردییەکاندا تێپەڕیون، بۆیە لە کتێبەکانیان زانیارییان لەم بارەیەوە تۆمار کردووە. وەکو گەڕیدە (نیبور) کە لە سەروبەندی باسکردنی ناوچەکانی دەسەڵاتی میری بادینان، دەڵێ ئەم میرە "چەندین کانی قورقوشم و ئاسنی هەیە، هەڵدەستێ بەدەرهێنان و سوود لێبینینیان".[٣٩] سەرچاوەیەکی مێژوویش دروستیی ئەم زانیارییە دووپات دەکاتەوە، کە ئاماژە بۆ دەرهێنانی هەندێ کانزا دەکا لە ناوچەی بادینان، بەتایبەتیش ئاسن و زەرنیخ. هەروەها دەڵێ: " لەوێوە دەگوازرێتەوە بۆ هەموو وڵاتان". ئەمەش بەڵگەیە لەسەر دەرهێنانی ئەم کانزایە بە بڕێکی زۆر.[٤٠] بەڵام دیارە کرداری دەرهێنانی ئەم کانزایانە دوای ڕووخانی میرنشینی بادینان وەستاوە، ئەویش بەهۆی خەمساردیی دەسەڵاتدارانی عوسمانی کە ڕاستەوخۆ حوکمی ناوچەکەیان گرتە دەست. ئەوەتا گەڕیدەی فەرەنسی هێنری بێندەر کە لە کۆتاییەکانی سەدەی نۆزدەم سەردانی ئامێدی (ناوەندی دەڤەری بادینان) ی کردووە، بۆمان دەنووسێ ئەو سەردارە عوسمانییەی لەسەر ئامێدی داندراوە، لای ئەو سکاڵای کردووە لە دەست وەڵامە بێ ئومێدکەرەکەی دەسەڵاتدارانی عوسمانی، کاتێ زانیاری پێداون لە بارەی هەبوونی هەندێ کانزا لە ناوچەکە.[٤١]

نیبۆر زانیاریی تریشمان دەداتێ لە بارەی هەبوونی کانزای تر لە ناوچەکانی باشووری کوردستان، کاتێ ئاماژە بەزۆری کانەکانی خوێ و قیر و نەوت دەکات لە نزیك شارۆچکەی توزخورماتوو کە دەکەوێتە باشووری کەرکووك. هەروەها باس لە

هەبوونی چاوگی قیڕ و نەوت دەكات لە نزیك كەركوك، بەتایبەتی لەو شوێنەی پێی دەگوترێ (باباگوڕگوڕ).[٤٢] كە بەپێی گوتەی ئەو گەڕیدەیە زەوییەكەی زۆر گەرم بووە و ئاگری لێ هەستاوە.[٤٣] دروستیی ئەم زانیارییە لەلایەن گەڕیدەی ئینگلیزی (جیمس بیكنگهام)یش دووپات دەكرێتەوە كە لە تەمووزی ١٨١٦ هاتۆتە كەركوك، ، ئەمەش كاتێ دەنووسێ: "لێرە گوێبیست بووم كە ژمارەیەكی زۆر چاوگی نەوت لە تەنیشت كەركوك هەیە، و زەوییەكیش هەیە كە ئاگر لە ناخییەوە دەردەچێ و خەڵك دەیبینی كە زۆر گەورەیە و لە جیهاندا وێنەی نییە...".[٤٤] ئەمەش ئاماژەیە بۆ نزیكیی نەوتەكەی ئەم شوێنە لە ڕووی زەوی، لەوانەشە لەم كاتەوە گازی سروشتی لەوێدا هەبووبێ. سەبارەت بەسوود وەرگرتنی دانیشتووان لەم كانزایانە، بەتایبەتی نەوت، نیبور دەڵێ نەوتی توزخورماتوو لە جۆری ئاسایی ڕەشە و داواكاری لەسەرە، خەڵك وەكو سووتەمەنی بەشێوازی جۆربەجۆر بۆ چراكانیان بەكاری دەهێنن، چ لەم ناوچەیە یان لە ناوچەی تری وەكو بەغدا. ئەمەش بەڵگەیە لەسەر دەرهێنانی ئەم نەوتە بەڕێژەی زۆر. بەتایبەتی كە ئەم نەوتە بەكارهێنانی تریشی هەبوو. ئەوەتا نیبور دەڵێ ڕەوەندەكان (البدو) و جووتیاران لە سەرەتای بەهاردا حوشترەكانیان بەم نەوتە سواق دەدەن كاتێ تووكی دەوەرێ، بۆ ئەوەی تووكی نوێی بۆ بێتەوە. هەروەها پێمان دەڵێ كە نەوتی (سپی)ش لە ناوچەكەدا هەبوو، كە خەڵكی ناوچەكە وەكو دەرمان بۆ چابوونەوە لە هەندێ نەخۆشی بەكاریاندەهێنا.[٤٥]

(ئۆلیڤیێ)ش دێتە سەر باسی ئەم بابەتە و شێوازی نەوت دەرهێنانمان بۆ ڕوون دەكاتەوە. ناوبراو شوێنەواری هەندێ گەچی لە نزیك كەركوك بینی، و سەرنجی دا كە نەوت لە خوار ئەمەوە بەچەند ئاڕاستەیەك دێتە خوارەوە. بۆیە دەنووسێ : "ئەوان چەند بیرێك بەقووڵایی پێنج تا دوازدە پێ هەڵدەكەنن، و ڕۆژانە نەوت دەردێنن و كۆی دەكەنەوە و لە كوندەی دەكەن ئنجا بەپشتی كەر هەڵیدەگرن بۆ كەركوك". ئۆلیڤیێ باس لەوە دەكات كە خەڵك لە دەوروبەری كەركوك قیڕیش دەردەهێنن. كاتێكیش بەرەو باشوور دەچێ و دەگاتە نیوەی ڕێگای نێوان كفری و توزخورماتوو، دەڵێ پیاوانی پۆستە پێیان گوتم نەوت لەم چیایەش دەردەهێنرێ كە لە لای چەپیان درێژ بۆتەوە. هەر لەم شوێنە تێبینی

شوێنەواری گەچیشی کرد. سەبارەت بە بەکارهێنانی ئەم ماددانەش، ئۆلیڤیێ لە قسەکانیدا جیاوازی ئەوتۆی لەگەڵ نیبۆردا نییە، چونکە ئەویش دەڵێ نەوت و قیر لەلایەن دانیشتووانەوە بۆ ڕووناککردنەوە و چێشتلێنان بەکاردێن. ئەویش یان بەدانانی فتیلەی لۆکە یان سەپکی زبڵی وشك تیایاندا. زیاتر لەمەش دەڵێ: هەژارەکانی بەغدا "تەنیا ئەو قیرەی لە دەوروبەری کەرکووك دەڕژێ" بەکاردێنن.[٤٦] ئەمەش ئاماژەیە بۆ فراوانی کرداری دەرهێنانی ئەم ماددەیە. لەم بوارەدا جێگەی سەرنجە کە ئەم نەوتەی لە چاوگەکانی کەرکووك دەردەهێنرا، لەلایەن دەوڵەتی عوسمانییەوە بۆ هەندێ مەبەستی سەربازیش بەکاردەهێنرا.[٤٧]

دەرهێنانی نەوت لەلایەن دانیشتووان لە ناوچەی توزخورماتوو تا ساڵی (١٨٢٠)یش بەردەوامی هەبوو. چونکە (ریچ) لە گەشتەکەیدا ئاماژە بە چەند چاوگێکی نەوت دەکات لە دەوروبەری توزخورماتوو، و دەڵێ خەڵکانی گوندەکانی ئەم ناوە بەهۆی گۆزە نەوت دەردێنن. ئنجا یان خۆیان بەکاری دەهێنن یان سوود لە داهاتەکەی وەردەگرن بۆ کاروباری گشتیی خۆیان و بۆ کاری خێرخوازی و هی تر.[٤٨] بەڵام ئەم خەڵکانە لە هەموو بارێکدا مافی هەڵسوکەوتی تەواویان نەبوو لەم بیرانەدا، چونکە بەر لە گەشتەکەی ریچ بەساڵێك، دێهاتییەك بەڕێکەوت چاوگێکی بچووکی نەوتی لە ڕۆژئاوای کفری دۆزییەوە، بەڵام حکومەت دەستگیری کرد و بەقامچی ئەشکەنجەی دا تا بزانن ئایا نەوتی لە چاوگەکە فرۆشتووە بەر لەوەی دۆزینەوەکەی ڕابگەیەنێ.[٤٩]

هەر (ریچ) خۆی باسی کانێکی (خوێ)ش دەکا لە دەوروبەری توزخورماتوو، و دەڵێ برێکی زۆر لەم خوێیە هەناردەی ناوچەکانی سلێمانی دەکرێ، بۆ ئەوەی یەکێ لە بنەماڵە گەورەکان سوود لە داهاتەکەی ببینێ. هەروەها دەڵێ شەب و تەباشیریش لە نزیك چاوگە نەوتییە نێوبراوەکان هەن، بێ ئەوەی دانیشتووان سوود لەم داهاتە سروشتییانە ببینن. بەڵام سوودیان لە هەندێ ماددەی تر وەردەگرت، وەك ئەم تۆزەی بۆ ترشکردنی هەندێ جۆری خۆراك بەکاردەهێنرا، ئەویش بەبڕوای ریچ ترشێکی زاجی بووە. هەروەها دێهاتییەکان ئەو کبریتەشیان بەکاردەهێنا کە لەم ناوچەیە هەبوو بۆ چارەسەرکردنی خورشت و گرووێتی.[٥٠]

وەبەرهێنانی کانەکان لەو پیشانە بوو کە خەڵك لە ناوچەکانی باکووری کوردستانیش هەیانبوو، بەتایبەتی کە ئەم ناوچانە بەچەندین جۆری کانزا دەوڵەمەندن. بەپێی زانیارییەکانی (ئۆلیڤیێ) کانی دەوڵەمەندی قەسدیر و زەرنیخ و کبریت لەم ناوچانەدا هەبوون. ناوبراو گوێبیستی ئەوە بوو کە کانی زیو و قورقوشم و زێڕیش لە نزیك کیپان و ئەرجانا هەن. گوایا ئەوان ئەم کانزایانەیان وەبەر دەهێنا و ئەوەی دەریاندەهێنا دەیاننارد بۆ ئەستانبۆڵ.(٥١) ئەولیا چەلەبیش نزیکەی سەدەیەك و نیو پێش ئەمە ئاماژەی بۆ هەبوونی کانی زەرنیخ کردووە لە چیاکانی دەوروبەری شاری ئەخلات، ناوبراو دەڵێ خەڵك ئەم زەرنیخە بۆ مەبەستی پزیشکی میللی بەکاردەهێنن و هەروەها دەیفرۆشن بۆ ناوچە و وڵاتانی تر.(٥٢)

هەرچی گەڕیدە (ئەبوتالیب خان)ە باس لە هەبوونی چەندین کانی مسی زۆر دەوڵەمەند دەکا لە ئەرکانە.(٥٣) بێگومان ئەم شوێنەش هەمان (ئەرجانا)یە کە (ئۆلیڤیێ) ناوی دێنێ و لە چەند دێری ڕابردوو باسمان کرد. هەر ئەم شوێنە لە گەشتەکەی (جیمس برانت)یش ناوی هاتووە بەڵام بەشێوەی (ئارکهانا مەعدەن– Argahana Ma,den) واتا کانی ئارکهانا. دیارە ئەم شوێنە دەکەوێتە نزیك شاری پالۆ لە باکووری کوردستان. هەروەها لە زانیارییەکانی برانت دەردەکەوێ کە کرداری دەرهێنان لەم کانەدا تا ئەو کاتە (واتە ساڵی ١٨٣٨) بەردەوام بووە، چونکە ناوبراو دەڵێ دەسەڵاتدارێتی حکومەت ئەوەی بەسەر خەڵکی ناوچەکە سەپاندبوو کە بڕێکی زۆر خەڵووزی دار بۆ کانە نێوبراوەکە دابین بکەن. بەڵام ئاماژە بەو کانزایە نادا کە دەردەهێنرا.(٥٤) سەرەڕای ئەمەش دەتوانین لە قسەکانیدا ئەوە هەڵێنجین کە لەم ماوەیەدا حکومەت کانەکەی وەبەرهێناوە. حکومەت کانێکی تریشی وەبەردەهێنا بەڵام بە سوودبینین لە شارەزایی ئەوروپییەکان، ئەویش کانی (سیڤان مەعدەن– Sivan Ma,den) بوو کە دەکەوێتە سەر ڕێگای گشتی نێوان خینی و پالۆ. برانت دەڵێ ئەو خاوەی لەم کانە دەردەهێنرا "ئاسنێکی بەپێزە"، بەڵام مردنی بەڕێوەبەری کانەکە (کە ئەویش ئەندازیارێکی فەرەنسی بوو بەناوی شاتلۆن) بووە هۆی وەستانی کارکردن تیایدا.

ئەمە لە کاتێکدا یەکێ لە کەسایەتییەکانی ناوچەکە ڕایگەیاند کە خراپیی ئاسنە دەرهێنراوەکە لە پشت بەجێهێشتنی پرۆژەکە بوو.[٥٥]

سەرەڕای کۆنترۆڵکردنی ئەم کانانە لەلایەن حکومەتەوە، کەچی هێشتا خەڵکی ناوچەکە هەندێ کانزایان لە دەوروبەری خۆیان دەردەهێنا. ئەوەتا (جیمس برانت) تێبینی ئەوەی کرد چەند بڕێکی کبریتۆزی زەرنیخی زەرد کە لە چیاکانی هەکاری دەرهێنرابوو، لە بازاڕی شاری وان خرابووە ڕوو بۆ فرۆشتن. هەروەها بۆی دەرکەوت کە خەڵك لە کەنارەکانی دەریاچەی وان (سۆدە) کۆ دەکەنەوە، بۆ ئەوەی لە دروستکردنی سابووندا کەڵکی لێ وەرگرن.[٥٦]

## ج- پیشەکانی نێوماڵ و پیشەسازی خۆراك:

کۆمەڵگەی کوردی لە سەردەمی عوسمانیدا کۆمەڵگەیەکی دەرەبەگایەتی بوو، بۆیە هێشتا دانیشتووان هەندێ کار و پیشەسازی ساکاریان لە ماڵەکاندا دەکرد، هەروەکو لە زانیارییەکانی گەڕیدەکان دەردەکەوێ. بەوردبوونەوە لەم زانیارییانە دەبینرێ کە بەزۆری ئافرەتان ئەم کار و پیشانەیان دەکرد. کە ئەوانیش دوو جۆر بوون:

یەکەم: ئەو پیشەسازییە سەرەتاییانەی کە لە باپیرانیان بۆیان ماوەتەوە، بەتایبەتی ڕستن و چنین و تەونکەری. بۆ نموونە گەڕیدەی عوسمانی ئەولیا چەلەبی لە سەروبەندی باسکردنی کار و پیشەی دانیشتووانی شاری مەلاتیە، دەڵێ هەموو خەڵك خەریکی کاروکاسبین، هەندێکیان بە تەشی دەزوو دەڕێسن، هەندێکی تریش جۆلان جاو دروست دەکەن.[٥٧] هەرچی (هێنری بێندەر)ە، لە شاری ئامێدی تێبینی کرد کە دانیشتووان لە ماڵەکاندا کاری ڕستن و چنین دەکەن، هەندێ ئافرەتیشی لەنێو ماڵدا بینی کە بەشێوازێکی سەرەتایی خەریکی چنینی جۆرە قوماشێکن.[٥٨] (جیمس برانت)یش زانیارییەکی ترمان دەداتێ کە لەم بارەیەوە سوودی هەیە، ناوبراو لە گوندێکی باکووری کوردستان دەنووسێ: "هەموو ئەو خوریيانەی بەرهەمی دێنن لەسەر ئاستی خۆماڵی بەکاردەبرێ".[٥٩] لەمەشەوە دەگەینە ئەو دەرەنجامەی کە خەڵکی گوندەکە هەڵدەستن بەڕستن و

چنینی ئەم خورییانە لە ماڵەکاندا، ئەمەش بۆ دابینکردنی پێداویستییەکانیان لە جلوبەرگ و ئەو شتانەی تر کە لە خوری دروست دەکرێن.
دووەم: ئەو پیشانەی کە دەتوانرێ پێیان بگوترێ (پیشەسازی خۆراك)، مەبەستمان وشککردنەوەی میوەجات و دروستکردنی خۆشاو (شەربەت) و دۆشاو و شیرنەمەنی و هەروەها دەرهێنانی ڕۆنە. لە ئاماژەکانی چەندین گەڕیدە و گەشتیاردا دەردەکەوێ کە کوردستان بەم پیشەسازییانە بەناوبانگ بووە. سەبارەت بەوشککردنەوەی میوەجات، دەبینین کە ناوچەی شنگار دەستێکی باڵای هەبووە لەم بوارەدا، بەتایبەتی لە وشککردنەوەی هەنجیر و ترێ. بەپێی گوتەی ئەولیا چەلەبی، مێوژی بەرهەمهێنراوی شنگار بەبازرگانی دەگەیشتە بەغدا و بەسرا و ئەحسا.[٦٠] (ئەبوتالیب خان)یش پەسنی هەنجیری ناوچەی شنگار دەکات و دەڵێ ئەوان " وشکی دەکەنەوە و لە بازاڕەکانی ماردین و مووسڵ و بەغدا دەیفرۆشن".[٦١] کرداری هەڵگرتنی میوەجات بەشێوازی وشککردنەوە، لە زۆربەی ناوچە کوردییەکانی تریش ناسراو بوو، بەتایبەتی وشککردنەوەی ترێ کە لە کتێبی زۆربەی گەڕیدەکان باس کراوە.[٦٢] هەندێ جار ئەم پیشەیان بەمەبەستی پاراستن و هەڵگرتنی میوەجاتەکان بوو بۆ زستان، بەڵام لە زۆربەی جارەکانی تر لە پێناو هەناردەکردنی ئەم بەروبوومانە بەم کارە هەڵدەستان. سەبارەت بەمە (جیمس برانت) تێبینی کرد کە دانیشتووانی گوندەکانی دەوروبەری شاری وان بڕێکی زۆر زەردەلوو (قەیسی)یان لەبەر تیشکی خۆر وشك دەکردەوە بەمەبەستی هەناردەکردنی بۆ ناوچەکانی تر.[٦٣]

هەروەها دانیشتووانی کوردستان لە پیشەی کوشین و خۆشاو دروستکردنیشدا لێهاتوو بوون، ئەوەتا ئەولیا چەلەبی دۆشاوکردن وەکو پیشەیەکی دانیشتووانی مەلاتیە ناودەبات، و زۆر سەرسام دەبێ بەو خۆشاوەی لە شاری وان دروست دەکرا. بەتایبەتی خۆشاوی هەنگوین و خۆشاوی ڕێواس و خۆشاوی سێو.[٦٤] (ئیڤن)یش ئەوەی زانی کە "شەرابی نایاب" لەوانەیە هەموو دەمێ لە توزخورماتوو دەستکەوێ.[٦٥] بەڵکو (ئۆلیڤیێ) تا ئەو ڕادەیە پێ هەڵدەگرێ کە بڵێ دانیشتووانی ئەم شارۆچکەیە "ئارەق دروست دەکەن و دەیفرۆشنە کریستیانەکانی بەغدا".[٦٦] هەرچی گەڕیدە (پۆرتەر)ـە کە لە ساڵی ١٨٢٢

سەردانی کەرکووکی کردووە، دەڵێ ئەم شارە هەرچەندە شارێکی ئیسلامییە، بەڵام شەراب و مەی (عارەق) تێدا دروست دەکرێ و بەبڕێکی زۆر وەبەر دەهێنرێ.(٦٧) لێرەدا دیارە مەسەلەکە زێدەڕۆیییەکی ئاشکرای تێدا کراوە، یان ئەم گەڕیدانە تووشی بەدحاڵیبوونێك هاتوون. چونکە زانراوە کە لە ئیسلامدا دروستکردنی مەی حەرامە هەروەکو خواردنەوەی. بۆیە ڕێی تێ ناچێ دانیشتووانە موسڵمانەکانی ئەم ناوچانە بژێویی خۆیان لەم پیشەیە بەدەست هێنابێ کە پێشێلکاریی ئایینی تێدایە. دیارە ڕاستییەکە ئەوەیە کە (جیمس برانت) باسی دەکا، کاتێ سەبارەت بە بەرووبوومی دێهاتەکانی دەوروبەری شاری وان، دەڵێ: "ئەو خۆشاوەی دەردەهێنرێ بەر لە ترشانی دەفرۆشرێ و دواتر کڕیارەکە دەیگۆڕێ بۆ شەراب".(٦٨) لەوانەشە ئەم کردارەی دروستکردنی مەی کە باس کرا، لەلایەن کەمینە کریستیانەکانی دانیشتووی ئەم ناوچانە ئەنجامدرابێ.

کوردستان لەم ماوەیە بەجۆرێکی تری شیرینی بەناوبانگ بوو، ئەویش (گەزۆ)یە کە بە عارەبی پێی دەگوترێ (المنّ) هەروەها پێیدەڵێن (منّ السما)، چونکە خەڵك باوەڕیان وابوو لە ئاسمانەوە دەبارێ. لە ڕاستیشدا بەشێوەیەکی سروشتی لە سەر گەڵای درەختەکان و بەتایبەتی درەختی بەڕوو، لە هەندێ ماوەی دیاریکراوی ساڵدا پەیدا دەبوو. دوای وشککردنەوەی گەڵاکان بەنەرمی دادەوەشێنرێ تابکەوێتە سەر قوماشێکی ڕاخراو. ئنجا بەهۆی کوڵاندنی دەپاڵێورێ و شێوەی جۆربەجۆری لێ دروست دەکرێ و لە بازاڕەکان دەفرۆشرێ. ئەم ماددەیە سەرنجی زۆر لە گەڕیدەکانی ڕاکێشاوە و حەزیانکردووە زانیاری لە بارەیەوە بزانن. بۆیە وەسفیانکردووە و باسی سەرچاوەکەی و چۆنیەتی کۆکردنەوە و دروستکردنیان کردووە، بەتایبەتی (ئۆلیڤیێ) و (ریچ) و (برانت) کە هەندێك بەدرێژی لە سەریان نووسیوە.(٦٩) (ئەولیا چەلەبی)ش ناوی گەزۆ دەهێنێ و ئاماژە بە تامە شیرینەکەی و هەبوونی لە هەندێ ناوچەی باکووری کوردستان دەکات، و پێی دەڵێ (حەلوای خودایی). بەڵام وا دەزانێ لە ئاسمانەوە دادەبارێتە سەر گەڵای درەختان.(٧٠)

ئەگەر بێینە سەر پیشەی دەرهێنانی ڕۆن، دەبێ بڵێین ئەم کارە بۆ دوو مەبەست دەکرا: یەکێکیان ئەوەبوو کە دانیشتووان هەندێ جۆری بەرووبوومیان

دەکوشی بۆ دەستکەوتنی ڕۆنەکەی بەمەبەستی خواردن. وەکو دروستکردنی تەعین لە دەنکۆڵەکانی کونجی. هەندێ ڕۆنیشیان بۆ سووتەمەنی دەردەهێنا، وەکو دەرهێنانی ڕۆنی گەرچەك.[71] هەروەها دەرهێنانی ڕۆنی ناوکی کەتان پیشەیەکی بەربلاو بوو لە باکووری کوردستان، ئەمیش بۆ بەکارهێنانی وەکو سووتەمەنی بۆ ڕووناککردنەوە.[72]

لە کۆتاییدا دەبێ ئاماژە بەپیشەیەکی تر بدرێ کە ئەویش تارادەیەکی زۆر پەیوەستی ماڵەکان بوو لەم ماوەیەدا، بەڵام هەندێ جار داهاتێکی کەمی بۆ خاوەنەکەی دەستەبەر دەکرد. ئەویش پیشەی نانکردن بوو بەمەبەستی فرۆشتن. ئەم کارە وەکو پیشە لە شارۆچکە و ئاوەدانییەکانی کوردستان تەنیا لە ماڵەکان دەکرا. بۆ نموونە لە شارۆچکەی (سیڤەریك)ی نزیك دیاربەکر، (سۆن)ی ئینگلیزی نەیتوانی نان بکڕێ تا یەکێك ماڵێکی پیشان دا کە نانی لێ دەکرا. کاتێ لە کەرکووکیش بوو هەمان کێشەی هاتە ڕێ، بەڵام لە شاری دیاربەکر کە گەورەترین شارەکانی کوردستان بوو، گەڕیدەی ناوبراو نانەواخانەیەکی لە بازاڕ دۆزییەوە.[73]

## د- لێهاتوویی پیشەگەران و بایەخی کاڵاکانی کوردستان:

پیشەگەرانی کوردستان لە سەردەمی عوسمانیدا، لە بەرهەمهێنانی هەندێ کاڵادا کارامەیی بەرچاویان دەنواند. ئەمەش ڕەنگدانەوەی ئەرێنی لەسەر ئاستی کاڵاکان و ڕادەی باشییان هەبوو. لە کتێبەکانی گەڕیدەکانیش چەندین گەواهیمان دەست دەکەوێ کە ئەمە دەسەلمێنێ. بۆ نموونە گەڕیدەی عوسمانی ئەولیا چەلەبی لە دیاربەکردا دەڵێ: "ئەم شیر و دەمانچە و قولنگ و تەور و تەوەرزین و خەنجەر و ڕمب و نووکە تیرانەی دروست دەکرێن لە دنیادا بەناوبانگن، مزگەرەکانیان لە دروستکردنی قاپەکاندا و زێڕنگەرەکان لە کاری زێڕ و بەردی بەنرخدا بێ وێنەن".[74] ئەم شارە لە دروستکردنی قاپوقاچاغی مسدا تا کۆتایی سەردەمی عوسمانی ناوبانگی هەبوو. بەگوتەی (سۆن) زۆرینەی ئەم پیشەگەرانەی لەم بوارەدا کاریان دەکرد، لە ئەرمەنەکان بوون. هەر ئەم گەڕیدەیە ئەوەشمان بۆ ڕوون دەکاتەوە کە شاری جزیرە لە دروستکردنی پەت و کندڕدا ناوبانگی هەبوو لە دەڤەرەکەدا.[75] (جیمس برانت)یش دەنووسێ: "هەندێ

کەرەستە هەیە کە لێرە واتە لە نزیک مووش بەرهەم دێ.. بەهۆی باشییەکەی گونجاوە کە بۆ ئەورووپا هەنارده بکرێ". [٧٦]

ئەولیا چەلەبی لە شاری (بەدلیس)یش ستایشی ئاسنگەر و بەرگدروو و دەباغساز و بۆیەسازەکان دەکات، و بەلێهاتوویی و چاکیی بەرهەمەکانیان هەڵدەدا. بەتایبەتی پێستەکان کە هەمەڕەنگ و تەنك و لووس و بریقەدار بوون. هەروەها زۆر سەرسام دەبێ بە (خان ئەبدال)ی میری میرنشینی بەدلیس، و بەدرێژی باسی بەهرە جۆربەجۆرەکانی و شارەزایی لە هونەر و پیشەی جیاوازدا دەکات. لەوانە: تیمارکردنی برین و چارەسەری چاو، هەروەها بەرگکردنی کتێب و وێنەکێشان و خۆشنووسی و هۆنینەوەی شیعر و دروستکردنی شمشێر و سەعات و هەڵکەندنی مۆر و نەخشسازی و چنین و جۆلایی. سەبارەت بە پیشەگەرانی (وان)یش، ئەولیا چەلەبی دەنووسێ: "وەستای بەننا و موهەندیسی وای هەیە هاوتایان مەگەر لە سەقز دەستکەوێ، بەرگدرووی ئێرە ئەوەندە شارەزان شوێنی دەرزی و تەقەڵی قوماشەکە لێك ناکرێنەوە،... زیندرووەکانیان زۆر وەستان". لە شوێنێکی تر باسی بەناوبانگیی خەنجەری کوردی دەکات. [٧٧] بەڵام هێنری بێندەر بۆچوونێکی تری هەبوو کاتێ لە شاری وان بوو، ئەوەتا دەڵێ پیشەگەرانی وان "وەستان، بەڵام دەستکارەکانیان دڕ و تێزەکانیان بێ جوانکارین. ئەم شتانە بریتین لە دار جگارە و گوارە و قۆدی گچکە و شتی دیکە". بەڵام لە هەمان کاتدا هەندێ بەرهەمیان پەسند دەکات، بەتایبەتی جۆرێکی قوماش کە دەڵێ "پارچەیەکی دڕ لە مووی بزن دەچنن کە ئاو نادا و زۆر قایمە". ئەوەش دەڵێ کە دروستکردنی وردەواڵەی زیو لەم شارەدا بەڕەواجە. [٧٨] بەڵام پێدەچێ بۆچوونەکانی ناوبراو لەوەوە سەرچاوەی گرتبێ کە ئەم کاڵایانەی کوردستانی لەگەڵ کاڵای ئەورووپی بەراوردکردبێ، کە بێگومان باشتر بوون. ئەویش بەهۆی ئەم تەکنەلۆژیا نوێیەی کە شۆڕشی پیشەسازی ئەورووپی لەگەڵ خۆیدا هێنابووی.

لەم بوارەدا جێگەی باسە، کە هەندێ کاڵای کوردی دروستکراو یان نیمچە دروستکراو، بەهۆی چاکی یان ڕێژەی زۆری، دەنێردرایە هەرێم و وڵاتانی دەوروبەر و تەنانەت دووریش. ئەوەتا مووسڵ ڕایەخ و مافوور و قایشی لە ناوچە کوردییەکان دەکڕی. [٧٩] بەتایبەتی ناوچەی ئاکرێ ڕیس و پێستە و هەندێ جۆری

شیرنەمەنی دەفرۆشتە ئەم شارە.[٨٠] سلێمانیش لە سەرەتاکانی سەدەی نۆزدەم سابوونی دەناردە بەغدا.[٨١] لە سەرەتاکانی سەدەی بیستەمیش مافووری لێ بار دەکرا بۆ مووسڵ و بەغدا، دوای ئەوەی لە ناوچەکانی دەوروبەری بۆی دەهات و لەوێ کۆ دەکرایەوە.[٨٢] قوماشی بۆیەکراوی (بەدلیس)یش بۆ هەندێ وڵاتی هاوسێی وەکو گورجستان هەناردە دەکرا.[٨٣] پێستەکانی ئەم شارەش لە ناوچەکانی تر زۆر پەسند بوو، بۆیە دەفرۆشرایە هەندێ وڵاتی ئەوروپا.[٨٤] هەروەها (ئۆلیڤیێ) دەڵێ بڕێکی زۆر لە کووتاڵی لۆکەیی و مەراکشی لە ماردین دەچنرێ بەمەبەستی هەناردەکردنی بۆ حەلەب.[٨٥] شایانی باسە هەر لە ماردین کووتاڵی ئاوریشمی دەچنرا، بەتایبەتی ئەو ئاوریشمەی لە شنگارەوە بۆی دەهات.[٨٦] هەر پەیوەست بەباسی ئاوریشم، دەبینین ناوچە کوردییەکان ئەم ماددەشیان هەناردە دەکرد بەتایبەتی بۆ بەغدا. لە قسەکانی (ئۆلیڤیێ) دەردەکەوێ ئەم ئاوریشمە کوردییەی بۆ بەغدا هەناردە کراوە بەتایبەتی لە کەرکووك و هەولێرەوە، لە ئاوریشمی خاو بووە و "بەمەبەستی بەکاربردنی بووە لە کارخانەکانی ئەوێ".[٨٧] بەڵام (ئیڤن) بۆمان ڕوون دەکاتەوە کە ئەم ئاوریشمەی لە داقووقەوە دەنێردرایە بەغدا، لە شێوەی ئاوریشمی چنراو بووە.[٨٨] لەمەشدا دەردەکەوێ کە ئاوریشمی کوردستان بەهەردوو شێوەی خاو و دروستکراو هەناردە کراوە.

### هـ- هەلومەرجی کاری پیشەوەران و ئەو هۆکارانەی کاریگەرییان هەبوو لەسەری:

لە لاپەڕەکانی پێشوو زانیمان، کە دانیشتووانی کوردستان تا ئەو سەردەمەش هەندێ پیشەی سەرەتاییان لە ماڵەکاندا ئەنجام دەدا. سەرەڕای ئەمەش دەکرێ بڵێین ئەم سەردەمە کرداری جیابوونەوەی پیشەگەری لە کشتوکاڵ و پەیدابوونی توێژی پیشەگەرانی بەخۆوە بینی. لە کتێبەکانی گەڕیدەکانیش چەندین بەڵگە و ئاماژەمان دەست دەکەوێ کە ئەمە دەسەلمێنن. ئەم کتێبانە ئەوە پیشان دەدەن کە پیشەگەر و کارسازانی کوردستان، بەزۆری لە دووکان و دەزگا پیشەگەرییەکان کاریان دەکرد. هەندێ جار پیشەوەران تەنانەت لە گوندەکانیش دەزگا و شوێنی

کارکردنی خۆیان هەبوو. ئەوەتا (هێنری بێنـدەر)ی گەڕیدەی فەرەنسـی وەسـفی دووکانێکی ئاسنگەریمان بۆ دەکات لـە گونـدێکی کوردسـتان، و دەڵـێ: تـەنیا لـە چـوار دیـوار پێکهـاتووە، چـونکە دەروازەی چـوونە ژوورەوە بـێ دەرگایـە. لـە بنمیچەکەشی کونێکی گەورە هەیە بۆ دەرچوونی دووکەڵی کوورەکە.[89]

لە زۆربەی شارەکانی کوردستان کارە پیشەگەرییەکان بەپێی جۆرەکانیان لـە شوێنێکی دیاریکراوی بازاڕدا کۆببوونەوە. بۆ نموونە بازاڕی شاری مەلاّتیـە شـەش قاوشی پیشەگەرانی تێدابوو کە هەریەکەیان شوێنی نزیکەی هەزار پیشەگەری تێدا دەبۆوە. بازاڕیش لە شێوەی قەیسەری بوو کـە چـەند دەروازەیـەکی هـەبوو. ئـەم دەروازانە دوای ڕۆژئاوابوون دادەخران و پاسەوانیان بۆ دادەنرا.[90] لە دیاربەکریش بازاڕ هەر بەم شێوەیە بوو، بەلاّم دابەش دەبوو بۆ چەند بـازاڕێکی لاوەکـی بـەپێی ئەو پیشەیەی تێیـدا دەکـرا یـان ئـەو کالاّیانـەی لێـی دەفرۆشـرا. ئـەوەبوو بـازاڕی عەتاران و بازاڕی ئاسنگەران و بازاڕی زێڕنگەران و بـازاڕی کورتانـدرووان و بـازاڕی قـەزازان و بـازاڕی کووتـاڵ فرۆشـان و هـی تـر لـەم شـارەدا هـەبوون.[91] شـاری (وان)یش بەپێی وەسفی ئەولیا چەلەبی، قەیسەرییەکی ئاوەدان و دووکانی پاگـژی هەبوو. هەرچی قەیسەری بەدلیسە بەپێی گوتەی هەمان گەڕیـدە، (١٢٠٠) دووکـان و دوو دەرگـای ئاسـنینی هـەبوو. نیـوەی ئـەم قەیسـەرییە گەچکاری کـراوە و لـە بارێکی باشدا بووە، بەتایبەتی گوزەری زێڕنگەران کە زۆر پەرداخ بووە.[92] دیـارە ئەم قەیسەرییە دوای نزیکەی دوو سەدە هەر وەکو خۆی مـابوو. چـونکە (جـیمس برانت) لە ساڵی ١٨٣٨دا لە وەسفکردنیدا دەڵێ: "بازاڕی بـەدلیس گشـتگیرە و بـە کالاّی جۆراوجۆر ئاوەدانە.. و پڕیەتی لە سەکۆ و بانی بچووك.. بنمیچەکانی وەکو ڕێگای گشتی هاتوچۆکەران بـەکاردێن... ئـەم بـازاڕە بەچـەند کولانکەیـەك کـە لـە بنمیچـەکەیدا هەیـە و ڕێگـا بەتیشـکی خـۆر دەدا پیایـدا تێپـەڕێ، ڕوونـاك دەکرێتەوە". بەلاّم ناوبراو سکالاّ دەکات لـە دەسـت تەنگەبـەری ڕێچکەکانی ئـەم بازاڕە و دەنووسێ: "ئەو ڕێگایەی کە بازاڕەکە دەبڕێ زۆر تەسکە. و لەیەك کاتـدا ڕێگا بەتێپەڕبوونی زیاتر لـە دوو کـەس نـادات، بـەهۆی جـەنجاڵیی بازاڕەکـە.. بـۆ مرۆڤـ ئاسان نییە کە بەناویدا ڕێگا ببڕێ".[93]

لە شارەکانی باشووری کوردستانیش پیشەگەری و بازاڕەکان هەر بەم شێوەیە بوون، بۆ نموونە لە سەرەتاکانی سەدەی بیستەم هەندێ لە پیشەکان شوێنێکی تایبەتییان هەبوو لە بازاڕە "فراوانەکەی" شاری سلێمانی، و ئەم بازاڕە بەم پیشەیە دەناسرا، وەکو بازاڕی پێڵاوسازان کە "لە شەقامێکی درێژ پێکدەهات و بنمیچی قوولْ و فراوانی لە تەنیشتەکانی هەبوو، هەمووشی بەپێڵاوسازان گیراوە" بەپێی دەربڕینی (سۆن).[٩٤]

سەربارى ئەمەش، هەندێ لەو زانیارییانەی گەڕیدەکان پێمان دەبەخشن، بەڵگەی پەرەسەندنی هەندێ پیشە بەدەستەوە دەدەن بەجۆرێك کە دەتوانین ناوی (پیشەسازی)یان لێ بنێین. بەتایبەتی پیشەسازی کوتاڵ و بۆیەکردنی. ئەوەتا (جیمس برانت) کاتێ باسی ئەو (٢١٣) بنەماڵە ئەرمەنییە دەکا کە لە شاری ئەلیجەی باکووری کوردستان دادەنیشتن، دەڵێ: لێرە ئەرمەنەکان نەخاوەنداری زەوین و نەجووتیار، بەڵکو لەو کارکەرانەن کە لە پیشەسازییە دەستییەکانی کوتاڵی لۆکەیی زبر کار دەکەن. لە شارۆچکەی (خینی)ش کە دەکەوێتە ڕۆژئاوای شاری ئەلیجە، ناوبراو ئاماژە بەهەبوونی (١٢٠) دەزگا دەکات کە لە بواری ڕستن و چنینی کوتاڵی لۆکەیی زبر کار دەکەن. هەروەها دەڵێ هەموو دانیشتووانە ئەرمەنەکانی ئەم شارۆچکەیە "بە ڕستن و پێچانی لۆکەی بەرهەمهێنراوی خۆماڵی خەریکن". بە هەموو شارۆچکەکە ساڵانە (٣٠) هەزار پارچە کووتاڵ بەرهەم دەهێنرا و لە گوندەکانی دەوروبەر و هەروەها لە مووش و دیاربەکر دەفرۆشرا.[٩٥] هاوکات لەگەڵ ئەمەدا لە شاری پالۆ (٢٠٠) دەزگا هەبوو کە کووتاڵی لۆکەیی خۆماڵییان بەرهەم دەهێنا، هەر لەم شارە بۆیەخانەیەك و دەباغخانەیەکی خۆشکردنی پێستە هەبوو. بەلاّم لە شاری وان زیاتر لە (٥٠٠) دەزگا کاری ڕستن و چنینی کووتاڵی لۆکەیی زبریان دەکرد، ئەم دەزگایانە لە پاڵ بەکارهێنانی لۆکەی خۆماڵی، لۆکەی هاوردەکراوی ئێرانیشیان بەکار دەبرد.[٩٦] ئەمەش بەڵگەیە لە سەر زۆریی بەرهەمی کووتاڵ لەم شارە، چونکە نەیانتوانیوە بەتەنیا پشت بە لۆکەی خۆماڵی ببەستن. کارخانەی کووتاڵی چیت (یان: شیت)ی شاری (بەدلیس)یش بەرهەمێکی فرەی هەبوو، بۆیە بەپێی گوتەی برانت "بەرهەمەکانی بەشێوەیەکی فراوان دەنێردرایە ناوچەکانی تری وڵات". هەروەها

ئەو لۆکەیەی بەس نەبوو کە لە ناوچە کوردییەکانی دەوروبەر (وەکو هەردوو ناوچەی شێروان و خارزان) دەهێنرایە بەر، بۆیە هەندێ کەرەستەی خاوی لە ناوچەی (خوی) سەر بەئێران، هاوردە دەکرد.(٩٧) ئەمە لە کاتێکدا بوو کە بەرهەمهێنانی کووتاڵ لە هەندێ شاری تر تەنیا پشتی بەلۆکەی خۆماڵی دەبەست، یان بەو لۆکەیەی لە هەندێ شاری تری کوردستان بەرهەم دەهێنرا. بۆ نموونە لە شاری ئەلیجە و هەروەها لە خینی کە پێشتر ناومان هێنان، دەزگاکانی ڕستن و چنین ئەو لۆکەیان بەکاردەبرد کە لە دێهاتەکانی دەوروبەر دەهێنرایە بەر لەگەڵ لۆکەی خەرپووت و ئەرزەڕۆم.(٩٨)

جێگەی سەرنجە، لەم ماوەیەدا هەندێ لە میر و دەسەڵاتدارانی کورد دەستیان دابووە بەگەڕخستنی سەرمایەکانیان لە پڕۆژە پیشەسازییەکان، ئەمەش بەڵگەیە بۆ فراوانیی پڕۆژە پیشەسازییەکان لەم ماوەیەدا. ئەوەتا ئەولیا چەلەبی پێمان دەڵێ کە هەموو بۆیەخانەکانی شاری بەدلیس مولکی میری بەدلیسە، کە ئەویش میر ئەبدال خان بوو.(٩٩)

شاری بەدلیس لەنیوەی یەکەمی سەدەی نۆزدەمیش دەستێکی بالای هەبوو لە بواری بۆیەسازیدا. ئەوەتا (جیمس برانت) زانیاریی گرنگمان دەداتێ کە بەڵگەی فراوانی کاری بۆیەخانەکانی ئەم شارە بەدەستەوە دەدەن. بەپێی گوتەی ئەو کووتاڵ لە هەموو ناوچەکانی وڵاتەوە دەهێنرایە بەدلیس "بەمەبەستی بۆیەکردنی بەڕەنگی سوور". هەروەها دەڵێ ئەم کووتاڵەی لە شاری وان دروست دەکرێ و تەنانەت هەندێ کووتاڵی ئەورووپیش، لە بۆیەخانەکانی ئەم شارە ڕەنگ دەکران، کە بەڕەنگە کراوە و بریقەدارەکان بەناوبانگ بوون. لە هەموو ئەوانە گرنگتر ئەوە بوو کە ئەو ماددەیەی لە بۆیەکردندا بەکار دەهێنرا، زۆربەی لە ناوچەی شێروان دەهێنرایە بەر کە لە ڕۆژئاوای بەدلیس هەڵکەوتبوو.(١٠٠)

ئێستا ئەگەر بێینە سەر باری پیشەگەران و هەلومەرجی کارکردنیان لە کوردستان، دەبینین لە ژێر سایەی بارودۆخی ناجێگیری ئەم وڵاتە، لە بارێکی باشدا نەبوون. لەم بارەیەوە ڕووداوێك بەنموونە دەهێنینەوە، ئەویش ئەوەیە کە میری بابان (سلێمان پاشای کوڕی خالید پاشا) کاتێ لە هەمبەر هەڕەشەی هێزەکانی بەغدا لە ساڵی ١٧٦٤دا ناچار بوو دەست لە حوکمڕانیی سلێمانی

هەڵگریێ و بەرەو ئێران ڕابکات، ناوبراو هەموو خاوەن پیشە و کارسازانی شارەکەی لەگەڵ خۆیدا برد.[101] بێگومان ئاساییە کە ئەمەش کاریگەری نەرێنی بەسەر بواری پیشەگەری ئەم شارە جێ بهێڵێ.

سەرەڕای ئەمەش، تێبینی دەکرێ کە بارودۆخی پیشەگەران لە ناوچەکانی ژێردەسەڵاتی میرنشینە کوردییەکان، تاڕادەیەك باشتر بوو بە بەراورد لەگەڵ ناوچەکانی سەر بەدەسەڵاتی ڕاستەوخۆی عوسمانی. گەڕیدەیەکی ئیتاڵیایی کە ناوی (سباستیانی)یە و لە ساڵی ١٦٦٤ سەردانی مووسڵی کردووە، تێبینی و سەرنجەکانی خۆی لەم شارە نووسیوەتەوە کە لە ژێر حوکمڕانیی والییەکانی عوسمانیدا بووە، و دەڵێ: "چەندین ڕێگای بێ دانیشتووانم بینی، و دەرگای دووکانەکانیش داخراون، زانیم کە بازرگان و خەڵکانی خاوەن پیشە کارەکانی خۆیان جێهێشتووە و ڕایانکردووە بۆ کوردستان بۆ خۆ ڕزگارکردن لە زۆریی باجەکان".[102] هەروەها (جیمس برانت)یش سەرنجێکی هاوشێوەی بۆ تۆمار کردووین، کاتێ لە بارەی هۆکارەکانی دواکەوتنی ناوچەکە گفتوگۆ دەکات. ناوبراو وەڵامی بەرامبەری دەداتەوە و دەڵێ: "دواکەوتنیان لە بنەڕەتدا دەگەڕێتەوە بۆ سروشتی ئەو دەسەڵاتەی کە جڵەوی کاروباری وڵاتی بەدەستە، زیاتر لەوەی دەرەنجامی دەبەنگی و نازیرەکییان بێ. ئەگەر کەسێك دەستکەوتێکی ماددی گەورەی بۆ دەستەبەر بێ بەهۆی چالاکی زێدە و ئەرکی بێ هاوتا و زیرەکیی لە ڕادەبەدەر، ئەوا ئەم دەستکەوتە ماددییە گەورەیە بەدەستهاتووە لە زەبری چاوچنۆکی و تێرنەبوونی دەسەڵاتدارێکی ستەمکاری زۆردار ڕزگاری نابێ..هەموو پاڵنەر و ئارەزووێکی داهێنان لای ئەو کەسە تێکدەشکێنێ".[103]

هەروەها پیشەوەرانی کوردستان، وەکو پیشەوەرانی تری دەوڵەتی عوسمانی، ڕووبەڕووی بەرەنگارییەکی مەترسیداری تر دەبوونەوە، بەتایبەتی لە سەرەتاکانی سەدەی نۆزدەمەوە. ئەم بەرەنگارییەش خۆی لە ڕکابەری کاڵا ئەوروپییەکان لە گەڵ کاڵا و بەرهەمە خۆماڵییەکان دەبینییەوە. بێگومان ئەمەش یەکێك بوو لە دەرەنجامەکانی وابەستەبوونی کوردستان بە بازاڕی جیهانییەوە. بەهۆی زانیاری هەندێ لە گەڕیدەکان ئەم مەترسییەمان بۆ بەرجەستە دەبێ کە لەم ماوەیەدا دووچاری پیشەگەرانی کوردستان دەبۆوە. بەتایبەتی لە ڕێی

ئاماژەکانیان بۆ هەبوونی کالآی ئەورووپی لە بازاڕەکانی شار و شارۆچکە کوردییەکان و ڕکابەرایەتی کردنیان لەگەڵ کالآی دروستکراوی خۆماڵی. لەم بارەیەوە جێگەی سەرنجە کە هەندێ کالآی ئەورووپی بەتایبەتی قوماشی لۆکەیی مانچستەر، لە شارۆچکەیەکی بچووکی وەکو زاخۆدا هەبووە، کاتێ گەڕیدەی بریتانی (جۆن ئاشەر) لە ساڵی ١٨٦٤دا سەردانی کردووە.(١٠٤) (جیمس برانت)یش ئاماژە بە دیتنی هەندێ کەلوپەلی ئەورووپی لە شاری بەدلیس دەکات، بەتایبەتی قوماشی (چیت)ی ئینگلیزی، کە بەپێی گوتەی ئەو بەشێوەیەکی بەرفراوان لەوێ دەفرۆشرا. هەروەها بڕێکی زۆر دوگمەی شووشەیی ڤینیسیایی لە شاری وان بینی و دەڵێ کوردان جلوبەرگە ڕەنگاوڕەنگەکانیان بەمانە دەڕازێننەوە. هەندێ کالآی پیشەسازی ئەورووپیشی لە شاری (مووش)دا بەرچاو کەوت. بەلآم ئەمەش دەڵێ کە خەڵکی ئەم شارەی دوایی، بەهۆی نزمیی داهاتیان مەیلیان بەلای کڕینی ئەم کالآیانەوە نییە.(١٠٥) هەر ئەم داهاتە نزمە و هەژاری و بێ دەرەتانی دانیشتووان، هۆکارێك بوون بۆ کەمیی کالآی ئەورووپی لە هەندێ ناوچەی تری کوردستان.

لە کۆتاییدا پێویستە بڵێین، ئەو گەشتنامانەی لەم توێژینەوەیەدا پشتمان پێ بەستوون، ئەوەیان لێ تێبینی دەکرێ کە لە سەروبەندی باسکردنی چالآکییە پیشەگەری و پیشەسازییەکانی ناوچە و شارە کوردییەکان، هیچ ئاماژەیەك بە سەندیکا و گرووپە پیشەگەرییەکان (النقابات والنقابات) نادەن. جا نازانرێ ئایا ئەمە دەگەڕێتەوە بۆ تێبینی نەکردنی ئەم سەندیکایانە لەلایەن گەڕیدەکان، سەرەڕای هەبوونیان. یان ڕێکخراوێکی لەم جۆرە لەو سەردەمەدا لە کوردستان نەبوون. ئەمەی دواییش زیاتر جێگەی باوەڕە، بەتایبەتی سەبارەت بە سەدە یەکەمەکانی حوکمڕانی عوسمانی لە کوردستاندا.(١٠٦) لەلایەکی تر ئەم کتێبانە هیچ زانیارییەکی ئەوتۆیان تێدا نییە لە بارەی چالآکیی پیشەگەری لەو شار و شارۆچکانەی کە نەکەوتبوونە سەر ڕێگای هاتوچۆی کاروانەکان، چونکە گەڕیدە و گەشتیارەکان بەزۆری لەگەڵ ئەم کاروانانەدا گەشتیان دەکرد. کە ئەوانیش هەندێ ڕێگای سەرەکیی دیاریکراویان هەبوو.

## پەراوێزەكان:

(١) بۆ وەستان لەسەر ئەم هۆكارانە بەوردی، بڕوانە: د. يحيى مراد، (ردود على شبهات المستشرقين) من قضايا الأستشراق/ بحوث ودراسات، ص٤٢– ٥٦. بەشێوەی (pdf) لە سایتی (www.kotobarabia.com) بلاّو كراوەتەوە.

(٢) لە بارەی ئەم گەڕیدە و كتێبەكەی، بڕوانە: رحلة ابي طالب خان الى العراق واوروبا، ت: د.مصطفى جواد، دار الوراق للنشر– لندن ٢٠٠٧.

(٣) بڕوانە: كورد لە مێژووی دراوسێكانیدا/ یان: سیاحەتنامەی ئەولیا چەلەبی، و: ناكام، چ٢، بەغدا ١٩٧٨.

(٤) بڕوانە: كارستن نيبور، رحلة نيبور إلى العراق في القرن الثامن عشر، ت: د.محمود حسين الأمين، مراجعة وتعليق: سالم الآلوسي، بغداد ١٩٦٥.

(٥) اوليفييه، رحلة اوليفييه إلى العراق (١٧٩٤–١٧٩٦م)، ت: د.يوسف حبى، مطبعة المجمع العلمي العراقي، بغداد ١٩٨٨، ص٣–٩.

(٦) بڕوانە: كلوديوس جيمس ريج، رحلة ريج في العراق عام ١٨٢٠، ت: بهاء الدين نوري، ج١، مطبعة السكك الحديدية، بغداد ١٩٥١.

(٧) بڕوانە: جيمس برانت، رحلة المستر جيمس برانت الى المنطقة الكردية عام ١٨٣٨، ت: حسين احمد الجاف، مطبعة الجاحظ، بغداد ١٩٨٩.

(٨) بڕوانە: هێنری بێندەر، سەفەرنامەی هێنری بێندەر/ كوردستان ، میزۆپۆتامیا، ئێران، وەرگێڕانی لە فارسییەوە: ئەبوبەكر خۆشناو، سلێمانی ٢٠٠٦، ل٥. شایانی باسە وەرگێڕی ئەم كتێبە دەڵێ دەقە وەرگێڕدراوە فارسییەكەی كتێبەكە كە پشتی پێ بەستووە، باسی ساڵی گەشتەكە ناكات. بۆیە ئاماژە بە وەرگێڕانە عەرەبییەكەی كتێبەكە دەكا كە هی (یوسف حبی)یە و تەنیا ڕووداوەكانی پەیوەست بەعێراق دەگرێتەوە، و دەڵێ لەوێ نووسراوە گەشتەكە لە ساڵی (١٨٩٥)دا بووە. بەڵام دیارە لێرەدا ورد نەبووە یان هەڵەیەكی چاپ ڕووی داوە، چونكە ساڵە دروستەكە كە لە وەرگێڕانە عەرەبییەكەدا نووسراوە (١٨٨٥)ـە. بڕوانە: هنري بنديه، رحلة الى كردستان في بلاد مابين النهرين سنة ١٨٨٥، ت: يوسف حبي، اربيل ٢٠٠١. ص٧.

(٩) بڕوانە: ميجرسون، رحلة متنكر الى بلاد مابين النهرين وكردستان، ت: فؤاد جميل، ج١، بغداد ١٩٧٠، ج٢، ١٩٧١. بۆ ژیننامەی ئەم گەڕیدەیە بەپێنووسی ئەرنۆڵد تی ویلسۆن (حاكمی شاهانەی گشتی عێراق لە سەردەمی داگیركاری بریتانی)، بڕوانە بەشی دووەمی كتێبەكە، لاپەڕەكانی ٢٠٩–٢٢١.

(١٠) سیاحەتنامەی ئەولیا چەلەبی، لاپەڕەكانی ٢٠، ٤٩، ٦٢، ٨٤، ١١١، ١١٣، ١٤٢، ٢٢٠.

(١١) برانت دەڵێ ئەوان سەبەتەیان بەکاردەهێنا بۆ ماسی گرتن لەجیاتی تۆڕ کە لەئاوی قووڵدا بەکاردێ، و بڕێکی زۆرتریش ماسی دەگرێ. بڕوانە: رحلة المستر جيمس برانت...، ص١٢٤-١٢٥.

(١٢) المصدر نفسه، صفحات ١٩، ٣٣، ٤٩، ٥٥، ٦٠، ٦٨، ٨٥، ٩٦، ١٢٤، ١٤٠.

(١٣) جعفر الخياط، مشاهدات الدكتور ايفز بين بغداد وكركوك والموصل، الاقلام (مجلة) ج (١٢) س (٢) آب ١٩٦٦، بغداد، ص٤١، ٤٦.

(١٤) رحلة اوليفييه...، ص٢٨، ١٢٦.

(١٥) بڕوانە: رحلة متنكر...، ج١، ص١٥١، ١٥٢، ١٥٤.

(١٦) بڕوانە: عباس العزاوي، تأريخ العراق بين احتلالين، شركة التجارة والطباعة المحدودة، مج٦، بغداد ١٩٥٤، ص٤٥.

(١٧) سەبارەت بەبنیادنانی سلێمانی و هۆکارەکانی کردنی بەپایتەختی میرنشینەکە، بڕوانە: عبدربه ابراهيم الوائلي، تاريخ الامارة البابانية/١٧٨٤-١٨٥١،ط١، دار الزمان، دمشق- سوريا ٢٠٠٨، ص١٣٧-١٥٠.

(١٨) رحلة ريج...، ص٢١٧-٢١٨.

(١٩) رحلة متنكر...، ج١، ص٢٤١، ٢٤٢.

(٢٠) المصدر نفسه،ج٢، ١٠٩، ج١، ص١٦٥، ١٦٧، ١٧٠.

(٢١) ساڵنامە زاراوەیەکی عوسمانییە لەدوو بڕگە پێکهاتووە، ئەوانیش (ساڵ) و (نامە)ن کە لەکوردیشدا هەن و هەمان واتا دەبەخشن. بۆیە زاراوەکە دەکاتە (نامە یان ڕاپۆرتی ساڵانە). دەوڵەتی عوسمانی یەکەم ساڵنامەی لەساڵی ١٨٤٧دا دەرکرد. ئنجا ساڵنامەی تری زۆر و جۆربەجۆری بەدوادا هات، کە زانیاریی کارگێڕی و ئابووری و ئاوەدانی و جوگرافی و مێژوویی گرنگیان دەگرتەخۆ بەپێی مەبەست و ناونیشانیان. بۆ زانیاری زیاتر بڕوانە: حسن دومان، البيبليوكرافيا والفهرس الموحد للسالنامات والنوسالات العثمانية، انقرة ١٩٩٩، ص٣٩ ومابعدها.

(٢٢) سالنامهء ولايت موصل (١٣١٢هـ)، موصل ولايتي مطبعەسندە باصلمشدر، ص٣٠٠، موصل ولايتي سالنامە رسميسيدر (١٣٣٠هـ)، عزتلو صفوت بك معرفتيلة ترتيب و دردنجي دفعه اولەرق، موصل مطبعەسندە اولنمشدر، ص٢٤٦-٢٤٧. هەروەها بڕوانە: بەختیار سەعید مەحموود شوانی، کەرکووك لە سەدەی نۆزدەهەمدا/ لێکۆڵینەوەیەك لە بارودۆخی ڕامیاری و ئابووری، سلێمانی ٢٠٠٩، ل١٧٤- ١٧٦.

(٢٣) شمس الدين سامي، قاموس الاعلام، مهران مطبعەسی، مج٣، استانبول، ١٣٠٦ رومي/ ١٨٨٩م، ص٢٨٨٩، مج٥، ١٣١٤رومي /١٨٩٢م، ص٣٨٤٦.

(٢٤) رحلة ريج...، ص١٢٩.

(٢٥) رحلة ابي طالب خان...، ص٢٤٧.

(٢٦) سەفەرنامەی هێنری بێندەر...، ل١٤٦.

(٢٧) هەمان سەرچاوە، ل٢١٠.

(٢٨) جيمس برانت، المصدر السابق، ص٦٠.

(٢٩) رحلة نيبور...، ص٨٦.

(٣٠) رحلة ريج...، ص٣٤، ٢٣٩.

(٣١) بڕوانە: سیاحەتنامەی ئەولیا چەلەبی، ل٢١٦.

(٣٢) بڕوانە: رحلة المستر جيمس برانت...، ص١٠٩، ١٤١.

(٣٣) هادي رشيد الجاوشلي، الحياة الاجتماعية في كوردستان، مطبعة الجاحظ، بغداد ١٩٧٠، ص٩٨.

(٣٤) رحلة متنكر...، ج١، ص١٥٨.

(٣٥) بۆ وەستان لەسەر هەندێ لەم سامانە سروشتییە، بڕوانە: كلوديوس جيمس ريج، المصدر السابق، ص٩٩-١٠٠.

(٣٦) مازوو (العفص) ماددەیەکی گوێزییە و لەدرەختی بەڕوو دێتە بەر کە لە کوردستاندا زۆرە، ئەم ماددەیە لەزۆر بواردا بەکاردەهێنرا، وەکو پیشەسازی بۆیە و مەرەکەب و هەروەها پێستە خۆشکردن و هی تر، بڕوانە: جان باتيست تافرنييه، العراق في القرن السابع عشر كما رآه الرحالة الفرنسي تافرنييه، ت: بشير فرنسيس وكوركيس عواد، مطبعة المعارف، بغداد ١٩٤٤، ص١١٧، هەروەها: د.سعدي عثمان حسين، كوردستان الجنوبية في القرنين السابع عشر والثامن عشر/ دراسة في علاقاتها السياسية والادارية والاقتصادية مع ايالتي بغداد والموصل، اربيل ٢٠٠٦، ص٣٧٧-٣٧٨.

(٣٧) العراق في القرن السابع عشر كما رآه الرحالة الفرنسي تافرنييه، ص٥٩.

(٣٨) بڕوانە: د. ليونهارت راوولف، رحلة المشرق (الى العراق وسوريا ولبنان وفلسطين)، ت: سليم طه التكريتي، دار الحرية للطباعة، بغداد ١٩٧٨، ص٢٠١، دومنيكو لانزا، الموصل في القرن الثامن عشر حسب مذكرات دومنيكو لانزا، ت: القس روفائيل بيداود،ط٢، الموصل ١٩٥٣، ص١٦، هەروەها:

Ralph Davis, English Imports From the Middle East, 1580-1780, in: M.A. Cook(ed.), Studies in the Economic History of the Middle East. Oxford univ. press, London 1970, p.200-204.

(٣٩) رحلة نيبور...، ص٧٦.

(٤٠) ياسين بن خيرالله الخطيب العمري ، غاية المرام في تأريخ محاسن بغداد دار السلام، دار منشورات البصري، مطبعة دار البصري، بغداد ١٩٦٨، ص٩٣-٩٤.

(٤١) سەفەرنامەی هێنری بێندەر...، ل٢٥٦.

(٤٢) کۆمپانیای نەوتی عیراق (IPC) لەساڵی ١٩٢٥ کێڵگە نەوتییەکانی باباگوڕگوڕی وەبەرهێنا، ئێستاش یەکێ لە سەرچاوە سەرەکییەکانی نەوتی عیراقن.

(٤٣) رحلة نيبور...، ص٨٣، ٨٦.

(٤٤) جمس بكنغهام، رحلتي الى العراق سنة ١٨١٦، ت: سليم طه التكريتي، ج١، مطبعة أسعد، بغداد ١٩٦٨، ص١٤٣.

(٤٥) رحلة نيبور...، ص٨٣-٨٤.

(٤٦) رحلة اوليفييه...، صفحات٦٧، ٦٨-٦٩، ٧٠، ١٥٨. هەر لە بارەی بەکارهێنانی نەوتی کوردستان لە بەغدا، بڕوانە: بطرس حداد، مقتطفات من رحلة تيفنو الى العراق (القرن السابع عشر)، مجلة (بين النهرين) ع(٨) س(٢) الموصل ١٩٧٤، ص٤٠٢.

(47) V. J. Parry, Materials of War in the Ottoman Empire, in : cook (ed.), studies in the Economic Hist… , p. 220.

(٤٨) رحلة ريج...، ص٢٠-٢١.

(٤٩) المصدر نفسه، ص١٦-١٧.

(٥٠) المصدر نفسه، ص٢١.

(٥١) رحلة اوليفييه...، ص١٢٥-١٢٦.

(٥٢) بڕوانە: سیاحەتنامەی ئەولیا چەلەبی...، ل١٦٧-١٦٨.

(٥٣) رحلة ابي طالب خان...، ص٢٤٣.

(٥٤) رحلة المستر جيمس برانت...، ص٥٩-٦١.

(٥٥) المصدر نفسه، ص٥٦، ٧٠.

(٥٦) المصدر نفسه، ص١٢٣، ١٤٠.

(٥٧) سیاحەتنامەی ئەولیا چەلەبی...، ل٢٠.

(٥٨) سەفەرنامەی هێنری بێندەر...، ل٢٥٤، ٢٥٥.

(٥٩) رحلة المستر جيمس برانت...، ص٢٤.

(٦٠) سیاحەتنامەی ئەولیا چەلەبی...، ل٨٤.

(٦١) رحلة ابي طالب خان...، ص٢٤٩.

(٦٢) بۆ نموونە بڕوانە: سیاحەتنامەی ئەولیا چەلەبی...، ل ٢٣، جان باتيست تافرنييە، المصدر السابق، ص١١٧، اوليفييه، المصدر السابق، ص٤٩.

(٦٣) رحلة المستر جيمس برانت...، ص١٠٩.

(٦٤) سیاحەتنامەی ئەولیا چەلەبی...، ل٢٣، ٢٢١.

(٦٥) جعفر الخياط، مشاهدات الدكتور ايفز...، ص٤١.

(٦٦) رحلة اوليفييه...، ص٧٠.

(٦٧) د. بدرخان السندي، المجتمع الكردي في المنظور الأستشراقي، دار آراس للطباعة والنشر، مطبعة وزارة التربية، اربيل ٢٠٠٢، ص٤٩٢.

(٦٨) رحلة المستر جيمس برانت...، ص١٢٤.

(٦٩) بڕوانە: رحلة اوليفييە...، ص ٤٨-٤٩، رحلة ريج...، ص ٩٩، رحلة المستر جيمس برانت...، ص٣٤.
(٧٠) سیاحەتنامەی ئەولیا چەلەبی...، ل١٩، ٦٢.
(٧١) رحلة اوليفييە...، ص١٢٥.
(٧٢) رحلة المستر جيمس برانت...، ص٢٤، ٦٦، ١٢٣.
(٧٣) رحلة متنكر...، ج١، ص٧٩، ٩٢، ١٦٩.
(٧٤) سیاحەتنامەی ئەولیا چەلەبی...، ل٤٩.
(٧٥) رحلة متنكر...، ج١، ص ٨٧، ١٠٩.
(٧٦) رحلة المستر جيمس برانت...، ص٣٣.
(٧٧) بڕوانە: سیاحەتنامەی ئەولیا چەلەبی...، لاپەڕەكانی ١١١، ١٢١-١٢٥، ١٤٢، ٢٢٠، ٢٨٧، ٢٨٩.
(٧٨) سەفەرنامەی هێنری بێندەر...، ل١٨٢.
(٧٩) عماد عبدالسلام رؤوف، الموصل في العهد العثماني/ فترة الحكم المحلي ١١٣٩-١٢٤٩هـ/١٧٢٦-١٨٣٤م، مطبعة الآداب، النجف الاشرف ١٩٧٥، ص٣٠١.
(٨٠) ياسين العمري، المصدر السابق، ص٩٦.
(٨١) كلوديوس جيمس ريج، المصدر السابق، ص٢١٨.
(٨٢) ميجر سون، المصدر السابق، ج١، ص٢٤٠.
(٨٣) رحلة المستر جيمس برانت...، ص٩٦.
(٨٤) سیاحەتنامەی ئەولیا چەلەبی...،ل١٤٢.
(٨٥) رحلة أوليفييە...، ص٢٨.
(٨٦) سیاحەتنامەی ئەولیا چەلەبی...، ل٨٤.
(٨٧) رحلة أوليفييە...، ص١٧٧.
(٨٨) جعفر الخياط، مشاهدات الدكتور ايفز...، ص٤١.
(٨٩) سەفەرنامەی هێنری بێندەر...، ل١٤٧.
(٩٠) سیاحەتنامەی ئەولیا چەلەبی...، ل١٩.
(٩١) هەمان سەرچاوە، ل٤٩.
(٩٢) هەمان سەرچاوە، ل١١١، ٢١٦، ٢٢٠.
(٩٣) رحلة المستر جيمس برانت...، ص٩١-٩٢.
(٩٤) رحلة متنكر...، ج١، ص٢٤١، ج٢، ص١٧.
(٩٥) رحلة المستر جيمس برانت...، ص٤٩، ٥٥.
(٩٦) المصدر نفسه، ص٦٨، ١٢٢.
(٩٧) المصدر نفسه، ص٩٧.

(٩٨) المصدر نفسه، ص٤٩، ٥٥.
(٩٩) سياحەتنامەی ئەوليا چەلەبی...، ل ١١١.
(١٠٠) رحلة المستر جيمس برانت...، ص٩٦–٩٧، ١٢٣.
(١٠١) عباس العزاوي، المصدر السابق، مج٦، ص٤٤–٤٥.
(١٠٢) بطرس حداد، رحلات سباستياني الى العراق في القرن السابع عشر، مجلة (المورد) مج(٩) ع(٣) ١٩٨٠، ص٢٠٣.
(١٠٣) رحلة المستر جيمس برانت...، ص٥٦.
(١٠٤) جعفر الخياط، مشاهدات جون أشر في العراق، فصل ضمن كتاب: رحالة اوروبيون في العراق، دار الوراق للنشر –لندن ٢٠٠٧، ص١٢٧.
(١٠٥) رحلة المستر جيمس برانت...، ص٣٣، ٩٦، ١١٦.
(١٠٦) المصدر نفسه، ص١٢٢.

## لیستی سەرچاوەكان

**یەكەم/ چاپكراوی حكومی:**

- سالنامەء ولايت موصل (١٣١٢هـ) موصل ولايتي مطـبعەسندە باصلمشدر.
- موصل ولايتي سالنامه رسميسـيدر (١٣٣٠هــ)، عزتلـو صـفوت بـك معرفتيلـة ترتيـب و دردنجي دفعه اولەرق، موصل مطـبعەسندە اولنمشدر.

**دووەم/ كتێب:**

**أ/ بەزمانی توركی:**

- شمس الدين سـامي، قـاموس الاعـلام، مهـران مـطـبعەسی ، مـج٣، اسـتانبول، ١٣٠٦ رومي/١٨٨٩م، مج٥، ١٣١٤رومي /١٨٩٢م.

**ب/ بەزمانی عەرەبی:**

- أبي طالب خان، رحلة ابـي طالـب خـان الى العـراق واوروبـا، ت: د.مصـطفى جـواد، دار الوراق للنشر– لندن ٢٠٠٧.
- اوليفييـه، رحلـة اوليفييـه إلى العـراق (١٧٩٤–١٧٩٦م)، ت: د.يوسـف حبـى، مطبعـة المجمع العلمي العراقي، بغداد ١٩٨٨.
- د. بـدرخان السـندي، المجتمـع الكـردي في المنظـور الأستشـراقي، دار آراس للطباعـة والنشر، مطبعة وزارة التربية، اربيل ٢٠٠٢.
- جان باتيست تافرنييه،العراق في القرن السابع عشر كما رآه الرحالة الفرنسي تافرنييـه، ت: بشير فرنسيس وكوركيس عواد، مطبعة المعارف، بغداد ١٩٤٤.
- جعفر الخياط، مشاهدات جون أشر في العراق، فصـل ضـمن كتـاب: رحالـة اوروبيـون في العراق، دار الوراق للنشر –لندن ٢٠٠٧.
- جيمس بكنغهام، رحلتي الى العراق سـنة ١٨١٦، ت: سـليم طـه التكـريتي، ج١، مطبعـة أسعد، بغداد ١٩٦٨،
- جيمس برانت، رحلة المستر جيمس برانت الى المنطقة الكردية عـام ١٨٣٨، ت: حسـين احمد الجاف، مطبعة الجاحظ، بغداد ١٩٨٩.
- حسن دومان، البيبليوكرافيا والفهرس الموحد للسالنامات والنوسالات العثمانيـة، انقـرة ١٩٩٩.
- دومنيكو لانزا، الموصل في القرن الثامن عشر حسب مذكرات دومنيكـو لانـزا، ت: القـس روفائيل بيداود، ط٢، الموصل ١٩٥٣.

- د.سعدي عثمان حسين، كوردستان الجنوبية في القرنين السابع عشر والثامن عشر/ دراسة في علاقاتها السياسية والادارية والاقتصادية مع ايالتي بغداد والموصل، اربيل ٢٠٠٦.
- عباس العزاوي، تأريخ العراق بين احتلالين، شركة التجارة والطباعة المحدودة، مج٦، بغداد ١٩٥٤.
- عبدربه ابراهيم الوائلي، تاريخ الامارة البابانية/ ١٧٨٤-١٨٥١،ط١، دار الزمان، دمشق- سوريا ٢٠٠٨.
- عماد عبدالسلام رؤوف، الموصل في العهد العثماني/ فترة الحكم المحلي ١١٣٩-١٢٤٩هـ/١٧٢٦-١٨٣٤م، مطبعة الآداب، النجف الاشرف ١٩٧٥.
- كارستن نيبور، رحلة نيبور إلى العراق في القرن الثامن عشر، ت: د.محمود امين حسين، مراجعة وتعليق: سالم الآلوسي، بغداد ١٩٦٥.
- كلوديوس جيمس ريج، رحلة ريج في العراق عام ١٨٢٠، ت: بهاء الدين نوري، ج١، مطبعة السكك الحديدية، بغداد ١٩٥١.
- د. ليونهارت راوولف، رحلة المشرق (الى العراق وسوريا ولبنان وفلسطين)، ت: سليم طه التكريتي، دار الحرية للطباعة، بغداد ١٩٧٨.
- ميجرسون، رحلة متنكر الى بلاد مابين النهرين وكردستان، ت: فؤاد جميل، ج١، بغداد ١٩٧٠، ج٢، ١٩٧١.
- هادي رشيد الجاوشلي، الحياة الاجتماعية في كوردستان، مطبعة الجاحظ، بغداد ١٩٧٠.
- هنري بنديه، رحلة الى كردستان في بلاد مابين النهرين سنة ١٨٨٥، ت: يوسف حبي، اربيل ٢٠٠١.
- ياسين بن خيرالله الخطيب العمري ، غاية المرام في تأريخ محاسن بغداد دار السلام، دار منشورات البصري، مطبعة دار البصري، بغداد ١٩٦٨.
- د. يحيى مراد، (ردود على شبهات المستشرقين) من قضايا الأستشراق/ بحوث ودراسات، موجود في شكل (*pdf*) على سايت (*www.kotobarabia.com*).

ج- بەزمانی کوردی:

- ئەولیا چەلەبی، سیاحەتنامەی ئەولیا چەلەبی/ یان: کورد لەمێژووی دراوسێکانیدا، و: ناکام، چ٢، بەغدا ١٩٧٨.
- بەختیار سەعید مەحموود شوانی، کەرکوك لە سەدەی نۆزدەهەمدا/ لێکۆڵینەوەیەك لەبارودۆخی ڕامیاری و ئابووری، سلێمانی ٢٠٠٩.

– هێنری بێندەر، سەفەرنامەی هێنری بێندەر / كوردستان ، میزۆپۆتامیا، ئێران، و: ئەبوبەكر خۆشناو، سلێمانی ٢٠٠٦.

**د– بەزمانی ئینگلیزی:–**

– *Ralph Davis, English Imports From the Middle East, 1580-1780, in: M.A. Cook(ed.), Studies in the Economic History of the Middle East. Oxford University press, London 1970.*

– *V. J. Parry, Materials of War in the Ottoman Empire, in: cook (ed.), studies in the Economic History…*

**سێیەم: وتار و توێژینەوە:**

– بطرس حداد، مقتطفات من رحلة تيفنو الى العراق (القرن السابع عشر)، مجلة (بين النهرين) ع(٨) س(٢) الموصل ١٩٧٤.

– بطرس حداد، رحلات سباستياني الى العراق في القرن السابع عشر، مجلة (المورد) مج(٩) ع(٣) ١٩٨٠.

– جعفر الخياط، مشاهدات الدكتور ايفز بين بغداد وكركوك والموصل، مجلة (الاقلام)، ج (١٢) س (٢) آب ١٩٦٦، بغداد.

# ملخص البحث
# النشاط الحرفي في كردستان خلال العهد العثماني في ضوء كتب الرحلات

**أ.د. سعدي عثمان هروتى**
**جامعه صلاح الدين – اربيل**

لقد قام العديد من السياح والرحالة بزيارة كردستان في إطار رحلاتهم عبر الأمبراطورية العثمانية. وكان اولئك الرحالة على العكس من مؤرخي العهد العثماني، الذين كانوا يهتمون بتدوين الحوادث السياسية بصورة رئيسة، قد عمدوا الى تسجيل ملاحظاتهم وانطباعاتهم عن الجوانب المختلفة من حياة السكان ومنها انشطتهم الأقتصادية. ولذلك حفلت كتب الرحالة بمعلومات مهمة عن النشاط الحرفي والصناعي في كردستان. ومنهم على الأخص: السائح العثماني أوليا جلبي الذي جاء الى تلك البلاد في عام ١٦٥٥م. الرحالة الدانماركي كارستن نيبور –١٧٦٦. الرحالة الفرنسي أوليفييه– ١٧٩٤–١٧٩٦. المقيم البريطاني في بغداد كلوديوس جيمس ريج– ١٨٢٠. القنصل البريطاني في ارضروم جيمس برانت– ١٨٣٨. والرحالة الفرنسي هنري بنديه –١٨٨٥. وفي ضوء المعلومات التي يزودنا بها اولئك الرحالة، نستطيع الوقوف على الحرف السائدة آنذاك في كردستان، ونتبين من مهارة الحرفيين الكرد في انتاج بعض السلع. كما تبرهن ملاحظات بعض الرحالة على انتقال كردستان الى بدايات مرحلة الأنتاج السلعي في تلك الفترة. ولاسيما ان بعض الورشات الحرفية قد تحولت الى معامل يراعى فيها التخصص في العمل. وذلك رغم أن بعض الحرف البسيطة ظلّت تمارس في المنازل. ومن خلال كتب الرحالة أيضاً نعلم بأنه كان يتم استخراج بعض المعادن وخاصةً النفط والقير، ولكن بصورة محدودة وبدائية. إضافة الى ذلك فأن بعض الرحالة قد اشاروا الى ثمة عراقيل كانت تواجه النشاط الحرفي في كردستان، وخاصة تدفق البضائع الأوروبية الى اسواق المنطقة ومنافستها للسلع المنتجة محلياً. ولكن بالمقابل من ذلك نلاحظ بأن كتب الرحلات عموماً لاتتضمن أية معلومات عن الطوائف أو النقابات الحرفية في مناطق كردستان. الأمر الذي قد يفيد بعدم وجود تلك الطوائف في المدن الكردية خلال تلك الفترة. بالرغم من ذلك يمكن القول بأن كتب الرحلات تعدّ مصادر لايمكن الأستغناء عنها في تدوين التأريخ الأقتصادي للمنطقة عموماً وتاريخ الصناعة في كردستان على وجه الخصوص.

# Abstract

## The Crafts in the Ottoman Kurdistan according to the Voyage books

Professor. Dr. Saadi Uthman Haruti
College of Art / Salahaddin university –Erbil

Many travelers and voyagers visited Kurdistan while they travel across the Ottoman Empire. Those travelers' on the contrary Ottoman historians (who were writing down the political events mainly) recorded their observations and remarks about the various aspects of life of the population and their economic activities. Therefore their books contain important information about the industrial activity in Kurdistan at this time. Spatially these travelers: The Ottoman traveler Avlia jalabi, who came to this country in 1655. Danish traveler Carsten Niebuhr -1766. French voyager G.A. Olivier - 1794-1796. British Resident in Baghdad Claudius James Rich - 1820. British Consul in Erzurum James Brandt - 1838. French traveler Henry Binder -18٨5. In light of the information which provided by those travelers, we know which handcrafts was prevailing then in Kurdistan, and we can see the mastery of Kurdish craftsmen in the production of certain goods. Some observations of the traveler's show that Kurdistan was began the early stage of commodity production in that period. Because some craft workshops has been transformed into a factory which applied the specialization at work. And despite the fact that some simple crafts continued to practice at home. Through traveler books also we know that some minerals was extracted, particularly oil and tar, but in a limited and primitive. Finally, some traveler signed certain factors which formed obstacles against craft activity in Kurdistan, especially the flow of European goods to markets in the region and its rival for locally produced goods. Further we can say that traveler books are very important sources for economic history of the region in general, and the history of the industry in Kurdistan in particular.

# (تۆفیق وەهبی)
# لە بیرەوەرییەکانی (د. نووری تاڵەبانی)

**د. نووری تالەبانی**



ئەکادیمیای کوردی ئێوارە کۆڕێکی لە رۆژی چوارشەمەی رێکەوتی١٣ /٢ /٢٠١٣ بۆ دکتۆر نووری تاڵەبانی، سەرۆکی ئەکادیمیای کوردی رێکخست، بۆ گێڕانەوەی بیرەوەرییەکانی لەسەر زانای گەورەی کورد تۆفیق وەهبی بەگ. سەرەتا د. نەجاتی عەبدوڵلا، سکرتێری ئەکادیمیا ژیاننامە و بەرهەمەکانی مامۆستا تۆفیق وەهبی خستە بەرچاو ئامادەبووانی ئەو کۆڕە، دواتر مامۆستا نووری تاڵەبانی بیرەوەرییەکانی لەگەڵ ئەو زانا گەورەیە لەو ماوەی لە لەندەن بووە، بە تایبەتی لە ساڵانی ١٩٧٤ – ١٩٧٥دا گێڕایەوە.

دکتۆر نووری تاڵەبانی بەم شێوەیە دەستی بە قسەکانی کرد: خۆم بە بەختەوەر دەزانم کە لەو ماوەی لە (لەندەن) بووم لە نزیکەوە زانای گەورەی کورد تۆفیق وەهبی بەگم ناسیوە. هەرچەندە دەمێك بوو ناویم بیستبوو، بەڵام لە ساڵی ١٩٧٣ بە خزمەتی گەیشتم. لە کۆتایی ئەو ساڵە بە ئەرکێکی زانستییانە (تەفەروغی عیلمی) لەلایەن زانکۆی سلێمانییەوە بۆ ماوەی ساڵێك ڕووم کردە لەندەن. بەهۆی دەستپێکردنەوەی شەڕ لە کوردستاندا، درێژەم بە مانەوەم دا، تا مانگی ئەیلوولی ١٩٧٥ نەگەڕامەوە بۆ وڵات. لەو ماوەدا سەردانی مامۆستا تۆفیق وەهبیم دەکرد، پاشان لەسەر پێشنیازی خۆی، لە ڕۆژانی دووشەمەدا دەچوومە لای لە ماڵەکەی، کە لەناوەڕاستی شارەوە تۆزێك دوور بوو. بە هاندانی ئەو زانایە کەوتمە کۆکردنەوەی وشەی قانوونیی کوردی، بە مەبەستی ئامادەکردنی

فەرهەنگێکی قانوونی بە چوار زمانی: عەرەبی و کوردی و فەڕەنسی و ئینگلیزی، ئەو فەرهەنگە لە ساڵی ٢٠٠٤ لە هەولێر چاپ کرا و بڵاوکرایەوە. پەیوەندیم لەگەڵ مامۆستا تۆفیق وەهبی پاش گەڕانەوەشم بۆ کوردستان لە ئەیلولی ١٩٧٥دا هەر درێژەی هەبوو بە نامە نووسین و سەردانی لە کاتی گەڕانەوەم بۆ لەندەن، کە تا پاییزی ١٩٧٨ هەموو ساڵێك دووجار دەچوومەوە بە هۆی مانەوەی خێزانەکەم لەو شارە بۆ تەواوکردنی خوێندنی تەخەسوسی لە بواری پزیشکیدا. لێرەدا بەشێك لە بیرەوەرییەکانم لەگەڵ ئەو زانا گەورەیە دەگێڕمەوە، ئاماژەش بۆ بەشێك لە ڕا و بۆچوونەکانی دەکەم، بەتایبەتی ئەوانەی پەیوەندییان بە زمان و ئەدەبی کوردییەوە هەیە، تا لەبیر نەکرێن و سوودیان لێ وەربگیرێ.

ئەوەی لێرەدا دەیگێڕمەوە قسەکانی ئەو زانا گەورەیەیە، لەگەڵ چەند تێبینییەکی لەسەر ئەو ڕووداوانەی لە کاتی قسەکردندا دەیگێڕانەوە. لە دەرەوەی ئەو بابەتە، پرسیارم لێ نەدەکرد، بەڵام جاروبار وەکو کورد دەڵێ: قسە قسە ڕادەکێشێ، شتێك دەهاتەوە بیری و دەیگێڕایەوە، لێرەدا بە ئەمانەتەوە بەشێکیان دەگێڕمەوە.

تۆفیق وەهبی لە بنەماڵەیەکی ناسراوی شاری سلێمانییە، ناوی تۆفیق، ناسراو بە (وەهبی) کوڕی مارفی کوڕی محەممەدە، لە شارۆچکەی چوارتای نزیك بە سلێمانی، لە ٣١ ی کانوونی یەکەمی ١٨٩٠ هاتۆتە دونیاوە. باری دارایی بنەماڵەکەی باش بووە، بۆیە خوێندنی لە قوتابخانەی (سەرەتایی ڕوشدیەی سەربازی) لە سلێمانی تەواو کردووە. پاشتر چۆتە بەغدا بۆ درێژەپێدان بە خوێندنی لە قوتابخانەی (ناوەندی ڕوشدیەی سەربازی)، ئەوەش ڕێگای بۆ خۆش کردووە بچێتە ئەستەموول و کۆلێجی سەربازی لەوێ تەواو بکات، لە ساڵی ١٩١١ بووە بە ئەفسەر لە لەشکری عوسمانیدا. لە چەند شەڕێکدا بەشداری کردووە، بەتایبەتی لە بەرەی شەڕ لە لیبیا دژ بە لەشکری ئیتاڵیا. ماوەیەك ئەفسەر بووە لەو فیرقەیەی، کە موستەفا کەمال فەرماندەی بووە، بۆیە لەنزیکەوە ناسیویەتی. پاش شەڕی جیهانی یەکەم، لە مانگی ئابی ١٩١٩ (بینباشی ئەرکان حەرب) تۆفیق وەهبی گەڕاوەتەوە بۆ سلێمانی. لە نیسانی ١٩٢٠دا کراوە بە ئەفسەری سیاسی لە ڕانیە، پاش ماوەیەك هەڵبژێردراوە بە ئەندام لە ئەنجومەنی شارەوانی ئەو

شارۆچکەیە. لە کۆتایی ساڵی ١٩٢١ دەچێتە بەغدا و بەشداری لە دامەزراندنی لەشکری عێراق دەکات و دەکرێتە ئەفسەری "حەرەکات". لە ئەیلوولی ١٩٢٢ لەگەڵ چەند ئەفسەرێکی کورد لەگەڵ شێخ مەحموودی حەفید دەگەڕێنەوە بۆ کوردستان و دەبێتە یاریدەدەری بۆ کاروباری سەربازی. کاك (حەمە ڕەسول هاوار) لە زاری تۆفیق وەهبییەوە نووسیویەتی: "چەند ئەفسەرێکی کورد بووین لە سوپای عێراقدا، بە ڕەزامەندی ئینگلیزەکان و حکومەتی عێراق، لەسەر داخوازی شێخ مەحموود و بەپێی هەستی نەتەوایەتیی خۆمان لەگەڵ شێخ مەحموودا چووینەوە بۆ کوردستان و بەشداریمان لە دامەزراندن و ڕێکخستنی کاروبارەکاندا کرد، بەتایبەتی کاروباری سوپا، هەموومان بەوپەڕی دڵسۆزییەوە بە شەو و ڕۆژ کارمان دەکرد بەئومێدی ئەوەی لە خوارووی کوردستان، وەکو چۆن لە بەغدا حکومەتێك بۆ عەرەبی عێراق دروست کرابوو، بەو پێیەش لەوێ حکومەتێك بۆ کورد دروست بکرێت و هەرچییەك لە توانامانـدا بێ لەو ڕووەوە بۆ کوردی بکەین"[1]. ئەو ڕووناکبیرانەی نزیك بوون لە شێخ مەحموود هەوڵیان دەدا کاروباری دەزگاکانی حکومەتەکەی بە شێوەیێکی نوێ دابمەزرێ، بۆیە بە"موتەنەویر" ناو دەبران، بەڵام کەسانێکی تر کە ژمارەیان زۆرتر بووە و دەسەڵاتدارتریش بوون، هەوڵیان دەدا ئەو "موتەنەویرانە"دەمکوت بکرێن، چەند کەسێکیان لێ کوژراوە، وەکو جەمال عیرفان و عارف سائیب[2]. لە پاش ڕووخانی حکومەتی دووەمی شێخ مەحموود، تۆفیق وەهبی لەگەڵ چەند کەسێکی تر دەگەڕێنەوە بۆ بەغدا، بەهاوکاری حەپسەخانی نەقیب. ماوەیەك لە بەغدا دەگیرێن، پاش بەردانیان تۆفیق وەهبی بۆ ماوەیەك بێکار دەمێنێتەوە. سەبارەت بە سیاسەتی ئینگلیز لەو دەمەدا، تۆفیق وەهبی ڕاشکاوانە وتوویەتی: "سیاسەتی ئینگلیز ئەوە نەبوو حکومەتێکی کوردی دابمەزرێنێت، بۆیە زۆرمان هیوابڕاو بووین و یەکە یەکە لە شێخ مەحموود دوورکەوتینەوە"[3]. پاشان وتوویەتی: "ئینگلیزەکان دەیانویست دەستی بە دەستی بە شێخ مەحموود بکەن، لە سەرەتاوە نەیانویستووە دەسەڵاتی حوکمداریەتەکەی لە سنووری شاری سلێمانی و ناوچەی دەوروبەری تێپەڕ بکات".

حکومەتی عێراق تۆفیق وەهبی بە پلەی (سەرهەنگ) دەگێڕێتەوە بۆ ناو لەشکری عێراقی و داوای لێ دەکات کۆلێجی ئەفسەران لە بەغدا دابمەزرێنێ. لە ساڵانی ١٩٢٥ تا ١٩٢٩ فەرماندەی ئەو کۆلێجە بووە، لە ٢٣ی ئابی ١٩٢٩ دەبێ بە (کۆلۆنێل). هەر لەو ساڵەدا دەینێرنە کۆلێجێکی تایبەت بە ئەفسەرە پایە بەرزەکان لە شاری (کێنت) لە نزیکی لەندەن، بۆ تەواوکردنی خوێندنی بالای سەربازی. لە ٣٠ نیسانی ١٩٣٠ خزمەتی دەگوازرێتەوە بۆ وەزارەتی ناوخۆی عێراق و دەکرێتە "موتەسەرپیفی" سلێمانی، بەڵام بۆ ماوەیێکی کورت، چونکە لە ٢٢ ئاب، ماوەیەکی کەم پێش کارەساتی شەشی ئەیلوولی ١٩٣٠ لەو پۆستەی لادەبرێ، کە زۆر نارەحەتی دەکات، بەناچاری رووەدەکاتە بەیرووت و تا ١٩٣٥ لەوێ نیشتەجێ دەبێ. لە ١٩٣٢ بەیاننامەیەك دەربارەی مەسەلەی کورد لە لوبنان بلاو دەکاتەوە. لە کۆتایی ساڵی ١٩٣٥ دەگەڕێتەوە بۆ بەغدا، لە ساڵی ١٩٣٦ دەکرێتە بەڕێوەبەری گشتی "فەرمانگەی ئەشغال". لە حوزەیرانی ١٩٤٤ لە وەزارەتی یەکەمی حەمدی پاچەچی و لە وەزارەتی دووهەمی لە ئابی ١٩٤٤ تا کۆتایی ١٩٤٦ دەبێتە وەزیری ئابووری. لە ئاداری ١٩٤٧ تا کۆتایی ١٩٤٨ دەکرێتە وەزیری (مەعاریف) لە وەزارەتی ساڵح جەبر. لە ١٩٥٠ لە وەزارەتی تۆفیق سوێدی دەبێتە وەزیری کاروباری کۆمەڵایەتی. لە ساڵانی ١٩٤٨ بەولاوە ئەندامی ئەنجومەنی پیران (ئەعیان) بووە.

دکتۆر خالید ناجی، کە مامۆستایەکی ناسراوی کۆلێجی پزیشکی بووە لە بەغدا، لە ساڵی ١٩٨٧ لە هەولێر بۆی گێڕامەوە و گوتی: لە ساڵی ١٩٤٨ (موعید) بووە لەو کۆلێجە، ڕاگری کۆلێج داوای لێ کردووە هاوکاری ئەو مامۆستایانە بکات، کە هەموویان بەریتانی بوون و بۆ بەشداریکردن لە تاقیکردنەوەی خوێندکارانی کۆلێجەکەیان بانگ کرابوون، چونکە لەو دەمەدا وەزارەتی"مەعاریف" سەرپەرشتی کۆلێجەکانی دەکرد، جاری زانکۆی بەغدا دانەمەزرابوو. پێش گەڕانەوەی ئەو مامۆستایانە بۆ ولاتی خۆیان، وەزیری مەعاریف ئێوارە خوانێکیان بۆ سازدەکات لە ماڵەکەی خۆی. دکتۆر خالید ناجی گوتی: چوومە ئوتێل بەشوێنی میوانەکاندا تا پێکەوە بچینە ماڵی تۆفیق وەهبی، یەکێکیان لێی دەپرسێت پلەی خوێندەواری وەزیرەکەتان چۆنە؟ ئەویش پێی دەڵێ: (ئەوەی من

بزانم، شارەزایەتی لە هەشت زمانی کۆن و تازەدا هەیە، لەگەڵ سانسکریتی). مامۆستا ئینگلیزەکە لە مەبەستی تێدەگا و عوزری بۆ دەخوازێ. ئەو شەوە تا نیوەشەو لە ماڵی وەزیر دەمێننەوە، هەمان ئەو مامۆستایە لە کاتی گەڕانەوەیان بۆ ئوتێل پێی دەڵێ: (خۆزگە زووتر چاومان بە وەزیرەکەتان بکەوتبا، تا زیاتر سوودمان لێ وەرگرتبا)!

لە کۆتایی ساڵی ١٩٥٢ ساڵح جەبر حیزبێکی نوێ بەناوی حیزبی "ئوممەی ئیشتراکی" پێکدێنێ، تۆفیق وەهبی و چەند کەسایەتییێکی کوردی تر هاوکاری لەگەڵ دەکەن، وەهبی بەگ دەکرێتە ئەندامی سەرکردایەتی و دواتر دەبێتە جێگری سەرۆکی ئەو حیزبە. سەیر لەوەدابوو وەهبی بەگ ناوی ئەو حیزبەی بە"حیزبی ئوممییە نا ئیشتراکییەکان" ناودەبرد ! و دەیگوت: "وەك چێشتی مجێور، هەموو جۆرە کەسانێکی تێدابوو"! ڕەخنەی لە خۆی دەگرت و دەیگوت: "شوێنی کڵاوی بابردوو کەوتبووین"! لە پایزی ١٩٥٢دا ساڵح جەبر لەگەڵ چەندین کەسایەتی عەرەب و کورد، کە تۆفیق وەهبی و شێخ بابا عەلی شێخ مەحمودیان لەگەڵ بوون، دێنە کەرکوك، ڕۆژی پاشتر دەچنە سلێمانی. کاتێ کاروانی ئۆتۆمبیلەکانی ساڵح جەبر و هاوڕێکانی نزیك سلێمانی دەبنەوە، شێخ مەحمود بە سوارە لەگەڵ زیاتر لە بیست کەسی تر لە (داریکەلی) یەوە دەچنە ملەی تاسڵووجە بۆ پیرەوەچوونیان. ڕۆژی پاشتر وێنەیان پێکەوە لەسەر لاپەڕی یەکەمی ڕۆژنامەی (الامة) بڵاودەکرێتەوە. لە ساڵی ١٩٧٥ پرسیارم لێ کرد سەبارەت بەهۆی چوونی شێخ مەحمود بە بەرەوپیری ساڵح جەبر؟ بەڵام پرسیارەکەم بێ وەڵام مایەوە[٤].

تۆفیق وەهبی لەسەرەتای دامەزراندنی دەوڵەتی عێراقەوە هەوڵی پێشخستنی زمانی کوردی داوە. لە ساڵی ١٩٢٣ لەسەر داوای وەزارەتی"مەعاریف" ڕێزمانی کوردی ئامادە کردووە بۆ قوتابخانە سەرەتاییەکان، پێشنیهادی کردووە دەستکاری چەند پیتێکی عەرەبی بکرێت تا بگونجێن لەگەڵ فۆنەتیکی زمانی کوردی، ئەویش بەزێدەکردنی چەند ئیشارەتێك، بەڵام پێشنیازەکەی قبووڵ نەکراوە لەلایەن وەزارەتەوە و بەشێوەیەکی تر لێکدراوەتەوە. بەهەوڵ و کۆششی تۆفیق وەهبی بەگ و ئەمین زەکی بەگ لە ساڵی ١٩٣٩، ئێسگەی ڕادیۆی کوردی

لە بەغدا کراوەتەوە. لە ساڵی ١٩٤٨ تۆفیق وەهبی یەکێك بووە لـە دامەزرێنـەرانی "کۆڕی زانیاری عێراقی"، پاش دامەزراندنی ئـەو دەزگـا ئەکادیمییـە، بـە ئەنـدامی کارا و جێگری سەرۆك هەڵبژێردراوە. لە پاش دامەزراندنی کۆڕی زانیـاری کـوردی، وەکو ئەندامی شکۆمەند (فەخری) هەڵبژێردراوە، چـەند نووسـینێکی زۆر بـەنرخی لـە گۆڤارەکەیـدا بڵاوکردۆتــەوە. تۆفیـق وەهبـی سـەرۆکی یەکـەمین ئەنجومـەنی خوێندنی باڵا بووە لە عێـراق، کـە هـەنگاوی یەکـەمی دامەزرانـدنی زانکـۆی بەغـدا بووە. لـەو پۆسـتەی زۆر نامێنێتـەوە، چـونکە سـەرقاڵی نووسـین و کاروبـاری تـر بـووە. لـە سـاڵی ١٩٥٦ هەڵبـژێردراوە بـە سـەرۆکی فـەخری "یانـەی سـەرکەوتنی کوردی" لە بەغدا، ئێواران دەرسی زمانی کوردی تێدا دەگوتـەوە بـەبێ بەرانبـەر. لـە سـاڵی ١٩٥٨ هەڵبـژێرراوە بـە سـەرۆکی (کۆمەڵـەی داهێنـەران و وەرگێـڕان و بڵاوکردنەوە) لە عێراق، کە گۆڤـاری (الکاتـب)ی بـڵاو دەکـردەوە. تۆفیـق وەهبـی کەسایەتییەکی ئەکادیمی بوو پێش ئەوەی سیاسـەتمەدار بـێ، بەشـی هـەرە زۆری ژیانی بۆ خزمەتی زانسـت و لێکۆڵینـەوەی زانسـتی تـەرخان کردبـوو. نووسـینێکی زۆری بڵاو کردۆتەوە لە گۆڤـارە کوردییـەکانی وەکـو: (گەلاوێـژ) و (دەنگـی گێتـی تـازە) و (پێشـکەوتن) و (پـەروەردە و زانسـت) و (شـەفەق) و (کـۆڕی زانیـاری کوردی). لـە تـەموزی ١٩٥٨ لـە تورکیـا دەبـێ، لـەوێوە بڕیـاری چـوونە بـەریتانیا دەدات و لە لەندەن نیشتەجێ دەبێ تا کۆچکردنی لە ١٥ کانوونی دووەمی ١٩٨٤. چـەند جارێـك حکومـەتی عێـراق بـەهۆی سـەفارەتەکەیەوە لـە لەنـدەن داوای لـێ کـردووە بگەڕێتـەوە بـۆ بەغـدا و ببـێ بـە سـەرۆکی "کـۆڕی زانیـاری کـورد" و خانووەکـەی بـۆ بگێڕێتـەوە، بـەڵام وەڵامیـان ناداتـەوە. لـە لەنـدەن زۆر بـە دەستکورتی دەژیا، (سامی خوندە)ی ئاوەڵزاوای، کە بەناو نوێنەری بووە، هیچـی بۆ نەدەنارد. چەند جارێك لە بەغدا چـوومەتە لای و پـێم ڕاگەیانـدووە، کـە تۆفیـق وەهبی بەگ و خێزانەکەی دەست کورتن، بەشێك لەو پارەی لایەتی بۆیان بنێـرێ، بـەڵام خـۆی لـێ گێـل دەکـرد. پـێش کۆچـکردنی، وەسـیەتی کردبـوو تەرمەکـەی ببەنــەوە بــۆ کوردســتان لەســەر لووتکەیــەکی بــەرزی پیرەمــەگروون، کــە لــە نووسینەکانیا باسی کردبوو، بە خـاکی بسـپێرن. وەسـیەتەکەی جێبـەجێ کـراوە، زۆر بەڕێزەوە بە خاکی نیشتمانەکەی سپێردرا.

تۆفیق وەهبی پیاوێکی زۆر قسە خۆش و ڕووخۆش بوو، حەزی لە نوکتە بوو، بە موناسەبە قسە خۆشەکانی خۆی و دۆست و کەسانی دیکەی دەگێڕایەوە. جارێکیان باسی زەحمەتی سەفەری نێو سلێمانی و کەرکووکی دەکرد و گوتی: کوێخاییێکی هەمەوەند بڕیار دەدا کاری جەردەیی نەکات، بەڵام ڕۆژێك لەگەڵ بەشێك لە دانیشتوانی دێیەکەی دەچنە سەر گردێك، مام کوێخا قامەت دەبەستێ بۆ نوێژکردن و کتوپڕ نوێژەکەی دەبڕێ و ڕوو دەکاتە ئەو کەسانەی لەگەڵی بوون و دەڵێ: (قەومەکە لە دوورەوە تارماییەك لەسەر ڕێگای کەرکووك دیارە، لەوە دەچێ کاروان بێ و بارەکانیشیان کووتاڵ بن، ئیتر کەیفی خۆتانە)! پاشان قامەت دەبەستێتەوە بۆ تەواوکردنی نوێژەکەی!

تۆفیق وەهبی لە ساڵی ١٩٥٨دا لە لەندەن خۆی و خێزانەکەی جێگیر ببوون، کە بریتی بوو لە خۆی و هاوسەرەکەی: خاتوو ئاسیا ڕێزەلی، ناسراو بە ئاسیا تۆفیق وەهبی و هەردوو کوڕەکەیان: د. سزا و سروش، کە موسیقاژەن بوو. ئەو خێزانە هەموویان لە خانووێکی بچووکدا دەژیان، کە شایانی ئەوان نەبوو[٥]. ژیانی ئەو خێزانە ئاسان نەبوو، بە تایبەتی لە دوا ساڵەکانی ژیانی ئاسیا خانمدا، کە تووشی نەخۆشی (لوکیمیا) ببوو، دەبوو هەموو مانگێ لە نەخۆشخانە لەژێر چاودێری پزیشکدا خوێنی تێ بکرێ لەگەڵ چەند ماددەیێکی کیمیاویدا. وەکو دکتۆرێك بۆ د. عەتیەی خێزانمی گێڕابووەوە، هەموو جار مردنی بە چاوی خۆی دەبینی. سەرباری حاڵەتی تەندروستی خراپی ئەو شا ژنە، زۆر خزمەتگوزار بوو، زۆر بە باشی خزمەتی وەهبی بەگی دەکرد، هەروەها هی میوانەکانی، کە کەسانێکی زۆر سەردانیان دەکرد، بە کورد و عەرەبەوە.

ئاسیا خانم زۆر بەڕێزەوە باسی وەهبی بەگی دەکرد و دەیگوت قەرزاری ئەو پیاوەم، چونکە لە ساڵانی سییەکانی سەدەی ڕابوردووەوە تێکەڵ بە کاری خێرخوازی و داکۆکیکردن لە مافی ئافرەتان و منداڵان بووە. ماوەیێکی زۆر سەرۆکی (یەکێتی ئافرەتانی عێراق) و لقی ڕێکخراوی ئافرەتانی (مانگی سووری عێراقی) بووە. بەهۆی ئەو ئەرکانەی لەو ڕێکخراوانەدا، چەندین جار سەفەری دەرەوەی عێراقی کردووە، هەروەها شەوان درەنگ گەڕاوەتەوە، بەڵام هەرگیز پرسیاری لێ نەکردووە لە کوێ بووە، یا بۆ دواکەوتووە. کۆچکردنی ئەو خانمە

گەورەیــە کارەســات بــوو بــۆ وەهبی بەگ، لەو دەمەوە باری تەندروســتی بــەرەو خــراپتر چــووە، تــا کۆچــکردنی لــە زســــتانی ١٩٨٤. لـــــەپاش کۆچکردنی ئاسیا خانم لە ساڵی ١٩٨٠، فەرمانگـەی (سۆشـیاڵ) (نێرسـێك) دیـاری دەکـات بـۆ خزمـــەتی وەهبـــی بـــەگ تـــا مردنی.[٦]



مامۆستا تۆفیق وەهبی و ئاسیا خانم و د. عەتیەی خێزانم لەنێوانیاندایە، ئەم وێنەیە لە شوباتی ١٩٧٩ وەرگیراوە

وەهبی بەگ دوو کتێبخانەی گەورەی هەبوو، یـەکێکیان لـە ماڵـە گەورەکـەی، کە لە گەڕەکی (وەزیرییە) بوو لە بەغدا. بەشێك لە کتێبەکانی ناو ئەو کتێبخانـەی بە دیاری بە کتێبخانەی (کۆڕی زانیاری کورد)ی بەخشـیبوو. کتێبخانـەی دووەمـی لـە (لەنـدەن) بـوو، چـونکە تـەنیا داواکـاری تۆفیـق وەهبـی لـەو کەسـانەی کـە دەچوونەوە بەغدا و دەگەڕانەوە، هێنانی چەند کتێبێك بوو، کە خۆی بـۆی دیـاری دەکردن.

بەشێك لـە دۆسـتانی و کەسـانی دیکـەش، بـە کـورد و عەرەبـەوە سـەردانیان دەکرد، بۆ نموونە وەکو عەلی کەمال بەگ و شێخ بابا عەلی و تەحسین بەگی مـیری ئێزدیان و د. صەفا خەلوصی و مێژوونووسی عێراقی عەبـدولرەزاق حەسـەنی، کـە دەیگوت وریا بن زۆر راسـتگۆ نییـە لـە گێڕانـەوەی ڕووداوەکانـدا! تۆفیـق وەهبـی لەگەڵ (ئێدمۆندز) فەرهەنگێکیان بە هەردوو زمانی کـوردی و ئینگلیـزی لـە سـاڵی ١٩٦٥دا بـە چـاپ گەیانـدبوو، بـەڵام پـاش قسـەکانی ئێدمۆنـدز لـە سـاڵی ١٩٦٦ سەبارەت بە دواڕۆژی ناوچەی کەرکوك، گوایا ئەو حکومەتـەی لـە بەغدا دەست لەسەر کەرکوك هەڵبگرێت دەڕووخێت، ساردی لە نێوانیاندا پەیداکردبوو.

ڕۆژێك لە سەرەتای ساڵی ١٩٧٥ پرسیاری لێ کردم بۆ خەریکی ئامـادەکردنی فەرهـەنگێکی قـانوونی کـوردی نـابم؟ لـە وەرامـدا وتم، زماننـاس نـیم و زاراوەی

قانوونیی کوردی زۆر کەمن، وتی شارەزای هەر سێ زمانی عـەرەبی و فەڕەنسـی و ئینگلیزیمە و کوردییەکەشم باشە! لەوە دەچوو لەو ماوەدا چاودێری کوردییەکەی کردبم، بۆیە ئەو قسەی کرد! وتـی منـیش هاوکاریت دەکـەم. کـاتێ دەسـتم بـە ئامـادەکردنی ئـەو فەرهەنگـە قانوونییـە کـرد، پـاش نیمـەڕۆی ڕۆژانـی دووشـەم دەچوومە لای، زۆر جاران چەندین وشەی قانوونیم دەستنیشان دەکرد، تا پێکەوە لێیان بکۆڵینەوە. زۆر جاران پرسـیاری مانـا قانوونییەکـەی وشـەکەی لێ دەکـردم، منیش بـۆم ڕوون دەکـردەوە، دواتـر پێکـەوە بڕیارمـان لەسـەر بەرانبەرەکـەی بـە کوردی دەدا. (٧)چاپی یەکەمی ئەو فەرهەنگە، کە یەکەمین فەرهەنگی قانوونییە بە زمانی کـوردی، دەزگـای (ئـاراس) لـە هـەولێر لـە سـاڵی ٢٠٠٤ چـاپی کـرد، چـاپی پێنجەمی، پاش پوختەکردنی، لە ساڵی ٢٠١٠ هەردوو وەزارەتی داد و ڕۆشنبیری و لاوان چاپیان کردەوە و دابەش کرا بەسەر وەزارەت و دەزگاکانی حکومەتیدا.

لە سەرەتای مانگی ئـەیلوولی ١٩٧٥دا بڕیـاری گەڕانـەوەم بـۆ کوردسـتان دا و چوومە سەردانی بۆ دوعـاخوازی، زۆری پـێ نـاخۆش بـوو، چـونکە ڕاهـاتبووین بـە چاوپێکەوتنی یەکتر لەو مـاوە درێـژەدا. وتم مامۆسـتا خـەمت نـەبێ هـەوڵ دەدەم سـالآنە دوو جـار سـەردانتان بکەمـەوە، چـونکە د. عەتیـەی خێـزانم کـە زوو زوو سەردانی دەکردن، لە لەندەن دەمێنێتەوە بۆ تەواوکردنی خوێندنی.

لە کاتی نووسیندا هەستم دەکرد دەسـتی بـە ئاسـانی قەڵـەم ناگرێـت، بۆیـە پێشـنیازی هـاتنی کەسـێکم بـۆ کـرد، کـە کـۆڕی زانیـاری کـورد بینێـرێ بـۆ هاوکاریکردنی لە نووسـینەوەی بەرهەمـە زۆرەکـانی، بـە تایبـەتی ڕێزمـانی زمـانی کـوردی، کـە لـە چـەند بەرگێکدا ئامـادەی کردبـوو. هەمیشـە دەیگـوت دەمێکـە خەریکی ئامادەکردنی بووە و زۆر مەبەستی بوو ئەو بەرهەمـەی پـێش کۆچـکردنی چاپ بکرێت. پاش گەڕانەوەم بۆ وڵات، پەیوەنـدیم بـە بەرپرسـانی (کـۆڕ) کـرد بـە هۆی کـاک د. کـەمال مەزهـەرەوە، کـە لـەو دەمـە ئەمینـداری گشـتی (کـۆڕ) بـوو. هەموویان بە گەرمەوە پێشوازییان لەو پێشنیازە کـرد، منـیش بـە نامـە ئاگـاداری مامۆستام کردەوە، کە (کۆڕ) دەیەوێ یەکێك بنێرێ بۆ لەندەن بـۆ هاوکـاریکردنی. لە ٨ی تەممووزی ١٩٧٦ نامەیەکی بـە دەسـتی خـۆی بـۆ نـاردم، تێیـدا داوای کـاك محەمەدی مەلا کەریمی کردبوو. قسەم لەگەڵ مامۆستا محەمەدی مەلا کەریم کـرد،

ئـەویش زۆری پـێ خـۆش بـوو، ئامـادەیی خۆیشـی پیشـان دا بـۆ ئـەوەی بچـێتە (لەندەن)، ئەگەر (کۆڕ) کار ئاسانی بۆ بکات. وێنەی ئەو نامەی وەهبی بـەگ، کـە بە دەستخەتی خۆی بۆی نووسیوم، دامە کاك (هیوا حەمید شـەریف)، کـە نامـەی ماسـتەرنامەکەی بـە زمـانی عـەرەبی لـەژێر نـاوی: ( توفیـق وهـبي، حیاتـه ودوره السیاسي والثقافي) لە ١٨٩١ – ١٩٨٤ لە ساڵی ٢٠٠٦ بە چاپکردنی گەیاندووە. لـەو کتێبەدا لە لاپەرە ١٨٨ دەقی ئەو نامەیە بڵاوکراوەتەوە. [٨] بەرپرسـیارانی (کـۆڕ) لە بەغدا زیاتر لە ساڵێك خەریکی نووسراو بوون لەگـەڵ وەزارەتـی دارایـی عێراقـدا بۆ ئەوەی ڕێگا بە سەرفکردنی مووچە کەمەکەی کاکە حەمـە لـە (لەنـدەن) بـدات، بەڵام نەیکرد. لـەو بـاوەڕەدام ئەگـەر بـۆ مـاوەی سـاڵێك کاکـە حەمـە لـە لەنـدەن هاوکاری بکردبا بە نووسینەوەی بەشێك لـە بەرهەمـەکانی، خزمـەتێکی گـەورە بـە زمان و مێژوو و کولتووری کورد دەکرا.

پاش دامەزراندنی (کـۆڕی زانیـاری کـورد) لـە بەغـدا لـە سـاڵی ١٩٧٠، تۆفیـق وەهبـــی ڕەخنـــەی لـــە نـــاوی ئـــەو دەزگـــا زانســـتییە گرتـــووە و پێشـــنیازی دەستکاریکردنی کردووە. بە بۆچوونی ئەو، ئەو ناوە لە ڕووی زمانەوانییەوە ڕاست نییە، وشەی (کۆڕ) کە وەرگێڕانی وشەی (مجمع)ی عەرەبییە، لە کوردیدا بـەمانای (کۆبوونەوە) دێت، کورد دەڵێ: (کۆڕی زیکر). وشەی (زانیـاری) دەبـوو (زانسـتی) بێت، وشەی (کورد) ئەویش دەبوو (کوردی) بێـت. کـە واتـە هەرسـێ وشـەکان لـە جێگای خۆیدا نەهاتوون. لەو فەرهەنگە قانوونییە پێشنیازی ( ئەکادیمیای زانستی کوردی) کراوە لەجیاتی (کۆڕی زانیاری کورد). پـاش دامەزراندنـەوەی ئـەو دەزگـا زانسـتییە لـە هـەرێمی کوردسـتان و پەسـەندکردنی قـانوونێکی تایبـەت بـۆ ئـەو دەزگایە لەلایەن پەرلـەمانی هـەرێم لـە سـاڵی ١٩٩٧، وشـەی (ئـەکادیمیا) جێگـای (کــۆڕ)ی گرتــەوە. بەداخــەوە لــە ســاڵانی هــەفتاکانی ســەدەی ڕابــوردوودا بەرپرسیارانی (کۆڕ) لە بەغدا سوور بوون لەسەر مانەوەی ئەو ناوە، ئەوەش بـووە هۆی کێشە دروستبوون لـەنێو وەهبـی بـەگ و ئـەو دەزگـا زانسـتییە. جاروبـار بـە پێکەنینەوە دەیپرسی: " دەنگوباسـی (گـۆڕی) زانیـاری کـورد چـییە"؟ ماوەیـەك لەگەڵ د. کەمال مەزهەر کە ئەمینداری گشـتی کـۆڕی زانیـاری کـورد بـوو، هـەوڵی چارەسەرکردنی ئەو کێشەمان دا، بەڵام سەرکەوتوو نەبووین. ڕۆژێك د. کـەمال بـە

تەلەفۆن پرسیاری لێ کردم کەی دەگەڕێمەوە بۆ لەندەن؟ وتی کاك مەسعوود محەمەد دەیەوێ نامەیەك بۆ وەهبی بەگ بنێرێ و منیش بە دەستی خۆم پێی بیدەم. ئامادەیی خۆم پیشان دا بۆ گەیاندنی ئەو نامەیە، ئەو ڕۆژەی لە سلێمانییەوە بە ڕێکەوتم بەرەو بەغدا، د. کەمال هاتە فڕۆکەخانەی بەغدا و نامەکەی پێدام، کە دانەخرابوو. نامەکەی کاك مەسعوود سەرەتاکەی بەم جۆرە نووسرابوو: " بۆ خزمەتی مامی گەورەم .. دەستەکانت ماچ دەکەم، جێگای سەربەرزییە گەر لە نووسینە بە نرخەکانت بۆ گۆڤارەکەمان بێ بەشمان نەکەیت....". نامەکەم دایە دەستی تۆفیق وەهبی بەگ و سڵاو و ڕێزی کاك مەسعوود و کاك دکتۆر کەمالم پێ ڕاگەیاند. لەبەر ئەوەی نامەکە بەجوانی نووسرابوو، پێم خۆش بوو وێنەیەکی هەڵگرم، داوای ڕوخسەتم لێ کرد کە فۆتۆکۆپی بکەم، ئەویش ڕازی بوو. وێنەی ئەو نامەیە لەناو کتێبخانەکەمدا مابوو، بە داخەوە ئەویش لەگەڵ هەموو ئەو کتێب و دۆکیمەنتانەی تری ناو ئەو کتێبخانەیەمان لە هاوینی ١٩٩٦دا بەدەستی نەزانان سووتێندران، هەرچەندە نزیکەی چوار ساڵ بوو وڵاتمان جێهێشتبوو.

مامۆستا تۆفیق وەهبی زانای ئەکادیمی پتر لە (٣٢٧) کتێب و لێکۆڵینەوە و دیراساتی جۆراوجۆری بە چەند زمانێك لە گۆڤارە بەناوبانگەکانی جیهانی و کوردی و عێراقی بڵاوکردۆتەوە، کە بەشی زۆریان بە زمانی کوردی بوون. لە ساڵی ١٩٢٨ لە بەغدا کتێبی (دەستووری زمانی کوردی) بەچاپکردن گەیاندووە، لە ساڵی ١٩٥٦ لە بەیرووت بەشی یەکەمی کتێبی ڕێزمانی کوردی چاپ کردووە. چەندەها لێکۆڵینەوەی بە نرخی لەسەر ناوی شار و جێگا بەناوبانگەکانی کوردستان و عێراق بڵاو کردۆتەوە، لەوانە ناوی: کەرکووك، داقوق، شارەزوور، پردێ و بەغدا. چەندین دیراساتی لەسەر ئایینە کۆنەکان لە گۆڤارە جیهانی و عەرەبییەکان بڵاو کردۆتەوە. لە نووسینێکی بە زمانی ئینگلیزی، کە وەڵامدانەوەی نووسینێکی (مەکەنزی) بووە، کە تێیدا وتوویەتی زمانی کوردی بەشێکە لە زمانی فارسی، تۆفیق وەهبی بە بەڵگەی مێژوویی و زمانەوانییەوە سەلماندوویەتی کە کورد وەك نەتەوە نەوەی مادە – هیندۆ ئێرانییەکانن، زمانەکەشیان بەشێکە لە زمانە ئێرانییەکان، نەك لە زمانی فارسی. ئەم نووسینەی

لە ساڵی ١٩٧٤ کراوە بە عەرەبی و بڵاوکراوەتەوە. چەندین دەسنووسی ماوە جارێ چاپ نەکراون، لەوانە:

١- فەرهەنگێك بە زمانی کوردی - سانسکریتی - ئاڤێستایی - فارسی.

٢- فەرهەنگێکی کوردی - پارسی

٣- فەرهەنگێکی ئاڤێستایی

٤- فەرهەنگێکی تایبەت بە سەرچاوەکانی زمانی کوردی و ئاڤێستایی.

٥- کتێبێکی تایبەت بە ڕێزمانی کوردی، کە دەمێك بوو خەریکی ئامادەکردنی بوو، زۆریش مەبەستی بوو بەچاپکردن بگات.

مامۆستا تۆفیق وەهبی شارەزای چەند زمانێکی کۆن و تازە بوو، لانی کەم (هەشت) زمان. شارەزاییەکی زۆری هەبوو لە ئەدەبی کوردی و فارسی و تورکیی کۆن. سەبارەت بە ئەدەب و شیعری کلاسیکی کوردی، زۆر شارەزا بوو، بەشێکی زۆری شیعرەکانی شێخ ڕەزای لەبەر بوو، لەگەڵ موناسەبەتی گوتنیان. بەخۆشییەوە دەیگوت: موریدی شێخ ڕەزام، هەستم دەکرد خۆشترین کاتی تۆفیق وەهبی ئەو دەمە بوو کە قسە خۆشەکانی شێخ ڕەزای دەگێڕایەوە. هەر دەربارەی شێخ ڕەزا، جارێکیان گوتی لە ناوەڕاستی پەنجاکاندا کۆنە وەزیرێك کۆچی دوایی کردبوو، لە گۆڕستانی شێخ عەبدولقادری گەیلانی لە بەغدا بەخاکیان دەسپارد. لەکاتی بەجێگەیاندنی مەراسیمی ناشتن، دەکەوێتە تەماشاکردنی سەرکێلەکان بە مەبەستی دۆزینەوەی کێڵی سەر گۆڕی شێخ ڕەزای تاڵەبانی، کە لەوێدا لە ساڵی ١٩١٠بەخاك سپێردراوە. کاتێ دەیدۆزێتەوە، دەبینێ کێلەکانی بەسەریەکدا شکاون، زۆر ناڕەحەت دەبێ و دەگەڕێتەوە ناو خەڵکەکە. لەدوورەوە چاوی بە شێخ حەسەن تاڵەبانی، کوڕەزای شێخ ڕەزا دەکەوێ، دەچێتە لای و دەستی دەگرێ و دەیباتە سەر گۆڕی باپیری و ئەم بەیتە شیعرەی شێخ رەزای بەسەردا دەخوێنێ:

**تڕی ئەولادی ئەم عەسرە بە کێرم**
**کە من مردم مەگەر گوو بکەن بە خێرم!**

وەهبی بەگ وتی: قسەکانم بێ سوود نەبوون، چونکە پاش چەند هەفتەیەك شێخ حەسەن بە تەلەفۆن ئاگاداری دەکاتەوە، کە گۆڕی شێخ ڕەزای باپیری

هەڵبەستووەتەوە!

تۆفیــق وەهبــی تەماشــای شــێخ ڕەزای نــەدەکرد هــەر وەك شــاعیرێکی بــە جورئەتی قسەخۆش و زیرەك، بەڵکو دەیگوت شێخ ڕەزا دەریایەك بـوو دەبـێ بـە وردی لە شیعرەکانی بکۆڵینەوە. بۆ پشتگیری لە قسەکانی، چەند بەیتە شیعرێکی بە زمانی تورکی بۆ خوێندمەوە، کە لە دیوانەکەیدا نییە و تێیدا دەڵـێ: کـەرکوك پایتــەختی ویلایــەتی شــارەزوورە و ئــەو باجانــەی کۆکراونەتــەوە ڕەوانــەی ئــەوێ کراون. مامۆستا وتی: ئەو چەند بەیتە شیعرە وای لـێ کـردم ماوەیـەکی زۆر لـەناو کۆنە دۆسیەکانی وەزارەتی دارایی عێراقی بگەڕێم و تەماشای پسووڵە کۆنەکانیش بکەم، بەتایبـەتی لـەو ماوانـەی کـە کـەرکووك پایتـەختی شـارەزوور بـووە. پـاش ماندووبوونێکی زۆر، ئەو پسوولانە دەدۆزێتەوە کـە ئـەو ڕاسـتییە دەسـەلمێنن کـە شێخ ڕەزا لەو شیعرەی باسی کردووە. چـەندین ڕووداو سـەبارەت بـە جەسـارەتی کەم وێنەی شێخ ڕەزای دەزانی و دەیگـوت: بەشـی زۆری شـیعرەکانی بـۆ بـەزم و خۆشـی، لـە موناسـەبەتی کتـوپڕدا وتـوونی، بۆیـە نەنووسـراونەتەوە. ڕووداوێکـی گێڕایەوە سەبارەت بە دڵپـاکیی شـێخ ڕەزا و گـوتی: دڵـی بـە کینـە نـەبووە هـەتا بەرانبەر ئەو کەسانەی قسەی ناشرینیان پـێ وتـووە، بەتایبـەتی شـوکری فـەزلیی شاعیر، کە هەمیشە بە توندی هەجوی کردووە. گوتی: پاش گەڕانـەوەم بـۆ بەغـدا ماوەیـەك بـێ کـار بـووم، زوو زوو سـەردانی شـوکری فـەزلی شـاعیرم دەکـرد، کـە دراوسێمان بوو لە گەڕەکی "جەدید حەسەن پاشا" لە شاری بەغدا. چـەند جارێـك پرسیاری ئەو شیعرانەی لـێ دەکـات کـە تێیـدا هـەجوی شـێخ ڕەزای کـردووە، تـا کۆیـان بکاتــەوە، بــەڵام هــەرجارە بــە شـێوەیەك وەڵامــی دەداتــەوە و عــوزری بــۆ دەخوازێ. جارێکیـان پێـی دەڵـێ: "وادیـارە وەهبـی بـەگ وازم لێ نـاهێنی، بـەڵام ئەگەر بزانی بەهۆی شێخ ڕەزاوە ملم لە پەتی سێدارە ڕزگاری بووە، هەقی ئـەوەم دەدەیتـێ کـە ئـەو شـیعرانەت پـێ نـەدەم"! تۆفیـق وەهبـی کەوتـە گێڕانـەوەی ڕووداوەکە بەزمانی شوکری فەزلی و گوتی: لە سلێمانی لـە قەسـیدەیەکدا بـەزمانی تورکی هەجوێکی توندی "ئۆردووی" عوسمانی کردووە. پـاش بڵاوبوونـەوەی ئـەو پارچە شیعرەی، شوکری فەزلی لە سلێمانی دەگیرێ و ڕەوانەی بەغدا دەکرێـت بـە تۆمەتی سووکایەتیکردن بە "ئـۆردووی" عوسمـانی. دادگـای سـەربازی لـە بەغـدا

بڕیاری لە سێدارەدانی دەدا، بڕیارەکەش ڕەوانەی "بابی عالی" دەکرێت بۆ پەسەندکردنی. ئەو هەواڵە پاش ماوەیەك دەگاتەوە بە شێخ ڕەزا، کە وەکو دەزانین لە دوا ساڵەکانی ژیانی لە شاری بەغدا جێگیر بووە تا کۆچکردنی لە ساڵی ١٩١٠. ئێوارە وەختێك شێخ ڕەزا دەچێتە دیوەخانەی (والی)، کە لەوە دەچێ پیاوێکی ئەدەب دۆست بووە و بەشێك لە شیعرەکانی شێخ ڕەزای لەبەربووە. (والی) کە شێخ ڕەزا دەبینێ زۆر ڕێزی لێ دەگرێ و گلەیی لێ دەکات پێشتر سەردانی نەکردووە. پاش نوێژی شیوان میوانەکان هەموو دەڕۆن تەنیا شێخ ڕەزا دەمێنێتەوە، (والی) پێی دەڵێ: ئەم هاتنەت بێ هۆ نییە، ئەویش پێی دەڵێ: بۆ کارێك هاتووم و دیوەخانەکەت بەجێ ناهێڵم تا گفتی جێبەجێکردنیم نەدەیتێ. (والی) دەڵێ: کاری تۆ بەمن جێبەجێ بکرێ بەسەر چاوان. شێخ ڕەزا پێی دەڵێ: بۆ تکاکردن بۆ بەردانی شوکری فەزلی هاتووم. (والی) پێی دەڵێ: بەداخەوە ئەم کارە لەدەستی من نەماوە، بەڵام گفتت دەدەمێ هەرچیم پێ بکرێت لەبەر خاتری تۆ قسوور ناکەم. زۆری پێ ناچێ، بەهۆی تکا و هەوڵدانی (والی) لەلای "بابی عالی"، وەلاّم لەجیاتی لە سێدارەدانی شوکری فەزلی، بە لێخۆشبوونی دەگەڕێتەوە بۆ بەغدا. ئەوجا شوکری فەزلی ڕوو دەکاتە تۆفیق وەهبی و پێی دەڵێ: "لەگەڵ ئەو هەموو چاکەی شێخ ڕەزای "ئوستادم" لەگەڵی کردووم، دەتەوێ ئەو شیعرانەت پێ بدەم کە تێیدا هەجووم کردووە بە هاندانی چەند کەسێك". [9]
مامۆستا گوتی: پاشتریش چەند جارێکی تر داوای ئەو شیعرانەم لێ کرد، بەڵام بێ سوود بوو پێی نەدام. [10]

مامۆستا تۆفیق وەهبی شارەزایەکی گەورە بوو لە بواری ئارکیۆلۆجی و مێژووی ناوچەکە، چەندین نووسینی بە پێزی لەو بوارانەدا بڵاو کردۆتەوە لە گۆڤارە بەناوبانگەکانی جیهانی و عەرەبی. سەبارەت بە زمانی کوردی و ڕێزمانەکەی، جگە لە بەرهەمەکانی لە سەرەتای بیستەکانی سەدەی ڕابوردوودا، چەند ساڵێك بوو خەریکی ئامادەکردنی ڕێزمانی کوردی بوو بە شێوەیێکی فراوانتر، دەیگوت دەترسم ئەوەی چەند ساڵێکە پێوەی خەریکم نەگاتە دەستی ئەو کەسانەی سوودی لێ وەردەگرن.

هەموو دەزانین چاکترین فەرهەنگی زمانەوانی، کە تا ئەو دەمە بە هەردوو زمانی کوردی و ئینگلیزی بڵاوکرابێتەوە ئەو فەرهەنگە بوو کە مامۆستا تۆفیق وەهبی و (ئێدمۆنز) ئامادەیان کردبوو. لەچەند کەسێکم بیستووە کە ئەو فەرهەنگە تۆفیق وەهبی ئامادەی کردووە، ناوی (ئێدمۆنزی) لەسەر داناوە تا هاوکاری بکات بۆ چاپکردنی! پەیوەندی لەگەڵ (ئێدمۆنز) لە پاش ٢٥ ئۆکتۆبەری ١٩٦٦ تێکدەچێ، چونکە لەو ڕۆژەدا (ئێدمۆنز) لە Asian Royal Association کۆڕێك دەبەستێ تێیدا دەڵێ: "هەر حکومەتێکی عێراقی ڕێز لەخۆی بگرێ و بەتەنگ بوونی خۆیەوە بێ و سوودی خۆی لەبەر چاوبێ، پێویستە بەهیچ جۆرێك ڕێگەی ئەوە نەدا کەرکوك بە بەشێك لە کوردستان بژمێردرێ"! هەرچەندە ئەم بۆچوونەی (ئێدمۆنز) هی خۆی نەبووە، بەڵکو بەشێك بووە لە سیاسەتی حکومەتی بەریتانیا لەوەتەی دەوڵەتی عێراقی دامەزراندووە لە ساڵی ١٩٢١دا، بەڵام تۆفیق وەهبی پاش ئەو وتارەی لێی تووڕە دەبێ و نێوانیان تێکدەچێت.

پاش ئەوەی چەند جارێك مامۆستا داوای لێ کردم خەریکی کۆکردنەوەی وشەی قانوونیی کوردی بم، چونکە دەیزانی فەرهەنگێکی قانوونی بە زمانی کوردی نییە، منیش جگە لە زمانی عەرەبی، شارەزای هەردوو زمانی فەرەنسی و ئینگلیزیم. بەلای ئەوەوە، ئەو کەسەی خەریکی ئامادەکردنی فەرهەنگێکی قانوونیی کوردی بێ، دەبێ جگە لە شارەزابوونی لە بواری قانوونیدا، لە چەند زمانێکی زیندووی وەك فەڕەنسی و ئینگلیزی شارەزا بێ. قانوونی فەڕەنسی بەتایبەتی و قانوونی ئینگلیزی بە پلەی دووەم، سەرچاوەی بەشی هەرە زۆری قانوونەکانی وڵاتانی ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاستن. چاکترە وشەی قانوونی لەو دوو زمانەوە وەربگیرێن و بکرێنە کوردی نەك لە عەرەبییەوە، چونکە بەشی زۆری وشەی قانوونیی عەرەبی لە یەکێ لەو دوو زمانەوە وەرگیراون. پاش ئەوەی چەند جارێك بەم شێوەیە گفتوگۆمان لەسەر شێوەی ئامادەکردنی فەرهەنگێکی قانوونی کوردی کرد، مامۆستا ئامادەیی خۆی دەربڕی بۆ هاوکاریکردنم و دەستم بە کۆکردنەوەی وشەی قانوونی کرد. پاش کۆکردنەوەی کەرەستەیەکی چاك، جگە لە مامۆستا تۆفیق وەهبی، کۆمەڵە پرسیارێکم ئاڕاستەی چەند دۆستێکی زمانزانان و شارەزا لە زمانی کوردی کرد، کە ئاماژەم بۆ ناوەکانیان لە (پێشەکی)

فەرهەنگەکـە کـردووە. هـەوڵێکی زۆرم دا کەسـێك یـان دەزگایـەك بدۆزمـەوە بـۆ چاپکردنی ئـەو فەرهەنگـە قانوونییـە بـەو چـوار زمانـە، بـەڵام کەسـێکی شـارەزام نەدۆزییەوە، بۆیە ناچاربووم خۆم ئەو کارە قورسە ئـەنجام بـدەم، کـە ماوەیـەکی زۆری برد. لەساڵی ٢٠٠٤ دەزگای (ئاراس) لە هەولێر بە چاپکردنی گەیاند و بڵاوی کردەوە[١١].

لە خـولی دووەمـی پەرلـەمانی هـەرێمی کوردسـتان لـە سـاڵانی ٢٠٠٥ تـا ٢٠٠٩ ئەندامێکی بێ لایەنی ئەو پەرلەمانە بووم. لەو ماوەدا بـە بـەردەوامی داوام دەکـرد پرۆژە قانوونەکان بە زمانی کـوردی ئامـادەبکرێن و دابڕێـژرێن، نـەك بـە عـەرەبی. کێشەی گـەورەمان تـا ئێسـتا وەرگێڕانـە لـە زمـانی عەرەبییـەوە بـۆ سـەر زمـانی کوردی. زۆر جاران ئەو کەسانەی پرۆژەی قانوونەکان ئامادە دەکەن، بـە عـەرەبی بیردەکەنـەوە نـەك بـە کـوردی، ئەمـە کێشـەیێکی گەورەیـە تـا ئێسـتا بـیر لـە چارەسـەرکردنی نەکراوەتـەوە. پاسـاوی ئـەو کەسـانە کـە داوای ئامـادەکردنی پرۆژەی قانوون و دەستوور بە زمـانی عـەرەبی دەکـەن ئەوەیـە، وشـەی قـانوونی کوردی لەبەردەستا نییە و دەزگایەکی بەرپرس ئەو ئەرکەی لە ئەستۆ نـەگرتووە. کار بەم شێوەیە بمێنێتەوە، قانوونەکانی کوردستان بە شـێوەیەکی ڕاسـت و ڕەوا ئامـادە نـاکرێن، جاروبـاریش لەسـەر بـەکارهێنانی وشـەیەکی عـەرەبی مشـتومڕ دەکەن! ماددەی (سێ) لە دەستووری عێراقی دانی بە زمـانی کوردیـدا نـاوە وەك زمـانێکی فـەرمی، لـەپاڵ زمـانی عـەرەبی، ئـەم ماددەیـە تـا ئێسـتا بەباشـی لـە کوردستان کاری پێ نەکراوە، هۆیەکەش هەر خۆمانین.

سیفەتێکی تری مامۆستا تۆفیق وەهبیی زانسـتمەند ئـەوە بـوو، خـۆی باسـی هەڵەکانی خۆی دەکرد و دەیگوت: لـە فلانـە شـوێن هەڵـەم کـردووە دەبـێ چـاك بکرێتەوە. بۆ نموونە، کە گەیشتینە سەر باسی وشەی "قانوون"، داوای لێ کـردم ئەو وشەیە بەکاربێنم نەك وشەی "یاسا"، کە وشەیەکی مەگۆلی و تورکییـە، دانـی بەوەدا دەنا کە بەهۆی ئەوەوە کەوتۆتە ناو زمانی کوردی. بـەلای ئـەوەوە وشـەی "قـانوون" ڕاسـتترە، چـونکە دەمێکـە بـەو مانایـە بـەکارهاتووە، لـە وشـەی "کانۆنیمۆس"ی یۆنانییەوە وەرگیراوە. وشـەی "یاسـا" بـەمانای ڕێگاپێدان دێ، پێچەوانەکەشی "یاساغە"، بەمانای قەدەغە یـان ڕێگـا پێنـەدراو دێـت. پرسـیاری

بەکارهێنانی وشەی "یاسا"م لە زمانی کوردی لە مامۆستا ئەحمەد هەردی کرد، وەڵامی ئەوە بوو، تۆفیق وەهبی ئەم وشەی خستۆتە ناو زمانی کوردییەوە، ئێمەش لەومان وەرگرتووە و بەکارمان هێناوە. لێرەدا بە ئەرکی سەرشانمی دەزانم ئەوەی لە مامۆستا تۆفیق وەهبیم بیستووە بە ئەمانەتەوە بیخەمە بەرچاو. بەلای بەشێك لە قانووناسانەوە بەکارهێنانی وشەی "یاسا" هەتا بە هەڵەش بێ، دەبێ دەستکاری نەکرێت، چونکە خەریکە بچەسپێ! سووربوون لەسەر بەکارهێنانی وشەیەکی هەڵە، کە داهێنەرەکەی داوای ڕاستکردنەوەی دەکات هەڵویستێکی سەیرە. پاساو بۆ بەکارهێنانی ئەو وشەیە بە هەڵەش بێت، وەك ئەوە وایە پاساو بۆ "زێدەڕۆیی – تەجاوز" لەسەر زەویوزاری میری و خەڵکانی تر، کە تا ئێستا چاوپۆشی لێ کراوە و دەکرێت، لەبەرئەوەی چارەسەرکردنی کارێکی ئاسان نییە، هەتا ئەگەر بە پێچەوانەی قانوونیش بێ! چەند زمانزان و قانووناسێکی ناسراو کە پێشتر وشەی"یاسا"یان بەکاردەهێنا، ئێستا وشەی قانوون بەکار دێنن، ئەوەش ئەوە دەسەلمێنێ کە وشەی "قانوون" ڕاسترە. وابزانم کاتی ئەوە هاتووە چ لە سیاسەتدا بێ یا لەبواری تردا، هەڵەکانمان خۆمان چاکیان بکەینەوە و پاساو بۆ هەڵەکانمان نەهێنینەوە.

تۆفیق وەهبی بەگی قسەخۆش و ڕووخۆش، کە حەزی لە نوکتە و گاڵتە دەکرد، جارێکیان بەخێزانەوە چووبووینە سەردانیان، ئەو دەمە (کۆسار)ی کوڕم تازە کەوتبووە سەرپێ و زۆریش بزێو بوو. لە ژووری دانیشتنەکەیان، کە زۆر بچووك بوو، دەستی بۆ شتی سەر مێزەکەی بەردەم مامۆستا دەبرد، ئەویش بەبزەیێکی سەرلێوەوە تەماشای دەکرد، لە ناکاوا گوتی: "هەمەوەنە هەمەوەن!" لە قسە خۆشەکانی دیکەی، گوتی: لە گەڕەکی "جەدید حەسەن پاشا"بووین لە بەغدا، هاوین بوو زۆر گەرم بوو، کاتێ دەگەڕامەوە بۆ ماڵ، لەپاڵ سێبەری دیوارێك کابرایەکی کوردی فەیلی بۆ کەسابەت دانیشتبوو، پرسیاری لێ دەکات ڕۆژانە چەند پەیدا دەکات، دەڵێ: نزیکەی "ڕوپیەك"، پێی دەڵێ: ڕۆژانە ئەو (ڕوپیەت) پێ دەدەم، هیچ مەکە تەنیا پێکەوە قسە دەکەین! کابرا ڕازی دەبێ و پێکەوە دەچنەوە ماڵەوە و دەس بەقسەکردن دەکەن. مەبەستی مامۆستا لە گفتوگۆکردن لەگەڵی ئەوە بووە لە شێوەی قسەکردنی بە لوڕی تێبگا، پاش ماوەیەك کابرا مێشکی ماندوو دەبێ، مامۆستا گوتی کتوپڕ هەستایە سەرپێ و

گوتی: ئەوە ڕوپیەکەت و خواحافیز، ڕێگای دەرەوەی گرت، گوتی: جارێکی تر چاوم پێی نەکەوتەوە! مامۆستا دەیگوت: بیرکردنەوە لە کاری لەشیی گەلێک قورسترە، بۆیە بەجێی هێشتم!

سەرباری تەمەنی تۆفیق وەهبی بەگ، بیر و هۆشی زۆر تیژ بوو، شتی زۆر وردی لەبیر مابوو. جارێکیان چووینە سەردانیان و (نسار)ی کچم تەمەنی دوو مانگ بوو. بە هەردوو دەستی هەڵی گرت و پاش تۆزێك بە دەم جوولأنەوەدا کەوتە وتنی ئەم چەند بەیتە وەك لای لایەی بۆ بکات:

**هەرچی کچێ لە بیتوێنێ**
**هەی هەی لە پووشینی سەری**
**چەند ناسك و چەند دوڵبەری، هاوارە و لانکێ**
**هەرچی کچی سلێمانییە**
**ماچیان نەکەی عاریان نییە، هاوارە و لانکێ**
**هەرچی کچی هەورامییە**
**بۆ تەنگانە عەیبیان نییە، هاوارە و لانکێ**
**هەرچی کچی کۆییە**
**پیشەی ناز و چاوبازییە، هاوارە و لانکێ**
**هەرچی کچی سابلاغییە**
**بارێزەی کەڵی شاخییە**
**ئەمڕۆ لە کوڕە لاو یاخییە، هاوارە و لانکێ !**

گوتی منداڵ بووە کە دایەنەکەی ئەو لای لایەی بۆ وتووە، بەڵام بینیم لەگەڵ وتنی ئەو بەیتانە دەجوولأیەوە، دەنا نەدەکەوتنەوە بیری!

ئومێدەوارم لە هەموو شار و شارۆچکەکانی کوردستان چاومان بە شەقامێك یان جێگایەکی گشتی بکەوێ بەناوی (تۆفیق وەهبی) بەگەوە. داواش لە زانکۆکانی کوردستان دەکەم هۆڵێك یان بەشێك لە کتێبخانەکانیان بەناوی (تۆفیق وەهبی)یەوە ناوبنێن.

هەتا ماوم یادی ئەو زانا گەورەیەی کورد لەبیر ناکەم و خۆم بە قەرزاری دەزانم.

هەزاران سڵاو لە گیانی پاکی مامۆستای گەورەمان تۆفیق وەهبیی هەمیشە زیندوو.

## پەراوێزەکان:

١ – حەمە رەسول هاوار، شێخ مەحمودی قارەمان و دەوڵەتەکەی خوارووی کوردستان، بەرگی دووهەم، لەندەن ١٩٩١، لاپەڕە ٣٥٨ و ٣٥٩.

٢ – هۆی کوشتنی عارف سائیب، تۆفیق وەهبی بەشێوەیێکی تر دەیگێڕایەوە کە جیاوازە لەوەی مامۆستا شێخ محەمەدی خاڵ لە نووسینێکی لە گۆڤاری (کاروان) لە ناوەڕاستی هەشتاکاندا بڵاوی کردووەتەوە. ئەوەی لە وەهبی بەگم بیستووە سەبارەت بە کوشتنی جەمال عیرفان ئەوەیە، کەسانێك بە بەردەوامی لەلای شێخ مەحمود بە خراپە باسیان کردووە، رۆژێك ئەوەندە هانی دەدەن، ئەویش لە حاڵەتی تووڕەییدا دەڵێ: "سەگبابێك نەبوو بیکوژێ"! پاش ماوەیەك یەکێك لە پیاوەکانی، کە گوێی لەو قسەیە بووە دەچێتە پێشەوە و دەڵێ قوربان کوشتم! پرسیاری لێ دەکات، کێی کوشتووە، دەڵێ ئەی جەنابت نەتفەرموو کەسێك نەبوو ئەو کابرایە بکوژێت؟ شێخیش زۆر تووڕە دەبێ. ئەو پیاوە رووناکبیرە زۆر دۆستی وەهبی بەگ بووە، زۆر جاران قسە خۆشەکانی دەگێڕایەوە.

٣ – هاوار، هەمان سەرچاوە، لاپەرە ٣٦٠.

٤ – ئەو چوار ئەفسەرەی کە بەشدارییان لە دامەزراندنی کۆماری کوردستان لە مهاباد کردبوو، شەهیدان عیزەت عەبدولعەزیز و خەیروڵڵا عەبدولکەریم و موستەفا خۆشناو و محەمەد قودسی لە پاش گەڕانەوەیان بۆ عێراق دەدرێنە دادگای سەربازی و بڕیاری لە سێدارەدانیان دەدرێ. حکومەتی ساڵح جەبر پاش ماوەیێکی کەم ئەو بڕیارەی دادگا جێبەجێ دەکات. خوالێ خۆشبوو جەلال بەگی حامید بەگی جاف لە لەندەن لە ساڵی ١٩٩٧ بۆی گێڕامەوە، وتی حامید بەگی جافی باوکی لەگەڵ چەند پەرلەمانتارێکی کوردی تر هەوڵی زۆریان لەگەڵ ساڵح جەبر دابوو تا بڕیاری لەسێدارەدان بکات بە بەندیی هەمیشەیی، بەلام ساڵح جەبر سوور بووە لەسەر جێبەجێکردنی ئەو بڕیارەی دادگای سەربازی.

٥ – ئەدرێسی ماڵەکەیان ئەمە بوو: S. W. و7 Ferry Road, Barnes, London

٦ – خوێندکارێکی زانکۆی بەسرە بە ناوی ( نەعیمە لەتیف)، کە خەریکی ئامادەکردنی ماستەرنامەیە لەسەر (ئاسیا تۆفیق وەهبی) چەند جارێك بە تەلەفۆن پێوەندی پێوەکردووم بۆ وەرگرتنی زانیاری لەسەر ژیان و چالاکییەکانی ئەو ژنە گەورەیە، لە مانگی ٣٠/٣/ ٢٠١٣ سەردانی کردم بۆ هەمان ئەو مەبەستە.

٧– تەماشای (پێشەکی) فەرهەنگی قانوونی بە زمانی عەرەبی _ کوردی _فەرەنسی _ ئینگلیزی بکە، چاپی پێنجەم، کە وەزارەتی داد و وەزارەتی رۆشنبیری و لاوان چاپیان کردووە، چاپخانەی (رۆژهەلات)، هەولێر ٢٠١٠، ل٩.

٨ – هیوا حمید شریف: توفیق وهبي، حیاتە ودوره السیاسي والثقافي، (بنکە ی ذین)، السلیمانیة، ٢٠٠٦، ص١٨٨.

٩ – شێخ رەزا لە بەیتە شیعرێکی ئاماژەی بۆ کردوون، کە وتوویەتی:

من دەزانم کێ لە خشتەی بردوویی ئەمما چە سوود؟

(سەییدە) و (سەیید) قسەی سووکی دەبێ دەرهەق نەکەم!

١٠– نووسینێکم دەربارەی شێخ رەزای تاڵەبانی کە لە گۆڤاری (کاروان) بڵاوکراوەتەوە، ژمارەی (٧٠) ساڵی ١٩٨٨، لاپەڕە ٢٤، هەروا ئەو نامیلکەی لەژێر ناوی: ( شێخانی ئیرشادی تاڵەبانی و چەند ناودارێکی تری ئەم بنەماڵەیە)، کە لە ساڵی ٢٠٠٢ بڵاوم کردووەتەوە، چاپی دووەم ساڵی ٢٠٠٣، هەولێر، لاپەڕە ٦٤.

١١– تا کۆتایی ساڵی ٢٠١٠، ئەو فەرهەنگە قانوونییە پێنج جار چاپ کراوەتەوە.

# کرۆنۆلۆجیای ڕاپەڕینی شێخ سەعید ی پیران (١٩٢٥)

ئامادەکردنی : پرۆفیسۆر جەبار قادر

- ١١ کانونی دووەمی (١٩١٨) کازم قەرەبەکر، جێگری سەرکردەی سوپا، بیر و بۆچوونەکانی خۆی لەبارەی دۆزی کوردەوە پێشکەش بەکاربەدەستانی بالاّ کرد.
- ٤ دیسێمبەری (١٩١٨) کۆمەڵەی پارێزگاری لە مافەکانی ویلایەتەکانی ڕۆژهەلاّت دامەزرا. دامەزرێنەرانی: سلێمان نافیزی شاعیر، مەحمود نەدیم بەکار، والی پێشووی بەیرووت حەققی بەگ، نوێنەری بایەزید لە مەجلیسی مەبعووسان، شەفیق بەگ و نوێنەرانی دیاربەکر لە مەجلیسی مەبعووسان فەوزی بەگ و لوتفی بەگ بوون، (Vilayet-I Şarkiye müdafaa-I Hukuk Cemiyeti) (ویلایەتی شرقیە مودافعەی حقوق جمعیتی)
- ٤ ئابی (١٩١٩) د. شوکری بابان و یەکێ لە بەڕێوەبەرە کۆنەکانی پۆلیس خەلیل بەگ چاویان کەوت بە کۆمسیۆنی لێکۆڵینەوەی ئەمریکی لە ئەنادۆڵ و داوای سەربەخۆیی کوردستانیان کرد.
- ١٢ کانونی دووەمی (١٩٢٠) کۆبوونەوەی ئەنجومەنی نوێنەران (مەجلیسی مەبعووسان)ی نوێی عوسمانی لە ئەستەمۆڵ (موستەفا کەمال هەرچەندە بەئەندام هەڵبژێردرابوو، بەلاّم بەشداری لە کۆبوونەوەکەدا نەکرد).
- ٢٨ کانونی دووەمی (١٩٢٠) ئەنجومەنی نوێنەران لە ئەستەمۆڵ میساقی میللی (Misak-i Milli ) قەبووڵ کرد. لە بڕیاردان لە سەر ئەم پەیماننامەیە فشار و کاریگەریی موستەفا کەمال گەورە بوو. بۆ ئەم مەبەستە گرووپی بەرژەوەندی

وڵات لە مەجلیس پێکهێنرابوو و لە ژێر ناوی (فەلاحی وەتـەن Felah-i Vatan) کاری دەکرد.

- ١١ نیسـانی (١٩٢٠) ئەنجومـەنی نوێنـەرانی عوسمـانی لەلایـەن حکومـەتی سـوڵتانەوە بـڵاوەی پێکـرا و، نوێنـەران بـەرەو ئـەنادۆڵ هـەڵهاتن. لێـرەوە لایـەنگرانی موسـتەفا کـەمال، کـە بـە (قـوای میللیـە تەشـکیلاتی) نێـودەبران شەرعیەتیان وەرگرت.
- ٢٣ نیسـانی (١٩٢٠) ئەنجومـەنی مـەزنی میللیـی تورکیـا TBMM لـە ئەنقـەرە ڕاگەیاندرا و ئەمە بووە هەنگاوی یەکەم بۆ دامەزراندنی حکومـەتی ئەنقـەرە بـە ڕابەرایـەتی موسـتەفا کـەمال. لـەو ڕۆژەوە ئـەو ئەنجومەنـە دەسـتی کـرد بـە دەرکردنی قانون و بڕیار.
- ٢٩ نیسان (١٩٢٠) ئەنجومەنی مەزنی میللیی تورکیا قانونی خیانەتی نیشتمانی دەرکرد.
- ١٨ تەمموزی (١٩٢٠) ئە.م.م.ت TBMMش دەنگی لەسەر میساقی میللـی دا. ئەمە بووە مانیفیستۆی جەنگی ڕزگاری تورکیا. ئەم میساقە لـە شـەش مـاددە پێکدەهات.
- ١٠ ئـابی (١٩٢٠) پەیماننامـەی سـێڤر، کـە حکومـەتی سـوڵتان لـە ئەسـتەمۆڵ قەبووڵی کرد، لە پاریس مۆرکرا.
- ١١ ئەیلوولی (١٩٢٠) ئەنجومەنی مەزنی میللیی تورکیـا هـەردوو قـانونی دادگـای سەربەخۆیی و قانونی سەربازانی هەڵاتوو لـە سـوپا و بـەرەی شـەڕی ڕزگـاری، دەرکرد.
- ٢٠ کانونی دووەمی (١٩٢١) قانونی ژمارە (٨٥)ی تەشـکیلاتی ئەساسـیەی، کـە بە یەکەمین دەستوری کەمالی دادەنرێ دەرکرا. ئەم قانونە دەستورییە لە (٩) ماددە پێکدەهات و دەسەڵاتی بەبێ مەرج و سنوور دەدا بە گەل .
- ٢١ ئۆکتۆبـەری (١٩٢١) ئەنقـەرە و فەرەنسـا ڕێککەوتننامـەیان مـۆرکرد بـۆ کۆتاییهێنان بە کێشەکانی نێوانیان، بەریتانیا لە دژی ئەم ڕێککەوتننامەیە بـوو و هەڵوێستی نواند.

–٢١ ئۆکتۆبەری (١٩٢١) کۆمەڵەی سەربەخۆیی کوردستان (Kürdistan Istiklal Cemiyeti)، بەیاننامەیەکی بڵاوکردەوە و بانگی کوردانی کرد بۆ سەربەخۆیی. بەیاننامەکە لە ئەستەمۆڵ و ویلایەتەکانی کوردستان بڵاو کرایەوە.

– ٢٦ حوزەیرانی (١٩٢٢) ئێران بەڕەسمی دانی نا بەحکومەتی ئەنقەرەدا.

– ٣٠ ئۆکتۆبەر–١ نۆڤەمبەر (١٩٢٢) ئەنجومەنی مەزنی میللیی تورکیا هەردوو بڕیاری ژمارە (٣٠٧) و (٣٠٨) ی دەرکرد لە بارەی هەڵوەشاندنەوەی سەڵتەنەت و دانانی دەوڵەتی تورکیا لە شوێنی.

– ١٨ نۆڤەمبەری (١٩٢٢) ئەنجومەنی مەزنی میللیی تورکیا عەبدولمەجیدی تەنها بە خەلیفە ڕاگەیاند.

– ٢٥ کانونی دووەمی (١٩٢٣) تورکیا داوای کرد لە کۆمەڵەی گەلان ببێتە ئەندام.

– ٢٦ کانونی دووەمی (١٩٢٣) موستەفا کەمال لە وتارێکدا کە لە (١٧) ی ئەو مانگەدا لە ئیزمیت پێشکەشی کردبوو، لە وەڵامی پرسیارێکدا سەبارەت بە مافەکانی کورد قسەی کردبوو (دەقی ئەو باسە لە یادداشتەکانی: ئەحمەد ئەمین یالمان، بەسەرهات و بیرەوەرییەکانم لە مێژووی نزیکماندا) بڵاو کراوەتەوە.

– ٦ مارتی (١٩٢٣) گفتوگۆ لەبارەی کێشەی مووسڵەوە لە ئەنجومەنی مەزنی میللیی تورکیا کرا.

– ١٣ ئۆکتۆبەری (١٩٢٣) ئەنقەرە کرا بە پایتەختی دەوڵەتی نوێی تورکیا.

– ٢٩ ئۆکتۆبەری (١٩٢٣) کۆماری تورکیا ڕاگەیاندرا، موستەفا کەمال بەسەرۆک کۆمار هەڵبژێردرا و عیسمەت ئینەنوش بەسەرۆک وەزیرانی یەکەمین ئەنجومەنی وەزیرانی کۆماری تورکیا.

– ٨ دیسەمبەری (١٩٢٣) بەپێی قانونی ژمارە (٢٤٩) کە لە (٣١) کانونی دووەمی (١٩٢٢) دەرکرابوو، ئەندامانی دادگای سەربەخۆیی ئەستەمۆڵ ئاشکرا کران .

– ٧ کانونی دووەمی (١٩٢٤) بە تۆمەتی دوژمنایەتیکردنی بزووتنەوەی ڕزگاریخوازی نیشتمانی، حکومەتی کەمالی (١٥٠) کەسی لە وڵات وەدەرنا. لە ٢٨ حوزەیرانی ١٩٣٨بڕیاری لێخۆشبوون بۆ ئەو کەسانە دەرکرا.

- ١٥ شوباتی (١٩٢٤) لەکاتی کۆبوونەوە کاربەدەستە سەربازییەکانی کۆماری تورکیا لە ئەزمیر، بڕیاردرا زنجیرەیەك چاکسازی بکرێن و هەندێ قانونیش دەربکرێن، لەوانەش قانونێك لەبارەی دامەزراوەی خیلافەتەوە.
- ٣ مارتی (١٩٢٤) قانونی ژمارە (٤٢٩) تایبەت بە هەڵوەشاندنەوەی وەزارەتی ئەوقاف و دامەزراوەکانی شەریعەت و ئەرکانی گشتی جەنگ.
- ٣ مارتی (١٩٢٤) قانونی ژمارە (٤٣٠) سەبارەت بە یەکسیستەمی خوێندن و فێرکردن لە کۆماری تورکیا دەرکرا.
- ٣ مارتی (١٩٢٤) بەپێی قانونی ژمارە (٤٣١) خیلافەت هەڵوەشێندرایەوە و ئەندامانی بنەماڵە و دەست و دایەرەی خەلیفە و سەڵتەنەت لە وڵات وەدەرنران.
- ٨ مارتی (١٩٢٤) دادگا شەرعییەکان هەڵوەشێندرانەوە.
- ١٦ نیسانی (١٩٢٤) قانونی (٤٨٨) لە بارەی بە گۆڕینەوەی هاوڵاتیان و سامانەکانیان دەرکرا. ئەم قانونە مەترسی گەورەی لەلای کورد بە گشتی و خاوەن زەویوزار و ئاغاکانی کوردستان بە تایبەتی پەیدا کرد و بووە هۆی گۆڕانکاریی گەورە لە دیمۆگرافیای ناوچەکە، چونکە ئەو تورکانەی لە وڵاتانی بەڵقانەوە دەهێنران لە کوردستان نیشتەجێ کران.
- ٢٠ نیسانی (١٩٢٤) دەستوری کۆماری تورکیا دەنگی لەسەردرا. قانونەکە ژمارەی (٤٩١)ی هەڵدەگرت و لە (٢٤ نیسانی ١٩٢٤) کەوتە واری جێبەجێکردنەوە. هەرچەندە ئەمە یەکەمین دەستوری کۆمار بوو، بەڵام بە لای نووسەرانەوە بە دووەم قانونی ئەساسی دادەنرێ، لە دوای قانونی دەستوری یا قانونی تەشکیلاتی ئەساسییەی ساڵی (١٩٢١).
- ٣٠ نیسانی (١٩٢٤) کازم قەرەبەکر لە کۆشکی چانقایە موستەفا کەمالی لە ئەگەری سەرهەڵدانی کورد ئاگادار کردەوە و نیگەرانیی خۆی لەو بارەوە پێی ڕاگەیاند.
- ١٩ مایسی (١٩٢٤) لە ئەستەموڵ کۆنفراس لە بارەی مووسڵەوە دەستی پێکرد.

- ١٨ حوزەیران (١٩٢٤) کازم قەرەبەکر پەجەب پیکیری وەزیری ناوخۆی لە ئەگەری سەرهەڵدانی کورد ئاگادار کردەوە و مەترسی و دڵەڕاوکێی خۆی پێ ڕاگەیاند.
- ٧ ئابی (١٩٢٤) والی هەکاری کەوتە بۆسەیەکەوە لە نزیك هانگەدیگی Hangediği، کە گوندێکی سەر بە چاڵدێرانە، لە ویلایەتی وان.
- ١٤ ئابی (١٩٢٤) بۆ ڕووبەڕووبوونەوەی سەرهەڵدانی نەستوورییەکان، ئەنجومەنی وەزیرانی تورکیا کۆبووەوە و بڕیاری تایبەتی لەوبارەوە وەرگرت.
- ٤ ئەیلولی (١٩٢٤) ئەفسەرانی کورد ئیحسان نوری، خورشید، راسیم، ڕەزا و تەوفیق و (٢٧٥) کەسی تر لەو هێزە سەربازییەی، کە دەبوایە نەستوورییەکان سەرکوت بکات، ڕایانکرد بۆ ئێران و بە دەستێکەڵکردن لەگەڵ دوژمنانی نشتیماندا تاوانبار کران.
- ١١ ئەیلولی (١٩٢٤) وەزارەتی ناوخۆ لە نامەیەکدا بۆ والی ئەستەموڵ، داوای کرد چاودێری کەسایەتییە کوردەکان بکرێت لەو شارە و لە ئەگەری ڕاپەڕینی کورد ئاگادار کرایەوە.
- ١٢ ئەیلولی (١٩٢٤) سەرهەڵدانی نەستوورییەکان دەستی پێکرد.
- ١٢ ئەیلویلی (١٩٢٤) لە پالۆ کۆبوونەوەیەکی کوردی سازکرا. بە وتەی سەرچاوە ئاگادارەکانی تورك شێخ سەعیدی پیران و سەعدییە کوێر (کوێر سەعدی) لە پشتی ڕێکخستنی ئەم کۆبوونەوەیە بوون.
- ٢٨ ئەیلولی (١٩٢٤) سەرهەڵدانی نەستوورییەکان سەرکوت کرا.
- ٣٠ ئەیلویلی (١٩٢٤) کۆمەڵەی گەلان لە نوێنەرانی هەنگاریا، بەلجیکا و سوید کۆمسیۆنێکی تایبەت بە کێشەی مووسڵی دامەزراند.
- ٧ ئۆکتۆبەری (١٩٢٤) سەردانی موستەفا کەمال بۆ دەڤەری حەسەن قەلاّ یا پارسین (بە تورکی پاسینلەر) لە ویلایەتی ئەرزەڕۆم، کە بوومەلەرزە لێیدابوو. دوای گفتوگۆکردنی لەگەڵ بەرپرسانی سەربازی ناوچەکە لەبارەی بزووتنەوەی کوردییەوە، ڕێنمایی و فەرمانی وەرگرتنی هەموو ڕێکارێکی پێدان بۆ سەرکوتکردنی هەر سەرهەڵدانێکی کوردی کە بەرپا دەبێت .

- ٨ ئۆکتۆبەری (١٩٢٤) قسەوباسەکان لەبارەی سەرهەڵدانی کوردەوە لە بەهاری داهاتوو بە ڕاپۆرتێك لە لایەن بەڕێوەبەری پۆلیسی ئەستەموڵەوە پێشکەش بە والی ئەو شارە دەکرێت.
- ١٠ ئۆکتۆبەری (١٩٢٤) خالید جبرالی و یوسف زیا لە ئەرزەڕۆم دەگیرێن و ڕەوانەی بدلیس دەکرێن.
- ١٤ ئۆکتۆبەری (١٩٢٤) بەڕێوەبەری پۆلیسی ئەستەموڵ بۆ دووەمین جار ڕاپۆرتی هۆشداری سەبارەت بە ڕاپەڕینی کوردان لە داهاتوویەکی نزیکدا پێشکەش بە والی ئەو شارە دەکات.
- ٢٦ ئۆکتۆبەری (١٩٢٤) کازم قەرەبەکر لە پۆستی پشکێنەری سوپای یەکەم دەس دەکێشێتەوە، هەر لەو کاتەدا جەواد شاکر چۆبانلی وەکو سەرکردەی سوپای دووەم چووبووە دیاربەکر و سەرهەڵدانی نەستوورییەکانی سەرکوت کردبوو.
- ٢٦ ئۆکتۆبەری (١٩٢٤) زەکی دیندار ئەلپ، مامۆستای یەکەمی چەپاقچور لە بینگیۆل، ڕاپۆرتێکی دابوو بەناوەندی گەنج، لەبارەی ئەوەوە کە کوردەکان خەریکی خۆئامادەکردنن بۆ ڕاپەڕین و مەترسییەکانی خۆی خستبووە ڕوو، لە دەسپێکدا بە تۆمەتی بوختان هەڵبەستن درا بە دادگا و سێ مانگ خرایە زیندانەوە، دوای ئازادکردنی لەلایەن کەسانی نادیارەوە لەسەر شەقام کوژرا.
- ٣٠ ئۆکتۆبەری (١٩٢٤) پشکێنەری سوپای دووەم عەلی فوئاد جەبەسۆی لە پۆستەکەی دەستی کێشایەوە.
- نۆڤەمبەری (١٩٢٤) موستەفا کەمال لە چالاکییە ( زیانبەخشەکانی) خالید جبرانلی و شێخ سەعیدی پیران ئاگادار کرایەوە.
- ١٠ نۆڤەمبەری (١٩٢٤) ناوی فرقەی گەل گۆڕدرا بۆ پارتی کۆماریی گەل.
- ١٣ نۆڤەمبەری (١٩٢٤) کۆمسیۆنی مووسڵی سەر بە کۆمەڵەی گەلان یەکەمین کۆبوونەوەی خۆی لە لەندەن سازکرد.
- ١٧ نۆڤەمبەری (١٩٢٤) پارتی پێشکەوتنخوازی کۆماری Terakkiperver Cumhuriyet firkasi) (تەرەقیپەروەر جمهوریت فرقەسی) دامەزرا.
- ٢٧ نۆڤەمبەری (١٩٢٤) کازم قەرەبەکر لە پارتی کۆماری گەل جیابووەوە.

- ٨ دیسەمبەری (١٩٢٤) کازم قەرەبەکر بەسەرۆکی گشتی پارتی پێشکەوتنخوازی کۆماری و جەنەراڵ عەلی فوئاد جەبەسۆییش بە سکرتێری گشتی پارتەکە هەڵبژێردران.
- ١٧ دیسەمبەری (١٩٢٤) جەنەراڵ کازم ئینانچ لە جێگەی جەواد شاکیر کرا بەپشکێنەری سوپای سێیەم.
- ٢٢ دیسەمبەری (١٩٢٤) لە دادگای ئەرزەرۆم بڕیار درا ئیفادەی شێخ سەعید وەربگیرێت، یا بۆ شایەتی بانگ بکرێت بۆ دادگا.
- ٣٠ دیسەمبەری (١٩٢٤) شێخ سەعید خنسی بەجێهێشت.
- ١٦ کانونی دووەمی (١٩٢٥) کۆمسیۆنی مووسڵ دووەمین کۆبوونەوەی خۆی کرد. بە پێی ڕاسپاردەکانی کۆمسیۆنەکە دەبوایە مەندەیتی بەریتانیا، کە لە ساڵی (١٩٢٨) تەواو دەبوو، بۆ (٢٥) ساڵ درێژ بکرابایەتەوە و سەربەخۆییەکی خۆجێیش بدرابایە بەکوردان لە ویلایەتی مووسڵ.
- ٥ شوباتی (١٩٢٥) جەنەراڵ کازم ئینانچ وەکو پشکێنەری سوپای سێیەم دەستبەکار بوو.
- ٨ شوباتی (١٩٢٥) شێخ سەعید گەیشتە پیران و هێرش کرایە سەر بنکەی ژاندارمی ئەو شارۆچکەیە.
- ١١ شوباتی (١٩٢٥) ڕاپەڕینی کوردان بە سەرۆکایەتی شێخ سەعیدی پیران دەستی پێکرد.
- ١٣ شوباتی (١٩٢٥) گرتنی پیران لەلایەن سەرهەڵداوانەوە، هێرشیش کرایە سەر پۆستەی لیجە و سەرهەڵداوان بەرەو گەنج ملیان نا.
- ١٣ شوباتی (١٩٢٥) تورکیا دژی ڕاپۆرتی کۆمەڵەی گەلان لە بارەی مووسڵەوە هەڵوێستی نەرێنی خۆی ڕاگەیاند و داوای کرد کێشەکە بخرێتە بەردەم دادگای نێودەوڵەتی.
- ١٦ شوباتی (١٩٢٥) یەکەمین شەڕی توند لە نێوان سەرهەڵداوان و سوپای تورکیادا لە ناوچەی هانی (بەکوردی هینێ) ڕووی دا و سوپای کەمالی زیانی لێ کەوت .

- ١٦ لە سەر ١٧ شوباتی (١٩٢٥) شێخ سەعید گەیشتە دەرەهانی (گەنچ)، کە بە پایتەختی کاتیی شۆڕش ڕاگەیاندرا و داواکرا خەڵك باج بۆ ئەوێ بنێرێ، تا دیاربەکر ڕزگار دەکرێ و پایتەختی کوردستان دەگوێزرێتەوە بۆ ئەوێ.
- ١٧ شوباتی (١٩٢٥) حکومەت باجی دەیەکی (عشار) بە پێی قانونی ژمارە (٥٥٢) هەڵگرت.
- ١٨ شوباتی (١٩٢٥) هێزی سوارەی (٢١) سوپا لە دەربەندی فیس کەوتە بۆسەی سەرهەڵداوانەوە و دوای زیانێکی زۆر ناچارکرا بکشێتەوە. ئەو هێزە بەسەرۆکایەتی رائیدێك بوو کە ناوی حوسنی بوو.
- ١٩ شوباتی (١٩٢٥) شێخ سەعید و پیاوەکانی بەرەو دیاربەکر بەڕێکەوتن و یەکەم وێستگەیان شارۆچکەی لیجە بوو.
- ٢٠ شوباتی (١٩٢٥) دووەمین هێرش لە دەربەندی فیس کە بەکوشتنی سەرکردەی هێزی سوارەی (٢١) ڕائید حوسنی کۆتایی هات .
- ٢١ شوباتی (١٩٢٥) ڕاگەیاندنی باری ئاوەرتە (نائاسایی، عورفی) لە ناوچەکانی ڕاپەڕینی شێخ سەعیدی پیران .
- ٢٢ شوباتی (١٩٢٥) شەڕێکی توند لە هینێ (بە تورکی: هانی) بە دەستبەسەراگرتنی شارۆچکەکە لە لایەن سەرهەڵداوانەوە کۆتایی هات.
- ٢٣ شوباتی (١٩٢٥) درێژکردنەوەی باری ئاوەرتە لە ناوچەکانی ڕاپەڕینەکە بۆماوەی مانگێك.
- ٢٣ شوباتی (١٩٢٥) دیداری سەرۆك وەزیران فەتحی بەگ و سەرۆکی پارتی پێشکەوتنخوازی کۆماری کازم قەرەبەکر. لەم دیدەنییەدا سەرۆك وەزیران تکای لە بەرپرسانی پارتەکە کرد بە خۆیان دەستپێشخەری بکەن و پارتەکەیان هەڵوەشێننەوە. ئەو دەیزانی دەسەڵاتی نوێ هیچ هێزێکی بەرهەڵستکار قەبووڵ ناکات.
- ٢٣ شوباتی (١٩٢٥) گرتنی هاڤیتبوجاغ و دەستگیرکردنی بەڕێوەبەری ناحیەکە لە لایەن سەرهەڵداوانەوە.

- ٢٤ شوباتی (١٩٢٥) سەرهەڵداوان هێرشیانکردە سەر ئەلعەزیز (ئەلیازگ) و ئـەو شـارەیان گـرت. دیمـەنی تـاڵانکردن و ڕاوڕووت خـەڵکی ئـەو شـارەی لـە پشتگیریکردنی سەرهەڵدانەکە سارد کردەوە.
- ٢٤ شوباتی (١٩٢٥) کازم قەرەبەکر لە ئەنجومەنی مەزنی میللیی تورکیا قسەی کـرد پشـتگیری خـۆی ڕاگەیانـد بـۆ قەدەغـەکردنی بـەکارهێنانی ئـایین بـە مەبەستی ئامانجی سیاسی و دەرکردنی قانونی خیانەتی نیشتیمانی.
- ٢٤ شـوباتی (١٩٢٥) ڕاگەیانـدنی سـەفەربەرلك و قـانونی سـەپاندنی ئـەمن و ئاسایش (تقریری سکون قانونی).
- ٢٥ شوباتی (١٩٢٥) دەرکردنی قانونی ژمارە (٥٥٦) تایبـەت بـە قەدەغـەکردنی بەکارهێنانی ئایین بەمەبەستی بەدیهێنانی ئامانجی سیاسی.
- ٢٦ شوباتی (١٩٢٥) هاتنی شێخ سەعید بۆ هینیّ و پەرەسـەندن و فراوانبـوونی ڕاپەڕینەکە.
- ٣ مـارتی (١٩٢٥) دەسـت لەکارکێشـانەوەی فـەتحی ئۆکیـار و پێکهێنـانی حکومەتی عیسمەت ئینەنو.
- ٤ مارتی (١٩٢٥) قانونی ژمارە (٥٧٨) بە ناوی (دابینکردنـی ئـەمن و ئاسـایش) قبوول کرا، بە بەهانەی سەرهەڵدانی شێخ سەعیدەوە ئەم قانونـە ڕاگەیەنـدرا و دوو دادگـای سـەربەخۆیش یـەکێکیان لـە ئەنقـەرە و ئـەویتریان لـە ناوچـەکانی سەرهەڵدانەکە بەپێی ئەم قانونە دامەزرێنران .
- ٥ مارتی (١٩٢٥) موستەفا کـەمال بانگـەوازێکی بـۆ میللـەت بـڵاو کـردەوە، کـە تێیدا داوای لە خەڵك کرد ئەرکی نیشتمانی خۆیان بەجیّ بێنن.
- ٦ لەسەر٧ ی مارتی (١٩٢٥) لـەو شـەوەدا سـەرهەڵداوان هێرشـیان کـردە سـەر دیاربەکر، هەندیّ لە سەرهەڵداوان توانییان دزە بکەنە ناو شارەکەوە.
- ٧ مارتی (١٩٢٥) دادگاکانی سەربەخۆیی دەستیان بەکارەکانیان کرد.
- ٨ مارتی (١٩٢٥) سەرهەڵداوان لـە هێرشـەکەیان بـۆ سـەر دیاربـەکر شکسـتیان خـوارد و هێزەکـانی مورسـیل پاشـا ناچـاریان کـردن لـە شـار و دەوروبـەری بکشێنەوە.

- ٩ مارتی (١٩٢٥) کەمالییەکان پروپاگەندەی ئەوەیان کرد، گوایە هەندێ بەڵگەی ئینگلیزییان لە لای سەرهەڵداوان بەدەست کەوتووە و ئەوە دەردەخەن، کە سەرهەڵدانەکە بەفیتی ئینگلیز بووە.
- ١٠ مارتی (١٩٢٥) حکومەت هێزی سەربازیی نوێی بۆ دیاربەکر ڕەوانە کرد بۆ پشتیوانیکردنی هێزەکانی مورسیل پاشا.
- ١٤ مارتی (١٩٢٥) سەرهەڵداوان ڤارتۆیان ڕزگار کرد.
- ٢٤ مارتی (١٩٢٥) حکومەتی نوێ بە (١٢٢) دەنگ بەرامبەر بە (٢٢) دەنگ متمانەی ئەنجومەنی مەزنی میللیی تورکیای بەدەست هێنا.
- ٢٥ مارتی (١٩٢٥) سەرهەڵداوان دەستیان بەکشانەوە کرد لە دیاربەکر، دوای ئەوەی هەوڵەکانیان بۆ ڕزگارکردنی ئەو شارە و ڕاگەیاندنی بە پایتەختی کوردستان، شکستیان هێنا.
- ٢٧ مارتی (١٩٢٥) هێزەکانی دەوڵەت توانییان سەرهەڵداوان لە ناوچەکانی دیاربەکر بە تەواوی وەدەرنێن.
- ١ نیسانی (١٩٢٥) پالۆ و هێنی لە سەرهەڵداوان وەرگیرانەوە (٧٤) سەرهەڵداو کوژران و لە هێزەکانی دەوڵەتیش (٥٠) کوژراو و بریندار هەبوون.
- ٣ نیسانی (١٩٢٥) هێزەکانی دەوڵەت لە قولپ بەرەو گەنج کەوتنە ڕێ و گەیشتنە ڕووباری  موراد.
- ٣ نیسانی (١٩٢٥) قانونی ژمارە (٣١٠) دەرکرا لە بارەی گێڕانەوەی ئەوانەی لەکاتی هێرشەکانی سوپای ڕووسدا بەرەو ڕۆژئاوای تورکیا کۆچیان کردبوو بۆ ویلایەتەکانی ڕۆژهەڵات، لەمەدا مەبەست گێڕانەوەی تورك و هێنانی کۆچبەرانی تورکی بەلقان بوو بۆ گۆڕینی دیمۆگرافیای کوردستان و ئەرمەنستان.
- ٤ نیسانی (١٩٢٥) ژمارەیەك لە سەرهەڵداوان لە کیگی بەدیل گیران.
- ٥ نیسانی (١٩٢٥) سەرهەڵداوان بەرەو گەنج کشانەوە.
- ٧ نیسانی (١٩٢٥) عیسمەت ئینەنو زانیاری لە بارەی سەرهەڵدانەکەوە پێشکەش بە ئەنجومەنی مەزنی میللیی تورکیا کرد.

- ٨ نیسانی (١٩٢٥) هێزەکانی حکومەت گەیشتنە قولپ و ڕێگەیان لە سەرهەڵداوان گرت کە لە چەپاقچور و گەنچەوە دەهاتن، چونکە هێزەکانی دەوڵەت چەپاقچوریان گرتبووەوە. شێخ سەعید لە گەنچەوە دەهات و (٥٠٠) سەرهەڵداویش لە چەپاقچورەوە و بەرەو سوڵحان ڕایان کرد.
- ١١ نیسانی ساڵی (١٩٢٥) شەڕی هێزەکانی حکومەت لەگەڵ سەرهەڵداواندا لە بەشیری (بە کوردی: قوبین ). هێزەکانی حکومەت (١٥) کەسیان لێ کوژرا و (١٠) کەسیشیان لێ بریندار بوون.
- ١٢ نیسانی (١٩٢٥) گرتنی دەرەهینێ لە لایەن هێزەکانی حکومەتەوە و ئازادکردنی ئەو ئەفسەر و فەرماندانەی سوپای تورك، کە لە لایەن سەرهەڵداوانەوە بەدیل گیرابوون .
- ١٤ نیسانی (١٩٢٥) لە سێدارەدانی خالید جبرانلی و یوسف زیا خورشید لە بدلیس. ناوچەکانی چەپاقچور و گەنچ لە سەرهەڵداوان وەرگیرانەوە و باڵادەستی بۆ هێزەکانی حکومەت گەڕایەوە.
- ١٤/١٥ نیسانی (١٩٢٥) شێخ سەعیدی پیران و (٢٤) کەس لە هەڤاڵەکانی لەسەر پردی عەبدولڕەحمان پاشا، نزیکی ڤارتۆ دوای تۆپبارانێکی خەست، بەناچاری خۆیان دا بەدەستی سوپای تورکەوە، کە غالیب بەگ و حوسێن سەلجووقی سەرکردایەتییان دەکرد.
- ١٥ نیسانی (١٩٢٥) ڕاگەیاندنی ڕەسمی لە بارەی سەرهەڵدانەکەوە بڵاوکرایەوە.
- ٢١ نیسانی (١٩٢٥) بڵاوکردنەوەی قسە و باس لە بارەی ڕاپۆرتی باڵوێزخانەی بەریتانییەوە لە ئەستەمولّ، گوایە باسی پەیوەندی کاربەدەستانی ئینگلیزی کردبوو لە عێراق بە ڕووداوەکانی سەرهەڵدانەکەوە. کاربەدەستانی تورکیا پروپاگەندەیەکی زۆریان لەم بارەیەوە لە ڕۆژنامەکانی تورکیا و ئاژانسەکانی هەواڵدا بڵاوکردەوە، گوایە ئەو سەرهەڵدانە بە فیتی ئینگلیز بووە بۆ ئەوەی کێشەی مووسڵ بە قازانجی ئەوان لە عیراق کۆتایی بێت.
- ٢٣ نیسانی (١٩٢٥) والی گەنچ لە نامەیەکدا بۆ وەزارەتی نێوخۆ باسی لە کوشتنی زەکی دیندار ئەڵپ کردووە، کە کاتی خۆی هەواڵی دابووە حکومەت لە بارەی ئامادەکاریی کوردەکانەوە بۆ سەرهەڵدان لە دژی حکومەت.

- مایس (١٩٢٥) حوسێنە کوێر لەبەرئەوەی بەشداری لە ڕاپەڕینەکەدا نەکردبوو لە کوردستان دوورخرایەوە، دوای سێ ساڵ بەر لێبووردن کەوت، بەلأم بەهۆیەکی ترەوە دیسان لە زیندان قایم کرا و هەر لەوێش کۆچی دوای کرد.
- ١٤ مایسی (١٩٢٥) دادگاییکردنی سەید عەبدولقادر و هاوڕێکانی لە دادگای سەربەخۆیی دیاربەکر دەستی پێکرد و لە ٢٦ ئەو مانگە کۆتایی پێهێنرا.
- ٢٧ مایسی (١٩٢٥) سەید عەبدولقادری نەهری و هاوڕێکانی لە سێدارەدران.
- ٣١ مایسی (١٩٢٥) هەڵگرتنی باری سەفەربەر (واتا باری جەنگ کە حکومەت هەموو کەسێ توانای شەڕی هەبێ دەبیات بۆ بەرەکانی شەڕ، بە واتایەکی تر ڕەشبگیری بۆ سەربازی ).
- ١ حوزەیرانی (١٩٢٥) کەسانی یەدەك و ڕەشبگیرکراو بۆ سوپا لە خزمەتی سەربازی ئازاد کران.
- ٣ حوزەیرانی (١٩٢٥) داخستنی پارتی پێشکەوتنخوازی کۆماری.
- ٢٧ حوزەیرانی (١٩٢٥) دادگاییکردنی شێخ سەعید و هاوڕێیانی، کە بەر لە مانگێك بەبێ وچان دەستی پێکردبوو، کۆتایی هات.
- ٢٨ حوزەیرانی (١٩٢٥) دادگای سەربەخۆیی دیاربەکر بڕیاری لەسێدارەدانی شێخ سەعید و (٢٨) کەس لە یاوەرانی دا، هەر ئەو شەوە لە نیوەشەودا بڕیارەکان جێبەجێ کران.
- ٢٤ ئابی (١٩٢٥) موستەفا کەمال یەکەم جار بە شەپقەوە دەرکەوت.
- ٢ ئەیلولی (١٩٢٥) داخستنی تەکیە و مەزارگەکان و بڕیاری ژمارە (٢٤٩٣) ئەنجومەنی وەزیران لە بارەی پۆشاك و کلأولەسەرنانی فەرمانبەران ڕاگەیاندرا.
- ٢١ نۆڤەمبەری (١٩٢٥) درێژکردنەوەی باری نائاسایی لە دەڤەرەکانی سەرهەڵدانەکە بۆ ماوەی یەك ساڵ.
- ٢٥ نۆڤەمبەری (١٩٢٥) دەرکردنی قانونی ژمارە ( ٦٧١) لە بارەی لەسەرنانی شەپقە دەرکرا.
- ٢٥ نۆڤەمبەری (١٩٢٥) ئەنجومەنی مێژووی تورك لە ئەستەموڵ کۆبووەوە و بڕیاردرا دەست بکرێت بە لێکۆڵینەوەی مێژووی تورك بە شێوەیەکی ئەکادیمی و تێزی تورك بۆ مێژوو دیاربکرێت.

- ٣٠ نۆڤەمبەری (١٩٢٥) داخستنی تەکیە و مەزارگەی زاوییەکان و هەڵگرتنی ژمارەیەك ناو و نازناو لە مەزارگەکاندا بەپێی قانونی (٦٧٧) کە لەم ڕۆژەدا دەرکرا.
- ١٦ کانونی یەکەمی (١٩٢٥) بڕیاری کۆمەڵەی گەلان بە لکاندنی مووسڵ بە عێراقی ژێرمەندەیتی بریتانییەوە.
- ٢٦ کانونی یەکەمی (١٩٢٥) کاتژمێر و ڕۆژژمێری (کەلاندەری) جیهانی قەبووڵ کرا بەپێی قانونی ژمارە (٦٩٧)، کە لە (١٩٢٦/١/١) کەوتە واری جێبەجێکردنەوە.
- ١٧ شوباتی ١٩٢٦ قانونی مەدەنی ژمارە ( ٧٤٣) قەبووڵ کرا و لە (٤) ئۆکتۆبەری (١٩٢٦)ەوە کاری پێکرا.
- ٢٨ شوباتی (١٩٢٦) بڕیاردرا کارەکانی دادگاکانی سەربەخۆیی تا (٧) ئەیلولی (١٩٢٦) درێژ بکرێنەوە.
- ١ مارتی (١٩٢٦) ئەنجومەنی مەزنی میللیی تورکیا قانونی سزای تورکی ژمارە (٧٦٥) دەرکرد.
- ٢٢ مارتی (١٩٢٦) ئەنجومەنی مەزنی میللیی تورکیا قانونی ژمارە (٧٨٩)ی سەبارەت دامەزراوەی زمانی تورکی دەرکرد.
- ١٦ مایس (١٩٢٦) بەرایی سەرهەڵدان لە ئاگری.
- ١٨ مایس (١٩٢٦) ئەرك و کارەکانی دادگاکانی سەربەخۆیی تا ( ٧) مارتی (١٩٢٧) درێژکرانەوە.
- ٢٧ مایس (١٩٢٦) ڕاپەڕینی هۆزی موتکی.
- ٦ حوزەیرانی (١٩٢٦) تورکیا بڕیاری کۆمەڵەی گەلانی لەبارەی چارەنووسی مووسڵەوە قەبووڵ کرد.
- ١٥ حوزەیرانی (١٩٢٦) هەوڵی کوشتنی موستەفا کەمال لە ئەزمیر بەهۆی هەواڵێکەوە پەردەی لەسەر لادرا.
- ٢٢ نۆڤەمبەری (١٩٢٦) باری نائاسایی بۆ ساڵێکی تریش درێژ کرایەوە.
- ٢٤ دیسەمبەری (١٩٢٦) گۆڕانکاری و هەموارکردنی قانونی ژمارە (١٥٠٥) تایبەت بە زەوییەکانی حکومەت. ئەم قانونە دەسەڵاتێکی زۆری بە حکومەت

بەخشی بۆ ئەوەی ئەو زەوییانە بدات بە تورك یا ئەوانەی، بە وتەی قانونەکە، پابەندی کولتووری تورکین.

- ٢٨ مایسی (١٩٢٧) قانونی ژمارە (٢٠٣) لەبارەی سەندنەوەی ماف هاولاّتێتی لەو (١٥٠) کەسەی، کە بەپێی پەیماننامەی لۆزان دەبوایە بەر لێبووردنی گشتی بکەوتبانایە.
- ١٦ حوزەیران (١٩٢٧) بەپێی قانونی (١٥١٥) گواستنەوەی ئەو هۆز و بنەماڵانەی، کە حکومەتی تورکیا هەڵسوکەوتیانی بەزیانبەخش لەقەڵەم دەدا بۆ ڕۆژئاوای ولاّت. ئەمە ئەوانەشی دەگرتەوە کە حوکمی گرانیان بۆ دەرکرابوو.
- ١٩ حوزەیران (١٩٢٧) ئەو زەوییانەی دەگەڕانەوە بۆ گەنجینەی دەوڵەت، دەبوایە بە پێی قانونی ژمارە (١٠٩٧) بدرێن بە وەرزێرە بێ زەوییەکان.
- ٩ نیسانی (١٩٢٨) لابردنی دەستەواژەی ( ئیسلام ئایینی ڕەسمی دەوڵەتە) لە دەستوری تورکیا و گۆڕانکاری لە ڕێوڕەسمی سوێند خواردنی سەرۆك کۆمار و ئەندامانی پەرلەمان، بەوەی بە ڕێوڕەسمی مەدەنی جێگەی ڕێوڕەسمی ئایینی بگرنەوە.
- ٢ حوزەیرانی (١٩٢٩) دامەزراندنی ویلایەتی مووش بەپێی قانونی ژمارە (١٥٠٩)، کە چەپاقچور و گەنج لە ویلایەتی سێرت دابڕان و خرانە سەر ویلایەتی نوێ.

# دیاردەکانی ئێتنۆکولتووری و ئێتنۆسایکۆلۆگی لە کۆمەڵگای کوردیدا و میکانیزمەکانی کارلێککردنیان

پ. ی. د. ڕەشاد میران
زانکۆی سەلاحەدین / کۆلێژی ئەدەبیات
بەشی کۆمەڵناسی

## پێشەکی

هەر کۆمەڵبوونێکی مرۆیی بوار و لایەنی ئێتنیکیی خۆیی هەن کە بەهۆیانەوە لە کۆمەڵبوونەکانی تر جیا دەبێتەوە– ئەمانە ناسنامەی ئەم کۆمەڵبوونە دادەڕێژن، جا ئەو کۆمەڵبوونە لە هەر ئاستێکی ئێتنیکیدا بێت، واتە هەر جۆرە ئێتنۆسێك* بێت : خێڵێك بێت، کۆمەڵە خێڵێك، میللەت یاخود نەتەوە بێت. ئەم بوار و لایەنە ئێتنیکییانەش، کە لەهەمان کات وەکو مەرجی بوونی ئێتنۆس و هەروەها وەکو نیشانە و مۆرك بۆی خۆ دەنوێنن، بەگشتی لەمانەی خوارەوە پێکهاتوون :

ئێتنۆنیم (ناوی نەتەوەیی هاوبەش)، زمانی هاوبەش، خاکی هاوبەش، مێژووی هاوبەش، کولتووری هاوبەش، سایکۆلۆگیای هاوبەش [1] .

کەواتە بابەتی ئێتنیکی، بوار و دیاردە و تۆخم و پرۆسەکانی، یەکێکە لە بابەتە هەرە گرنگ و چارەنووسسازەکانی ئێتنۆسانی جیهان ؛ زانین و ئاگاداربوون لێی و چاودێریکردن و پلانرێژکردنی، پێوەری ئاستێکی بەرزی مەعریفی و هوشیارییە کە ئاکام سەرکەوتن، بەهێزبوون و پێشکەوتنی ئێتنۆسانی لێ دەکەوێتەوە– لەم ڕووەوە، چەند ئێتنۆسێکی لەو بابەتە ناودەبەین : ئینگلیز، ئەڵمان، فەرەنسی، ئیسپانی، ڕووس ... هتد ؛ ئەمانە توانیویانە نەك هەر پارێزگاری لەخۆیان بکەن و مانەوەی خۆیان وەکو ئێتنۆس مسۆگەر بکەن، بگرە مەودای بڕکردنی کولتووری ئێتنیکیی خۆیان تائەوپەڕی فراوان کردووە و

سنوورەکانی ئێتنۆسانی تریان بەزاندوون. کەچی ئێتنۆسی واش زۆرن کە لەبەر بێ ئاگاییان لە بوارەکانی ئێتنیکیی خۆیان تەنیا فریای مانەوەی خۆیان کەوتوون، ئەویش بەحاڵ وەکو ئێتنۆس– لەمانەش ئێتنۆسی کورد. لەماوەی هەموو مێژوویدا کورد هەمیشە دووچاری هێرشی "زانستییانە" بووە کە تیایاندا هەوڵدراوە گومان بخرێتە سەر ماك و مۆرکە ئێتنیکییە هاوبەشەکانی : ناو، زمان، خاك، کولتوور– بەمەشەوە لێسەندنەوەی ناسنامە نەتەوەییەکەی .

بەم بۆنەیەشەوە، دەبێ چی لەوە گرنگتر بێت بۆ کورد کە ئاشنای ڕەوشی ئێتنیکی و مەرج و مۆرکە ئێتنیکییەکانی خۆی بێت و زانستییانە بیانسەلمێنێت ؟ بەتایبەتیش بۆ ئێتنۆسێك، وەکو کورد، کێشەیەکی نەتەوەیی مێژوویی و گەورەی هەبێت .

لەم ڕوانگەیەوە، هەوڵ دەدەین ئاشنای بوار و لایەنەکانی کولتوور و سایکۆلۆگیای ئێتنیکی بین، هەروەها ڕوونکردنەوەی پێوەندییەکانیان و جۆر و ئاستەکانی کارلێککردنیان، ئەویش لەبەر ڕۆشنایی ڕەوشی ئێتنیکیی کورد لە کوردستانی باشووردا... بۆ ئەمەش وەکو چۆن سوود لە سەرچاوەی نووسراو و تیۆری وەرگیراوە، ئاواش سەرنجدانی ڕاستەوخۆی توێژەر بۆ دیاردەکان وەکو میتۆد پەیڕەو کراوە .

## ئێتنۆگرافیا و بوارەکانی کارکردنی !

بابەتەکانی هەر زانستێك بریتین لە: دیاردە، پرۆسە و ڕووداو، ئینجا دەرئەنجام و دەرهاوێشتەکانیان و هەموو بوار و لایەنە پێوەندارەکانیان – ئەمە بێگومان زانستی ئێتنۆگرافیاش دەگرێتەوە. لەم ڕوانگەیەوە، ئەم زانستە کە لایەنی ئێتنیکیی کۆمەڵبوونەکانی مرۆڤی کردووە بە بابەتی خۆی، بابەتێکی یەکجار فراوانە و کۆمەڵێك دیاردە و پرۆسە و ڕووداو دەگرێتەوە کە ئاسەوار و جێپەنجەیان هەبووە یان دەبێ بەسەر ئەو کۆمەڵبوونانەوە .

کە دەڵێین بابەتێکی فراوان، مەبەست ئەوەیە ئەم بابەتە گرێدراوە بە هەموو یان زۆربەی بوار و لایەنەکانی ژیانی کۆمەڵبوونە مرۆییەکانەوە ؛ بۆیەش هەر لەمیانەی ئەم زانستەدا، واتە ئێتنۆگرافیا، چەندین لقی زانستیی ئاوێتە

دروست بوون کە بوار و لایەنە جۆربەجۆرەکانی ژیانیان کردوون بە ئامانجی لێکۆڵینەوەکانیان. لەم لقە زانستییانەش وەکو: ئێتنۆجیۆگرافیا، ئێتنۆلینگڤیستیکا، ئێتنۆسۆسیۆلۆگیا، ئێتنۆبۆتانیکا، ئێتنۆزۆئۆلۆگیا، ئێتنۆسایکۆلۆگیا، ئێتنۆپیداگۆگیا، ئێتنۆدیمۆگرافیا ...

ئەمانە هەروەکو لە ناوەکانیانەوە دیارە، هەریەکێکیان بایەخ بە تایبەتمەندییە ئێتنیکییەکان دەدات لە بوارەکەی خۆیدا. ئەگەر بۆ نموونە ئێتنۆبۆتانیکا وەرگرین[٢]، ئەوا مەبەستییەتی پێوەندیی نێوان کۆمەڵبوونێکی دیاریکراو و ڕووەك و درەختی سەر خاکەکەیان بدۆزێتەوە، جۆرەکانی ڕووەك دەربخات و هەڵوێستی ئەمانە بەرامبەر بەم ڕووەکانە و بەکارهێنانەکانیان، ئینجا ڕەنگدانەوەی ئەم ڕووەکانە لە ژیانی کۆمەڵایەتی و کولتووریی ئەمانەدا، وەکو : وێنەی داری (الارز) لەسەر ئالآی لوبنان و گەڵای دارچنار لەسەر ئالآی کەنەدا، گرنگی و ناوبانگی داری (بریۆزا) لە ڕووسیا، داری (ساکورا) لە یابان، داربەڕووی کوردی، دارخورمای عەرەب– ئەمانە دەوری جۆرێك لە سیمبۆلی نەتەوەیی ئێتنۆسەکان دەبینن ؛ پیرۆزیی تاکە دارێك، یان چل بنەدار لای هەندێ گرووپەی ئایینی[٣] ؛ زیاد لەوەش ڕەنگدانەوەی ڕووەك لە کولتووری ماددیی ئێتنۆسێك بەتایبەتیش لە خۆراکیان، هەروەها لە خانوو و کەلوپەلی ناو ماڵ و کەرەستە و ئامێرەکانی کارپێکردنیاندا، یان بەکارهێنانی ڕووەك لە پزیشکیدا... هەموو ئەمانەش پێوەندیی ڕاستەوخۆیان هەیە بە بوارەکانی جیۆگرافیا و سروشت و ئیکۆلۆگیای ئێتنۆسەکەوە .

ئێتنۆزۆئۆلۆگیا – هاوپێوەندارییی ئێتنۆس و ئاژەڵ و گیانلەبەرانی کردووە بە بابەتی خۆی...

ئێتنۆ پیداگۆگیا – پەروەردە و پێگەیاندنی نەتەوەیی (فەرمی و نافەرمی)

ئێتنۆلینگڤیستیکا– زمانی نەتەوەیی، دیالێکت و جیۆگرافیای دابەشبوونیان و پێوەندییان بە وردە کولتوورەکانەوە (sub-culture) ...

ئێتنۆسایکۆلۆگی– تایبەتمەندییە نەتەوەیییەکان لە شێوازی بیرکردنەوەی ئەندامانی ئێتنۆسێکدا، لە ڕەفتار و هەڵوێست، زەوق و میزاج و خوو و خولیاکانیاندا ... [٤]

هــەموو ئــەو بوارانــەش هەنــدێكیان ڕاســتەوخۆ و زۆریشــیان ناڕاســتەوخۆ گرێدراون بە كولتووری ئێتنۆسەوە، بۆیەش ڕۆڵی گرنگییان هەیە لە دروستبوون و سەرهەڵدانی دیاردە كولتوورییەكان كە دواتر هەوڵدەدەین هەندێ نموونەیان بێنینەوە و شیكارییان بۆ بكەین .

## كولتوور و سایكۆلۆگیا

پێوەنــدیی نێــوان ئــەم دوو بــوارە گرنگــەی ژیــانی كۆمەڵایــەتیی ئەنــدامانی ئێتنۆس گەلێك توندوتۆڵە و، لەهەمان كات، ئاڵۆز و زۆرجاریش شاراوە و هەست پێنەكراوە .

لە كاتێكدا كولتوور دیاردەیەكی كۆمەڵایەتییە و تایبەتمەندییەكی كۆمەڵبوونــە مرۆییەكانــە، بــە ئێتنۆسیشــەوە، بــەڵام لــە كــاركردن و كاریگەرییــدا ڕەهەنــدی دەروونــی هەیــە ؛ دەروونــیش دیاردەیــەكی تاكەكەســییە، هەرچــەندە زەمینــە و بنەمای كۆمەڵایەتیی هەن .

كرۆكــی ئــەم مەســەلە ئــاڵۆزەش لەوەدایــە كــە كولتــوور ، وەكــو گوتمــان، دیاردەیــەكی كۆمەڵایەتییــە، ئــەوەش واتــە هــەموو بوارەكــانی ژیــانی كۆمەڵایــەتی دەگرێتــەوە ؛ یــان وردتــر، كولتــوور هــەموو بوارەكــانی ژیــانی یەكــە یەكــەی ئەنــدامانی ئێتنــۆس و كۆمــەڵگا پابەنــدی خــۆی دەكــات. هەریــەكێكیش لــەم تاكەكەسانە بوار و تایبەتمەندیی سایكۆلۆگیی خۆیی هەیە كە زۆربەی جار بەرهــەمی كولتوورەكەیــە یــان، هەرنــەبێ، كەوتۆتــە بــن كاریگەرییەكانییــەوە — كولتوور و توخم و ڕەگەزە كولتوورییەكان، بۆ ئەوەی بتوانن ئەرك و وەزیفـەكانی خۆیان جێبەجێ بكەن دەبێ كاریگەریی بنوێنن لەسەر سایكۆلۆگیای تاكەكەسان، ئــەگینا پابەنــد نــابن پێیانــەوە. لــە هــەمان كــات، ســایكۆلۆگیای تاكەكەســیش دەستەوسان لەبەردەم كولتوور ناوەستێ، ئەوەش چونكە سایكۆلۆگیا تـەنیا زادە و بەرهەمی كولتوور نییە، بگرە هۆكاری بایۆلۆگی و بۆماوەییش ڕۆڵیان دەبـێ لـە داڕشتنی سایكۆلۆگیای تاكەكەسدا "پڕۆسەی دروستبوونی مرۆڤ پڕۆسەیەكی بایۆلۆگی– كۆمەڵایەتییە"[٥]. سایكۆلۆگیای تاكەكەسان، كە دواجار فۆڕموڵە دەبن بەشـێوەی سـایكۆلۆگیای هاوبـەش ( یـان سـایكۆلۆگیای جـەمعی) و ئـەویش لـە

ئەنجامدا ڕەهەندی ئێتنیکی دەبێ و دیاردەی ئێتنۆسایکۆلۆگی لێ دروست دەبێ، کار دەکاتە سەر کولتوور و بوارە کولتوورییەکانەوە– بۆیەش ئاسان نییە هەموو بوار و لایەن و تایبەتمەندییەکانی کولتوور و سایکۆلۆگیا، هەریەك بەتەنیا، دەسنیشان بکەین؛ هەروەهاش پەیبردن بە شێوازەکانی میکانیزمی کارلێککردنیان، بەهەمان شێوە، کارێکی سەخت و ئالۆزە .

ئێتنۆسان پێش هەموو شتێك بە کولتوور لێك جیادەبنەوە، هەر ئێتنۆسە و کولتووری تایبەت بەخۆیی هەیە؛ کەواتە کولتوور هەروەها دیاردەیەکی ئێتنیکیشە، چونکە تایبەتمەندیی نەتەوەیی (ئێتنیکی) بە ئەندامانی ئێتنۆس دەبەخشێ – ئەمەش واتە داڕشتنی ناسنامەی نەتەوەیی بۆیان. ئەگەر سەرنج بدەین، کولتووری ئێتنۆسی کورد ئەگەرچی لایەنی هاوبەشی هەیە لەگەڵ ئێتنۆسانی تری وەك عەرەب، فارس، تورك... بەلاّم لە هەردوو بوارەکانی کولتووری ماددی (خۆراك، جلوبەرگ، خانوو...) و کولتووری گیانی (زمان، داب و نەریت، ئەدەب و فۆلکلۆر ...)دا، کورد توخمی کولتووریی تایبەت بەخۆیشی هەن کە گوزارشت لە ناسنامەی نەتەوەیی دەکەن .

ناسنامەی نەتەوەییش، کە بەرهەمی دیاردە و توخمە کولتوورییەکانە، کەش و فەزایەکی سایکۆلۆگیی هاوبەش بۆ ئەندامانی ئەو ئێتنۆسە دروست دەکات کە تیایدا هەریەکێکیان هەست بە ئینتیما دەکات بۆ ئەو ناسنامەیە نەتەوەیییە[٦]. جا، لێرەدا ئەگەر سایکۆلۆگیای هاوبەش بەرهەمی کولتوور بێت، کولتووریش دیاردەیەکی ئێتنیکییە، کەواتە سایکۆلۆگیای هاوبەشی ئەندامانی ئێتنۆسیش، واتە ئێتنۆسایکۆلۆگیا، بەهەمان جۆر دیاردەیەکی ئێتنیکییە.

### شێوازی بیرکردنەوە (مینتالیتێت)

دیاردەکانی ئێتنۆسایکۆلۆگی لە گەڵێ بوار و لایەنی ژیانی ئەندامانی ئێتنۆسدا بەرجەستە دەبن، بەتایبەتیش لە دیاردەیەکی وەکو شێوازی بیرکردنەوە (Mentality الذهنية)دا کە هەمیشە دەگوترێ : بیرکردنەوەی کوردانە، زەینییەتی عەرەبی، مینتالیتێتی ئینگلیزی ... "ژیانی ڕۆژانەمان لە کەشێکی کۆمەڵیدا بەڕێوەدەچێ و پێوەندییە کۆمەڵییەکانیش جۆریك لەپێوەندیی دەروونیمان بۆ

دروست دەکەن و بەردەوام عەقلیەتێکی هاوبەش کۆنترۆڵمان دەکات کە لە دابونەریت و ڕای گشتیدا بەرجەستە دەبێ"(٧). هەڵبەتە بنچینە و بنەمای دیاردەی ئێتنۆمینتالیتێت لەوەدایە کە هەر ئێتنۆسەو لەڕوانگەی کولتووری خۆیەوە جۆرێکی بیرکردنەوەی "هاوبەش"** بۆ سەرلەبەری ئەندامانی دادەڕێژێ کە ڕەنگدانەوەی دەبێ لەسەر ڕەفتار و چالاکی و هەڵوێستەکانیان لە ژیانی ڕۆژانەدا. شێوازی بیرکردنەوە، بریتییە لە "جیهانبینیی جەمعی"ی ئەندامانی ئێتنۆس کە لەبەر ڕۆشناییدا ژیان و دنیا وێنا دەکەن، چالاکی و هەڵوێست دەنوێنن(٨) ... لەم ڕووەوە ئەگەر کۆمەڵبوونێکی مرۆیی ئەم جیهانبینییەی نەبێ کەواتە خاوەن تایبەتمەندیی نییە، ئەمەش واتە کولتوورێکی هاوبەشی فەراهەم نەکردووە کە ناسنامەیەکی ئێتنیکیی داڕێژێ بۆ ئەندامەکانی. لەم ڕوانگەیەوە، سایکۆلۆگیای هاوبەشی ئەندامانی ئێتنۆسێك، کە شێوازی بیرکردنەوە دەرهاوێشتەی سەرەکییەتی، یەکێکە لە مەرجەکانی بوونی ئێتنۆس و جێگەیەکی شیاوی هەیە لەنێو مەرج و مۆرکە ئێتنیکییەکاندا .

شێوازی بیرکردنەوە زۆر بەڕوونی لە دیاردەی زماندا دەردەکەوێت، لە ڕێزمان و داڕشتنی دەستەواژە و ڕستە و لە وشەکانیدا، بەتایبەتیش لە ناوەکاندا. ئەگەر سەرنج بدەین، دەتوانین لە زمانی نووسینماندا ببینین کە ئێمەی کورد چەندە عەرەبییانە بیردەکەینەوە، بۆ نموونە لە دەستەواژەیەکی باودا (... هەڵدەستێ بە سازدانی کۆڕێك !)– ئەمە هەمان ئەم قسە عەرەبییەیە (یقوم ب...)، هەروەها بەکارهێنانی ئامرازی کۆی عەرەبی (ات): عەقارات، مۆبێلیات، چەرەزات...؛ بەهەرحاڵ ئەمە لەسەر ئاستی گشتی، بەلاَم گرفتی گەورە لەوەدایە کە لەناوەندە ئەکادیمییەکانیش لە نووسنیەکانیاندا ڕەچاوی بیرکردنەوەی کوردی و تایبەتمەندیی زمانەکەیان ناکەن، بۆ نموونە، ناوی هەندێ لە زانستەکان کە بە لۆگیا یان لۆگی Logy تەواو دەبن وەکو: سۆسیۆلۆگیا، سایکۆلۆگیا، ئەنترۆپۆلۆگیا– لێرەدا وەکو باوە بەشێوە عەرەبییەکەی دەنووسرێ: سۆسیۆلۆجیا، سایکۆلۆجیا، ئەنترۆپۆلۆجیا، بەبێ ئەوەی هەست بکەین کە عەرەب پیتی ( گ G)ی نییە بۆیە پیتی (ج) بەکاردێنێ– لە کاتێکدا کورد ئەم

پیتـەی هەیـە بـۆچ بـەکاری نـەهێنیٚ ! — کەچـی بێئاگاییيانـە سـووره لەسـەر بەکارهێنانی شێوه عەرەبییەکەی ناوەکان *** .

ئێتنۆگرافیسـتی ڕووس یـو. ڤ. برەملێـی U.V. Bromley نموونەیـەکی سەرنجڕاکیشی هێناوەتەوه سەبارەت بە مینتالیتێتی چەند ئێتنۆسێك : گولێکی بچووك هەیە لە بەهارێکی زوودا سەر دەردەکا، کە هێشتا بـەفر هـەر مـاوه — هـەر ئێتنۆسه بەجۆرێك ناوی دەبات و هەریەکێکیش لـەم ناوانـە ئاماژەیـە بـۆ شـێوازی بیرکردنــەوەی ئەنــدامانی ئێتنۆســەکە : بــە ڕووســی بــەم گوڵــە دەڵــێن (**بــن بەفرینـە** Podsnejhnik )— لـەم نـاوەدا ئامـاژە کـراوه بـە ژێربـەفر، واتـە وەرزی بەهاری زوو؛ بە ئـەڵمانی Schneeglockchen زەنگوڵـەی بـەفری — ئاماژەیـە بـۆ شێوه و ڕوخساری ئەم گوڵە کە لە زەنگوڵە دەچیٚ ؛ بـە ئینگلیـزی Snow drop دڵۆپەی بەفرین — لێرەدا شێوەکەی کراوه بە دڵۆپە ؛ بە فەڕەنسی Perce-niege بەفربڕ — ئاماژه بۆ جوولانەوەی گوڵەکەیـە چـۆن بـەفر دەبـڕیٚ [9]. هـەمان گـولٚ، بێگومان، لە کوردستانیشدا هەیە و لە هەندیٚ ناوچە پێی دەگوتریٚ بـن بەفرۆکـە (یان بن بەفریلە)— مرۆڤی کورد سەرنجی داوەتە هەریەك لە بەفر (کات) و شێوەی بچووکی گوڵەکە (ۆکە) .

بـە هـەمان جـۆر، ڕەنگـە بتـوانین جیـاوازیی شـێوازی بیرکردنـەوەی هـەردوو ئێتنۆسی کورد و عەرەب لـە ناوێکدا بـەدی بکـەین، ئـەویش ڕەشمـاڵی کـوردی و (بیت الشعر)ی عەرەبییە کە دوو ناون بۆ هەمان شت : لەناوه کوردییەکەدا ئامـاژه بۆ ڕەنگی ڕەشی خیوەت کراوه، لە عەرەبییەکەشدا هێما تەنیا بۆ (موو) کراوه کە خیوەتەکەی لیٚ دروست کراوه. هەروەها دەکریٚ لە ناوه کوردییەکـەدا ئامـاژه بـۆ ماڵاتی ڕەش (بزن)یش بەدی بکەین کە لە مووەکەی خیوەتەکە دروسـت کـراوه — بە هەردوو مانا ناوه کوردییەکە پڕماناتره .

سایکۆلۆگیای هاوبەش ڕەنگدانەوەی دەبیٚ هەروەها لـە دیـاردەی ئاکـاری نەتــەوەیی[10]، لــە زەوق و میزاجــی ئەنــدامانی ئێتنــۆس[11] و تەنانــەت لــە تامکردنیشـیاندا[12]— بـۆ نموونـە، ئێتنۆسـی وا هەیـە ئەندامـەکانی بەشـێوەیەکی "ڕەها" حەز بە خواردەمەنیی تیژ دەکەن، وەکـو ئێتنۆسـانی هینـد و پاکسـتان ؛ مـرۆی کـورد لیمـۆی تـرش بـە خوێـوه دەخـوات، ڕووسـەکانیش بـە شـەکرەوه ؛

کابرای ئەمەریکایی چێژ لە خواردنی شووتی دەکات کە خوێی بەسەردا دەکات ؛ چای گەرمی لای خۆمان و چای ساردی ئێتنۆسانی ئەوروپی ... هەموو ئەمانەش بێگومان دەچنە نێو قەوارەی جیهانبینییانەوە – ئەمانە گوزارشت لە ڕوانینی ئەندامانی ئەو ئێتنۆسانە دەکەن سەبارەت بە جۆر و چۆنیەتیی جوانی، باشی، خۆشی، چاکە، جوامێری و ...هتد .

سویدی بەم جۆرە وەسفی خۆیان دەکەن : " ئێمە کڕ و ساردین، سروشتمان خۆشدەوێ و ڕۆحی جوتیارانەمان هەیە، هەندێك بێزارکەرین بەڵام کارەکانیش ڕادەپەڕێنین. لەناو خۆماندا ڕەخنە لەو ڕۆحە میللییەمان دەگرین، کەچی پێمان خۆش نییە کە بێگانە باسی خەوش و کەموکوڕیمان دەکەن " [١٣] .

بەڵام ئێتنۆگرافیستی سویدی ئۆکێ داون °Ake Daun لە کتێبەکەیدا بەناوی "مینتالیتێتی سویدی"، ئاماژەی داوە بە چەند سیفەتێکی سویدیان کە سیما گشتییەکانی شێوازی بیرکردنەوەیان دادەڕێژن، لەوانە : شەرمنی، خۆبەدوورگرتن، کڕی، جددییەت... بەڕای ئەو بۆ لێکدانەوەی ئەم سیفەتانە دەبێ مێژووی ئێتنۆسی سویدی ڕەچاو بکرێ [١٤] . بەشی هەرەزۆری سویدییەکان لادێیی و جووتیار بوون، پرۆسەی بە مەدەنیبوونیان تەنیا لە دوای جەنگی جیهانیی دووەمەوە دەستی پێ کرد و تاو و گوڕمی ئەم پرۆسەیەش لە ١٩٥٠ەوە بەپەلە زیادی کرد و دووچاری وەرچەرخانێکی لەپڕ بوونەوە – کەسایەتیی لادێی مرۆڤی سویدی ئێستاکەش بەدی دەکرێ، هەرچەندە زۆریان هەوڵدەدەن ڕزگاریانبێ لەم سیفەتانەی لەسەرەوە ئاماژەیان بۆ کرا .

کزیی ئارەزووی قسەکردن willing to talk یەك لەو سیفەتانەی ئەندامانی ئێتنۆسی سویدییە کە بە ڕای داون دەگەڕێتەوە بۆ ئەوەی ئەمانە باوەڕی ئایینیی خۆیان ئەوەندە نەگۆڕیوە، بە بەراورد لەگەڵ ئەمەریکاییەکان – دەسەڵاتەکانی دنیایی و ڕۆحی (کەنیسەی لۆتێری Lutheran church) هەمیشە داوای میانڕەوی و خۆبەدوورگرتنیان لە سویدییەکان کردووە: بچووکیی خۆتان هەمیشە لەیاد بێ! [١٥] .

جۆر و ئاست و توخمە پێکهێنەرەکانی جیهانبینی و دیاردەی ئێتنۆمینتالیتێت دەوەستن لەسەر جۆر و ئاستی هوشیاریی کۆمەڵایەتیی

ئەندامانی ئەو ئێتنۆسە. ئەوەش چونکە هەر کۆمەڵبوونێکی مرۆیی چەسپاو، کە ئەمە ئێتنۆسیش دەگرێتەوە، بەگوێرەی ئەو ڕەوشە کۆمەڵایەتییەی تێیدا دەژی جۆرێك و ئاستێك لە هوشیاریی کۆمەڵایەتی بۆ دروست دەبێ کە بەگشتی دەکرێ بڵێین دەرهاوێشتەی پێکهاتەی مەعریفییە لەو کۆمەڵبوونە مرۆییەدا[١٦] ؛ بەگوتەیەکی تر، هوشیاریی کۆمەڵایەتی ئەو کەش و فەزا مەعریفییەیە کە زاڵە بەسەر ئەو کۆمەڵبوونە مرۆییەدا و ئەندامەکانی لە چوارچێوەیدا پێوەندی، چالاکی، ڕەفتار و هەڵوێست دەنوێنن — ئەوەش ڕێك واتە جیهانبینی و شێوازی بیرکردنەوە. ئاشکراشە کە هەمیشە جۆری مەعریفەی زاڵ لەو کۆمەڵبوونەدا— جا مەعریفەی ئایینی بێت، مەعریفەی زانستی یان هەر مەعریفەیەکی تر، ئەوا ڕەنگدانەوەی زێتر و بەهێزتری دەبێ بەسەر هوشیاریی کۆمەڵایەتییانەوە[١٧] و کەواتە بەسەر جیهانبینییانەوە. لەم ڕووەوە، ئەگەر سەرنج بدەین لە کۆمەڵگای کوردی، کە تیایدا مەعریفەی ئایینی زاڵ و بەرقەرارە[١٨]، زۆر بەڕوونی هەست بە تارمایی مەعریفە و فیکری دینی دەکرێ بەسەر جیهانبینی و شێوازی بیرکردنەوەی ئەندامانییەوە— بۆچوونی ئایینییانە لە لێکدانەوەکانیان، سەرلەبەری قسەکردنیان پڕن لە دەستەواژەی : ئیشاڵڵا، خوداگەورەیە، بەتەمای خودا...، جلوبەرگ و ڕیش بەردانەوە، ژمارەی زۆری مزگەوت و تەکیە و خانەقا، پێگە و دەوری بەهێزی دەزگایەکی فەرمیی وەکو ئەوقاف، حیزبی سیاسیی ئایینی ... بۆیە بەدڵنیاییەوە دەکرێ بڵێین فیکر و مەعریفەی ئایینی زاڵە بەسەر هوشیاریی کۆمەڵایەتیی ئەندامانی کۆمەڵگا و ئێتنۆسی کورد لە کوردستانی باشووردا.

بۆ لێکدانەوەی ئەم ڕەوشە ئێتنۆسایکۆلۆگیایەی ئێتنۆسی کورد دەبێ، بەهەمان میتۆدی ئۆکێ داون، هۆکاری مێژوویی لەبەرچاو بگرین. چەندین سەدەی ژیانی کورد، وەکو ئێتنۆس، لەسایەی یاساکانی خێڵەتی و باوکسالاری، پەرت و بڵاوی و نەبوونی قەوارەیەکی سیاسی ... پێگە و دەوری دەزگای ئایینیی یەکجار بەهێز و چالاك کرد — بوو بە تاقە ئینستیتووتی یەکخەر بۆ ئەندامانی ئەم ئێتنۆسە، بەڕادەیەك کە ئینتیمای ئەمانی بۆخۆیی قۆرخ کردبوو— ڕێکەوت نەبوو کە زۆربەی سەرکردە سیاسی و نەتەوەییەکانی کورد پاشخانی ئایینییان هەبوو ؛

تاو و گوژمی ئینتیمای ئایینی بەسەر کوردانەوە ئێستاش هەر بەرچاوە. بە قسەی مێژوونووس و کوردناسی گەورەی ڕووس خاتوو یی. ئی. ڤاسیلییەڤا "سیمای ئایینی هوشیاریی جەماوەر زەمینەی هەمیشەیی پرۆسەکانی کۆمەڵایەتی– سیاسی و ئیدیۆلۆگی بووە تا دەگاتە سەردەمی ئێستاش ... ئیسلام وەکو ئایینی باڵادەست لە کوردستاندا تەنیا زاڵبوونی جیهانبینیی ئایینی– ئیدیۆلۆگیی دابین نەکردووە، بەڵکو ئیسلام، وەکو هەر ئایینێکی تر، ڕووەو تەقدیسکردنی دەسەڵات و چەسپاندنی بووە".[19] ئەم ڕەوشە مێژووییەی کورد کە ئێستاش، بە هەندێ جیاوازییەوە، هەر لە ئارادایە، بووە بە پاشخانێکی پتەو بۆ بەردەوامبوونی هەمان شێوازی بیرکردنەوە لای ئەندامانی ئەم ئێتنۆسە .

سیماکانی شێوازی بیرکردنەوەی کورد تەنیا ئایینییانە نییە، بگرە بەهەمان ڕادە کۆمەڵایەتی و کولتووریشن– ئەمە جگە لەوەی کە ئایین خۆی دیاردەیەکی کۆمەڵایەتی و توخمێکی کولتووری گیانییە. ئەگەر کەسایەتیی مرۆڤی سویدی هێشتاش ڕزگاری نەبووبێ لە (لادێیزم، گوندیاتی) وەکو ئۆکێ داون بۆی دەچێ، ئەوا پرۆسەی بە مەدەنیبوونی کورد (Urbanization) لەڕاستیدا لەم چەند ساڵەی دوایی دەستی پێ کردووە، ئەویش هەرگیز بەو تاو و گوژمەی سویدییەکە نییە، بۆیە بە دڵنیاییەوە توخم و دەزگا تەقلیدییە پێکهێنەرەکانی بنیادی کۆمەڵایەتی لە کۆمەڵگای کوردیدا هێشتا هەر زاڵ و بەرقەرارن — وەکو : خێزانی گەورە، بنەماڵە، خێڵ، ئاغا و بەگ و موڵکایەتی ؛ ئایینی: مزگەوت، شێخ و تەکیە و خانەقا ؛ دەسەڵاتی پیاو و پیاوەتی ؛ پێوەندییەکانی خوێن، خزمایەتی، دۆستایەتی ... هەموو ئەمانەش، بە ڕای ئێمە، دەکرێ کورت بکرێنەوە لەم دەستەواژەیەدا : کۆمەڵگای پێوەندییەکان، مەرایی و زێدەڕۆیی. ئەگەر سەرنج بدەین، سەرلەبەری مینتالیتێتی ئەندامانی ئێتنۆسی کورد ڕەنگدانەوەی ئەم سێ توخمەن : ڕەچاوکردنی پێوەندییەکان لە ژیانی ڕۆژانەدا، بەتایبەتیش خزمایەتی؛ مەراییکردن و پێداهەڵگوتن؛ زێدەڕۆیی نزیکەی لە هەموو شتێك– لە خۆشەویستی، لە ڕق هەڵگرتن، لە دڵخۆشی، لە خەمباری، لە ئازایەتی، لە ترسنۆکی ... ئەم سێ توخمەش (پێوەندی، مەرایی، زێدەڕۆیی)، وەکو ئاشکرایە، مێژوویین و دوورن لە مەودای کاریگەرییەکانی پرۆسەی

بەمەدەنیبوونـەوە— ئەمانـە لەهـەموو مـاوەی مێـژوودا شـێوازی ژیـانی کوردیـان داڕشـــتووە و کەواتـــە ڕەنگدانـــەوەیان هـــەبووە و هەیـــە لەســـەر شـــێوازی بیرکردنەوەشیان .

لێرەشـدا، پێویسـت دەکـات هەڵوەسـتەیەك بکـەین لەسـەر هەنـدێ لـە بۆچوونەکانی نووسەری کتێبـی "مینتـەلێتی خێـڵ" محەمـەد فـەریق حەسـەن کـە جێگەی دەسخۆشییە خـۆی لـە قـەرەی بابـەتێکی وا گـرنگ و ئـاڵۆز داوە و تیایـدا بەڕادەیەکی باش سەرکەوتوو بووە ؛ وەلێ لەگەڵ هەر هەموو بیر و بۆچوونەکانیدا نین، لەمانە : مەبەستی ناوبراو لە خێڵ، خێڵی ڕەوەند و کۆچەرە و ئاماژەیـەك بـۆ خێڵی نیشتەجێ ناکات کە نموونەیان زۆرن لە کوردستاندا و جیاوازیی بەرچاو هەن لـەنێوان ئـەم دوو کاتیگۆریایـە؛ کۆمـەڵێك سـیفەت و خەسـڵەتی مـرۆی خێڵـەکی ژمـاردوون وەکـو: "خۆڕازاندنـەوەی پیـاوان بـە چـەندین جـۆر چـەك و چـۆل، خـۆ بەزلزانین و گیانی تۆڵە، هەستیاری، فرسەت قۆستنەوە بـۆ ڕاووڕووت، گوێڕایـەڵیی کوێرانە بۆ خێڵ لە بری نیشتمان ... هەموو ئەم ئاکارانە بۆ کۆمەڵگە و تاکی خێـڵ بوونەتە مـۆرك و خەسـڵەتی تایبـەت" [٢٠] و نووسـەر پێشـتریش بڕیـارێکی ڕەهـای داوە کـە " مێنتـەلێتیی کـوردیش بەگشـتی یەکسـانە بـە مێنتـەلێتیی خێـڵ"[٢١]، بڕیارێکی تریش " خێڵ لە بنیاتی کۆمەڵایەتیشدا بستێك نەچـووەتە پـێش "[٢٢] — جارێ ئەو خەسڵەتانەی مرۆی خێڵەکی کە ڕیزی کـردوون دەشـێ تـا ڕابردوویـەکی نـزیکیش ڕاسـتبن، بـەلآم ئێسـتاکە هـەرگیز بـەو ڕادەیـە نـەماون، ئـەوەش لەبـەر هۆیـەکی ڕوون و ئاشـکرا — بنیـادی کۆمەڵایـەتیی خێـڵ گـۆڕاوە !، شـارەکانی کوردستان تـژین لـە خـەڵکی سـەربە خێڵـە جۆراوجۆرەکـان : سورچـی، خۆشـناو، هەرکی، جاف... کە بەسـاڵان سـەردانی دیوەخـانی سـەرۆك خێڵـەکانیان ناکـەن— "خێڵ ئەگەرچـی هێشـتا هەیکـەل و سـتڕوکتور و پێوەندییـە تەقلیدییـەکانی هـەر مـاون ... بـەلآم خێڵـی ئیمـڕۆ گۆڕانکـاریی زۆری بەسـەردا هـاتووە و ئەندامـەکانی پێوەنـدیی ئـابووریی نیمچـە بۆرژوازییانـە بەڕێوەدەبـەن، ئەمـە تەنانـەت خێڵـە "کۆچەرەکانیش"**** دەگرێتەوە. سەرۆك خێڵی دەرەبـەگ ئیمـڕۆ شانبەشـانی ئەوەی لە لادێ موڵـك و ئـاژەڵی هەیـە، خـۆی نشـیمەنی شـارە و خـانوو و بـەرەی زۆری لـە شـاردا هەیـە و ڕەنگـە چـەند کارگەیەکیشـی هـەبێت، لـەپاڵ ئەمەشـدا

بازرگانییەکی چالاکانە دەکات و بۆی هەیە سەرکردایەتیی حیزبێکی سیاسیش بکات، یان هەرنەبێ ئەندام بێت تیایدا و بەمەشەوە دەورێکی سیاسی دەگێڕێ و نیمچە دیپلۆماسییەتێکی نێودەوڵەتیش بەڕێوە دەبات؛ هەرچی ئەندامانی تری خێڵن ئەوا سەربەستن لە هەڵبژاردنی چالاکیی ئابوورییاندا و وەکو جاران توند بە موڵك و ماڵ و فەرمانی ئاغاوە نەبەستراونەتەوە ... لە گەلێ ناوچەی کوردستاندا سەرۆك خێڵ، دەرەبەگ، ئاغا و شێخی وا هەن کە لەگەڵ ئەوەی لە ڕووی ئابوورییەوە لێی کەوتوون، بەڵام جۆرە پێوەندییەکی خزمایەتی و بنەماڵەیی جاریێ هەندێ سیمای پاراستوون " [٢٣]. بۆیە ئێمە لەکاتێکدا جەخت لەسەر دەور و کاریگەریی هێشتا بەهێزی پێوەندیی خزمایەتی دەکەینەوە، لە هەمان کات ئەو سیما و خەسڵەتە خێڵەتییانەی نووسەری "مێنتەلێتیی خێڵ" دەیانداتە پاڵ مرۆی کوردی ئیمڕۆ، بەڕای ئێمە، دەکرێ وەکو ئاسەوار و بەڕادەی جیاواز تەماشایان بکەین .

بێگومان ئەم شێوازی بیرکردنەوەیە لە کۆمەڵگای کوردیدا، ئەوەی لەسەرەوە ئاماژەمان پێدا و توخمە سەرەکییەکانی بریتین لە (پێوەندی، مەرایی و زێدەڕۆیی)، بەردەوام دەبێ تا ڕەوشی "مێژوویی" ئێستای ئێتنۆکولتووری و ئێتنۆسایکۆلۆگیی ئێتنۆسی کورد وەکو خۆی بمێنێتەوە ؛ لەگەڵ بەگەڕ کەوتنی پرۆسەی بەمەدەنیبوون و دەرهاوێشتەکانی، زێتر لە هەمووشیان هاتنەپێشەوەی مەعریفەی زانستی و بەرقەراربوونی، بەمەشەوە گۆڕان و بەرزبوونەوەی ئاستی هوشیاریی کۆمەڵایەتی لە کۆمەڵگای کوردیدا، ڕەوشی ئێتنۆکولتووری و ئێتنۆسایکۆلۆگی دەگۆڕێ و شێوازی بیرکردنەوەی کوردیش ڕووبەڕووی وەرچەرخانی شایستە دەبێتەوە. لە ڕاستیشدا ئەم پرۆسەیە، واتە مەدەنیبوون، لە کۆمەڵگای کوردیدا دەستی پێ کردووە و هەست بە سەرەتاکانی دەکرێت، ئەویش بەهۆی گوشارەکانی دیاردەی جیهانگیری (عولمە)وە کە هەموو دنیای گرتۆتەوە ؛ هەرچەندە " کرانەوەی ئابووری و سیاسی و ڕۆشنبیری بەڕادەیەکی دیار شێوازی ژیانی لە کۆمەڵگای کوردی لە کوردستانی باشووردا گۆڕیوە، بەڵام ئەم کۆمەڵگایە هێشتا لە ڕۆژگاری وەرچەرخاندایە کە سیما هەرە سەرەکییەکەی تێکهەڵکێشبوونی دیاردە کۆن و نوێیەکانە "[٢٤]

## ئه نجامگیری

١- بابەتی سەرەکیی ئێتنۆگرافیا، کە لایەنی ئێتنیکی (نەتەوەیی) کۆمەڵبوونە مرۆییەکانە، پێوەندیی هەیە بە زۆربەی بوار و لایەنەکانی ژیانی کۆمەلآیەتی و بۆیەش لقی زانستیی ئاوێتەی دروست کردوون، وەکو : ئێتنۆلینگڤیستیکا، ئێتنۆبۆتانیکا، ئێتنۆسایکۆلۆگیا ...

٢- کولتوور دیاردەیەکی کۆمەلآیەتییە و ڕەهەندی دەروونی هەیە، دەروونیش دیاردەیەکی تاکەکەسییە بەلآم زەمینە و بنەمای کۆمەلآیەتی هەن. هەردووکیشیان، کولتوور و سایکۆلۆگیا، دەور و کاریگەریی ئێتنیکی دەنوێنن.

٣- بنچینە و بنەمای ئێتنۆمینتالیتێت کولتوورە کە کەش و فەزایەکی سایکۆلۆگیی هاوبەش بۆ ئەندامانی ئێتنۆس دادێنێ تیایدا شێوازی بیرکردنەوەکانیان سیمای هاوبەشیان دەبێ و ئەمیش، واتە شێوازی بیرکردنەوەی هاوبەشیان، جیهانبینییەکی کۆمەڵییان بۆ فەراهەم دەکات .

٤- جۆر و ئاست و توخمە پێکهێنەرەکانی دیاردەی ئێتنۆمینتالیتێت دەوەستن لەسەر جۆر و ئاستی هوشیاریی کۆمەلآیەتیی ئەندامانی ئێتنۆس- ئەمەی دواییش، هوشیاریی کۆمەلآیەتی، شەقڵ و سیمای مەعریفەی باو لە ئێتنۆسەکەدا وەردەگرێ .

٥- بۆ لێکدانەوەی ڕەوشی ئێتنۆسایکۆلۆگیای ئێتنۆسی کورد دەبێ هۆکاری مێژوویی ڕەچاو بکەین.

٦- ڕەوشی ئێتنۆکولتووری و ئێتنۆسایکۆلۆگیی کورد پێوەندیی بە پرۆسەی مەدەنیبوونەوە هەیە.

٧- بەگەڕکەوتنی پرۆسەی بەمەدەنیبوون و دەرهاوێشتەکانی، زێدەبوونی ئاست و دەوری مەعریفەی زانستی ڕەوشی ئێتنۆکولتووری و ئێتنۆسایکۆلۆگی دەگۆڕێ و شێوازی بیرکردنەوەی کوردیش ڕووبەڕووی وەرچەرخانێکی شایستە دەبێتەوە .

٨- بوار و لایەنی ئێتنیکی بایەخی چارەنووسسازیان هەیە بۆ ئێتنۆس، بۆیە شایانی شارەزایی، ئاگالێبوون، چاودێری و پلانرێژکردنن .

## پەراوێز

*(١) ئێتنۆس چەمکێکی زانستی ئێتنۆگرافیایە بەکاردێت بۆ هەر کۆمەڵبوونێکی مرۆیی خاوەن نیشانە و ماکی ئێتنیکی (نەتەوەیی) تایبەت بە خۆی کە بەهۆیانەوە جیابکرێتەوە لە کۆمەڵبوونەکانی ترەوە (بڕوانە : د. ڕەشاد میران. ئێتنۆگرافیا و یەکێتی ئێتنیکیی کورد. دەزگای ئاراس، هەولێر ٢٠٠٩ل١٢ و ٤٦) .

2- Svod Etnografichskikh Ponyatiy I Terminov; Etnografya I Smejhniye Displini. Red.M.V. Kryokov, E. Zelnov. Moskva, Nawka,1988, P.84-85

٣- د. ڕەشاد میران. ڕەوشی ئایینی و نەتەوەیی لە کوردستاندا، چاپی ٢ سەنتەری برایەتی، کوردستان٢٠٠٠، ل٢١٠

٤- Svod Etnografichskikh Ponyatiy I Terminov. Ibid. P.88,97,109, 110

٥- كيريلينكو كورشونوفا. ماهي الشخصية ؟ ترجمة موفق الدليمي، دار التقدم، موسكو ١٩٩٠، ص٣١، هەروەها بڕوانە :

Eric Trist; Culture as a Psycho-Social Process www.moderntimesworkplace.com/archives.

John Perry, Erna Perry ; Contemporary Society. An introduction to social science.11Ed.Boston2006,p.51

٦- بروملية، بودولني. الاثنوس والتأريخ. ترجمة طارق معصراني، موسكو، دار التقدم ١٩٨٨، ص٨٩

٧- جان ميزونوف. علم النفس الاجتماعي. منشورات عويدات بيروت- باريس، ط٢، ١٩٨٢، ص٦٧

8- Etnopsikhologya Kak Nawuka ob Etnichiskoi Samoorganizatsi. //cstaip.virtbox.ru/info/basidideas.htm.12/11/2010, p.3

** بێگومان مەبەست لە وشەی "هاوبەش" هەرگیز ئەوە نییە کە هەموو تاکەکان کتومت وەکو یەك بیربکەنەوە، بەڵکو مەبەست هەبوونی چوارچێوەیەکی گشتییە بۆ هەمووان کە تیایدا بیرکردنەوەکانیان سیمای هاوبەش لەخۆ دەگرن .

*** دەنگی (ج) لەکوردیدا سووك دەردەکەوێ وەکو لە ناوەکانی : جوان، جەمیل، جەنجەڕ، کونجی... هەرچی لە عەرەبییە ئەم دەنگە هەندێ قورسترە، کوردێك کە وشەی سۆسیۆلۆجیا دەخوێنێتەوە دڵنیام (ج)ەکە بە شێوەی جوان و جەمیل دەردەبڕێ - ئەوەش تابڵێی نەشازە. نووسەرێك بۆ وشەی Pedagogy ، واتە پەروەردە،

نووسیویەتی (پێدەگۆجی) — (بڕوانە : کامیار سابیر، لینگوا فرانکای کوردیی — زمانی ستاندەرد و فەرمی. ٢٠٠٩ بێ ناوی شوێنی چاپ، ل٢١٣) لەکاتێکدا، ئینگلیز نەبێ، ئاخێوەرانی هەموو زمانانی تر ڕووس، سویدی، ئەڵمان، ئیتالی... بە (گ G) ی لاتینی یان گرێکی دەنووسن (پێدەگۆگیا) کە هەرخۆشی وشەکە گرێکیی کۆنە .

9- U.V. Bromley; Ocherki Teori Etnosa. Moskva, Nawuka1983.p.169

Kon E.S.; Natsionalni Kharakter- Mif eli Realnost?- Inostrannaya

10- Letratura.1968,n.9p.218

١١– غالینا اندرییفا. البسیکولوجیا الاجتماعیة. موسکو، دار التقدم، ١٩٨٨، ص٢٢٤–٢٢٥

١٢– U. B. Bromley;Ibid .p.156-157

13- David Gaunt, Orvar Lofgren ; Myter om Svensken. Stockholm1984, p. 7

14- °Ake Daun; Svensk Mentalitet- Ett jamforande prespektiv.Simrishamn,1989.p.264

15- Ibid; 264- 265

١٦– د. ڕەشاد میران. مەعریفە و تاک و کۆمەڵ – لە ڕوانگەی سۆسیۆلۆگیای مەعریفەوە. هەولێر، ئاراس ٢٠١٢، ل ٤٨

١٧– هەمان سەرچاوە

١٨ـ د. ڕەشاد میران. چەند بابەتێکی ئێتنۆکۆمەڵایەتی. بەرگی ١، دەزگای موکریانی، هەولێر ٢٠١٠، ل٣٧– ٤٢

١٩– ی. ئی. ڤاسیلیەڤا. کوردستانی خوارووی ڕۆژهەلات– لە سەدەی حەڤدەوە تا سەرەتای سەدەی نۆزدە. وەرگێڕانی د. ڕەشاد میران. چاپی ٢، ئاراس، هەولێر ٢٠٠٩، ل ٢٣١

٢٠ـ محەمەد فەریق حەسەن "مێنتەلێتیی خێڵ"، هەولێر، دەزگای ئاراس ٢٠٠٨، ل ٣١٩–٣٢٠

٢١ـ هەمان سەرچاوە ل٣٠٩

٢٢ـ هەمان سەرچاوە ل ٣٢٣

٢٣ـ د. ڕەشاد میران، سیماکانی گۆڕانکاری لە کۆمەڵگای کوردیدا. گۆڤاری (زانکۆ) ی زانستە مرۆڤایەتییەکانی زانکۆی سەلاحەدین، ژمارە (٣) ساڵی ٢، ١٩٩٨ ل ٥٨

٢٤- د. ڕەشاد میران "مەعریفەی ڕۆژگاری ئێستا و دەرهاوێشتەکانی لە کۆمەڵگای کوردیدا "- گۆڤاری زانکۆی سەلاحەدین بۆ زانستە مرۆڤایەتییەکان، ژمارە (٥٣) ٢٠١٢، هەولێر، ل٩١- ٩٢

**** وشەی (نیمچە کۆچەر) ڕاستترە، چونکە کۆچەر بەو خێڵانە دەگوترێ کە نشیمەنی چەسپاویان نییە و بۆ هەمان شوێن ناگەڕێنەوە، بە پێچەوانەی خێڵی کوردی، "چەمکی (کۆچەری) لە کوردستاندا مانای شێوەی ژیان و ئابوورییەکی وا نادات کە لە بزووتنەوەی هەمیشەییدا بێت. ژمارەی قۆناخەکان لە ئۆردوگایەکەوە بۆ ئەویتر و جێگەکانیان، هەروەکو ڕێگەکەشی، بە ڕێکی دیاری کراون "- ی. ئی. ڤاسیلیەڤا، هەمان سەرچاوە، ل ١٢

## سەرچاوە

**بەزمانی کوردی :**

١– د. ڕەشاد میران. ئێتنۆگرافیا و یەکێتیی ئێتنیکیی کورد. دەزگای ئاراس، هەولێر ٢٠٠٩

٢– د. ڕەشاد میران. ڕەوشی ئاینی و نەتەوەیی لە کوردستاندا، چاپی ٢ سەنتەری برایەتی، کوردستان٢٠٠٠

٣– د. ڕەشاد میران. مەعریفە و تاك و کۆمەڵ – لە ڕوانگەی سۆسیۆلۆگیای مەعریفەوە. هەولێر، ئاراس ٢٠١٢

٤– د. ڕەشاد میران. چەند بابەتێکی ئێتنۆکۆمەڵایەتی. بەرگی ١، دەزگای موکریانی، هەولێر ٢٠١٠

٥– د. ڕەشاد میران "مەعریفەی ڕۆژگاری ئێستا و دەرهاوێشتەکانی لە کۆمەڵگای کوردیدا "– گۆڤاری زانکۆی سەلاحەدین بۆ زانستە مرۆڤایەتییەکان، ژمارە (٥٣) ٢٠١٢، هەولێر.

٦– د. ڕەشاد میران، سیماکانی گۆڕانکاری لە کۆمەڵگای کوردیدا. گۆڤاری (زانکۆ) ی زانستە مرۆڤایەتییەکانی زانکۆی سەلاحەدین، ژمارە (٣) ساڵی ٢، ١٩٩٨

٧– ی. ئی. ڤاسیلیەڤا. کوردستانی خوارووی ڕۆژهەلآت– لە سەدەی حەڤدەوە تا سەرەتای سەدەی نۆزدە. وەرگێڕانی د. ڕەشاد میران. چاپی ٢، ئاراس، هەولێر ٢٠٠٩

٨– کامیار سابیر. لینگوا فرانکای کوردیی – زمانی ستاندەرد و فەرمی. ٢٠٠٩ بێ ناوی شوێنی چاپ

٩– محەمەد فەریق حەسەن "مێنتەلێتیی خێڵ "، هەولێر، دەزگای ئاراس ٢٠٠٨،

**بەزمانی عەرەبی :**

١٠–كيريلينكو كورشونوفا. ماهي الشخصية ؟ ترجمة موفق الدليمي، دار التقدم، موسكو ١٩٩٠

١١– بروملية، بودولني. الاثنوس والتأريخ. ترجمة طارق معصراني، موسكو، دار التقدم ١٩٨٨

١٢– غالينا اندرييفا. البسيكولوجيا الاجتماعية. موسكو، دار التقدم، ١٩٨٨

١٣–جان میزونوف. علم النفس الاجتماعي. منشورات عويدات بيروت– باريس ١٩٨٢

**بەزمانی ڕووسی :**

14- Svod Etnografichskikh Ponyatiy I Terminov; Etnografya I Smejhniye Displini. Red.M.V. Kryokov, E. Zelnov. Moskva, Nawka,1988, P.84-85

15- Etnopsikhologya Kak Nawuka ob Etnichiskoi Samoorganizatsi. //cstaip.virtbox.ru/info/basidideas.htm.12/11/2010, p.3

16- U.V. Bromley; Ocherki Teori Etnosa. Moskva, Nawuka1983

17- Kon E.S.; Natsionalni Kharakter- Mif eli Realnost?- Inostrannaya Letratura.1968,n.9

**بەزمانی ئینگلیزی :**

18- Eric Trist; Culture as a Psycho-Social Process. www .moderntimesworkplace.com/archives

19- John Perry, Erna Perry ; Contemporary Society. An introduction to social science.11Ed.Boston2006

**بەزمانی سویدی :**

20- David Gaunt, Orvar Lofgren ; Myter om Svensken. Stockholm1984

21- °Ake Daun; Svensk Mentalitet- Ett jamforande prespektiv.Simrishamn,1989

## ملخص البحث

# الظواهر الاثنوثقافية و الاثنوسايكولوجية في المجتمع الكردي و آليات التفاعل بينها

**أ.م. د. رشاد ميران**
**جامعة صلاح الدين– أربيل/ كلية الآداب**
**قسم علم الاجتماع**

يتناول البحث جانبين من أهم جوانب الحياة الاجتماعية في المجتمع وهما : الثقافي والسايكولوجي وإبراز الدور والوظيفة الاثنية (القومية) لكليهما وتأثيراتهما على الافراد ومسار حياتهم، ومن ثم معرفة العلاقة بين هذين الجانبين وكيفية التفاعل بينهما .

يتناول البحث ايضا أهمية الجانب الاثني في حياة الشعوب (الاثنوس) واظهار الشروط والعلامات الاثنية الضرورية لتكوينها، وذلك من خلال التطرق الى مجالات البحث في علم الاثنوغرافيا حيث انها تشمل، تقريبا، جميع مجالات الحياة للشعوب ويتبين هذا في ظهور فروع علمية ضمن الاثنوغرافيا مثل: اثنوبوتانيكا، اثنوزوؤلوجيا، اثنولينكفيستيك، اثنوسايكولوجى ...

ثم يأتي البحث الى العلاقة بين الظاهرتين : الثقافة والجانب النفسي، والتداخل بينهما في التأثير على الافراد، واظهار ذلك بالاخص في ظاهرة الذهنية الاثنية السائدة لدى افراد الاثنوس ( و هنا الاثنوس الكردي) التي بموجبها يفكر ويتصرف الافراد ويتخذون المواقف. وفي الخاتمة يدرج الباحث عدة نتائج التي توصل اليها من خلال مجمل البحث .

# Abstract

**Ethnocultural&Ethnopsychological Phenomena**
**In Kurdish Society& Mechanisms of Interaction**

Asst. Professor Dr. RashadMiran
Salahadin University- Hawler

This research addresses two most important aspects of social life in society, namely culture & ethno psychology. It highlights the ethnic role and function of both; its impact on the individuals, and the course of their lives, then identifies the relationship between them.

The study also addresses the importance of the ethnic background in the people's lives& shows signs and conditions necessary for the existence of the ethnos, and through raising the research areas in ethnography which cover almost all spheres of people's life & can be seen in the emergence of disciplines within ethnography like: ethno botany, ethno zoology, ethno linguistics, ethnopsychology,etc.

Following this, the study seeks to highlight the relationship between the two phenomena: cultural & psychological aspects, and the overlap between them to influence individuals, showing that especially in the ethnic mentality of Kurdish ethnos, under which Kurds think, act & take positions.

In the conclusion, there is a list of several results reached by the researcher throughout the research.

# دوورخستنەوەی ڕێبەرانی کورد لە دەوڵەتی عوسمانی ١٨٤٧- ١٩١٤

م. ی. ئەحمەد محەمەد ناسر(ئەحمەد باوەڕ)
زانکۆی گەرمیان - فاکەڵتی پەروەردە

**پێشەکی**

کورد لە قۆناغە جیاجیاکانیدا، تووشی جۆرێك لە سیاسەتی دوورخستنەوە و لێك دابڕان و کۆچپێکردنی زۆرەملێ بۆتەوە. ئەم دیاردەیە لە قۆناغی نوێ و هاوچەرخدا خەستتر و فراوانتر دەبێتەوە.

ئەم پرۆسەیە لە ماوەی فەرمانڕەوایەتی عوسمانی، لەو دەمانەوە کەوتوونەتە ئەوەی کۆتایی بەدەسەلاتی میرنشینە کوردییەکان بهێنن، بە تایبەتی ئەوانەیان کە لە سنوورەکانی ئەواندا کاروباریان بەڕێوە دەبرد و گەڕانەوەی سینترالیەتی عوسمانی بۆ ناوچەکان. ئەوە بوو لە چوارچێوەی ئەم هەولانەی فەرمانڕەوایانی عوسمانیدا و لە ئەنجامی ئەو هێرشە سەربازییەی کە بە پالپشتیی ولاتانی وەك ڕووسیا و بەریتانیا دەستی پێکردبوو، توانی کۆتایی بەدەسەلاتی میرنشینەکانی سۆران لە ١٨٣٦، بۆتان ١٨٤٧، هەکاری ١٨٤٩، بابان ١٨٥١ دا بهێنێ، شان بەشانی ئەوە و هەر لەم قۆناغەدا سیاسەتی دوورخستنەوەی بەرامبەر کەسایەتی و ڕێبەرانی کورد و تەنانەت دانیشتوانی کوردستانیش بەکار هێنا، کە لە چوار چێوەی ئەم لێکۆڵینەوەیەدا چەندین نموونەی زیندوو باسی لێوە دەکەین و بە کورتی لەسەریان دەدوێین، هەرچەندە پلان و سیاسەتێکی لەم جۆرە، لە قۆناغەکانی دواتردا و تەنانەت ئەمڕۆشی لەگەڵدابێ، بەردەوامە و نەیاران و داگیرکەرانی کوردستان بە بەردەوامی لەسەری ڕۆیشتوون و درێژەیان پێداوە، ڕێبەر و سەرکردەکانی کوردیان بە خاو و خێزانەوە، لە دانیشتوان و

کۆمەڵانی خەڵك دابڕیوە، لەوانە: دوورخستنەوەی بەدرخان پاشای بۆتان، مەحموودخانی موکسی، نورولڵا بەگی هەکاری، یەزدان شێر، شێخ عوبێدوڵڵای نەهری و عەبدولڕەزاق بەدرخان پاشا، هەروەها لە ساڵانی جەنگی یەکەم، بەدواوە قۆناغی دوورخستنەوەکانی: شێخ مەحموودی حوکمداری کوردستان، شێخ ئەحمەدی بارزانی، عوسمان سەبری و سەعیدی نوورسی دێن، بەڵام تۆژەر لەم نووسینەیدا تەنها جەخت لەسەر کۆتاییەکانی فەرمانڕەوایەتی عوسمانی دەکاتەوە و وردەکارییەکانی ئەوانی دی دەهێڵینەوە و لە لێکۆڵینەوەیەکی تردا لە سەریان دەدوێین.

**بەدرخان پاشای بۆتان لە نێوان ڕا پەڕین و دووره وڵاتیدا ١٨٤٧-١٨٦٨:**

لەوکاتەوە ڕاپەڕینی میر بەدرخان پاشای کوڕی میر عەبداڵ خان (١٨٢١-١٨٤٧) سەری هەڵدا، دەمێك بوو، کوردستان لە نێوان هەر دوو فەرمانڕەوایەتی عوسمانی و ئەو بنەماڵانەی کاروباری ئێرانیان کەوتە دەستەوە، هەر لە سەفەوی (١٥٠١-١٧٣٦)، ئەفشاری (١٧٣٦-١٧٤٨)، زەندی (١٧٥٠-١٧٩٤) و قاجاری (١٧٩٦-١٩٢٥) دابەش کرابوو، بەڵام ئەم میرنشینە لەماوەی (١٨٤٢-١٨٤٧) لە ترۆپکی هێز و دەسەڵاتیدا بوو، بەوەی توانیبووی فەرمانڕەوایەتییەکی کوردی دابمەزرێنێ و لە هەمان کاتدا سنووری دەسەڵاتەکەی هەموو شار و ناوچەکانی مووسڵ لە تەوەری باشوور و سنە لە لای ڕۆژهەلات و، دیار بەکر و سیورەك و وێران شار لە لای ڕۆژئاوایەوە بگرێتەوە، لە چوارچێوەی دەسەڵاتەکەشیدا سکە و دراوی تایبەت بە خۆی هەبوو وەك ئەوەی لە ڕوویەکیدا نووسرابوو: (میری بۆتان بەدرخان) لە ڕووەکەی تریشیدا ساڵی ١٢٥٨ی کۆچی لەسەر هەڵکۆڵراوە[1].

لەگەڵ بەرپابوونی ڕاپەڕینەکەشیدا، بە زۆری ئەو هۆز و سەرۆك هۆزانەی کە بوونە یاریدەدەر و هاوپەیمانی بەدرخان پاشا بە زۆری سەرۆکی کوردانی ناوچەی هەکاری نوورڵڵا بەگ و سەرۆکی کوردانی موکسی خان مەحموود بوون. هەروەها لەبەر بایەخ و هەڵکەوتەی شاری (جەزیرە) کە دەکەوتە سەر ڕووباری دیجلەوە و لەڕووی گەشەکردن و کاروانی بازرگانییەوە تایبەتمەندیی

خۆی هەبوو کردییە پایتەختی دەسەڵاتەکەی، بەڕادەیەك هەموو ئەو ڕەگەز و ئاینانەی کە دانیشتوانی ئەم شارەیان پێك دەهێنا، ژمارەیان دەیکردە نزیکەی (٢٥٠٠) بنەماڵە، لە کورد، ئاشووری، ئەرمەنی بە ئاسوودەیی دەژیان[٢]. یەکێك لەو هەنگاوانەی کە بەدرخان پاشا نای بە ئاراستەی یەکخستنەوەی هۆز و میرە کوردەکاندا، بۆ ڕوو بە ڕووبوونەوەی فەرمانڕەوایانی عوسمانی، مۆرکردنی (پەیماننامەی پیرۆز) بوو کە بەپێی بنەماکانی، هەوڵ و تێکۆشانێکی هاوبەشیان لەگەڵ ئەو پێڕۆ سیاسییەی بەدرخان پاشادا دەهاتەوە کە دەیەویست لە ئایندەدا قەوارەیەکی تایبەت بەخۆی پێکەوە بنێ[٣].

لە ڕێگای ئەو هێزەشەوە کە پێکەوەی نا، بەدرخان پاشا توانی بکەوێتە بەربەستکردنی شەڕوشۆڕی ناوخۆی هۆزە کوردەکان و بۆ ئەم مەبەستە زانا و مەلا و حەکیمە ناودارەکانی، بەکار دەهێنا، ئەوانەی بیر و ڕاکانی بەدرخانیان بڵاو دەکردەوە[٤]. لە لایەکی دی، بە مەبەستی ڕوو بە ڕووبوونەوەی نەیارەکانی، میر بەدرخان پێویستی بە هێزی تۆکمەی سوپایی و خۆ ئامادەکردنی تەواو هەبوو لەم بوارەدا، سەرەڕای دەستەبەرکردنی پێداویستییەکانی لە چەك و تەقەمەنیی جۆر بەجۆر. لەم لایەنەشەوە و لە شاری جەزیرەی پایتەختدا، دوو کارخانەی گرنگی دامەزراند، یەکەمیان: بۆ دروستکردنی چەك و تەقەمەنی و ئەوی کەشیان بۆ دروستکردنی باروت، لە کاتێکدا هەموو ئەمانە پێویستییان بە کەسانی شارەزا و تایبەت هەبوو بۆ ئەوەی بتوانێ لەم ڕووەوە درێژە بە بەرهەمهێنان و پێشخستنی کارخانە و کەرەستە جەنگییەکانی بدا، ئەمە وێڕای ئەوەی لە دەریاچەی واندا کەوتە پێشخستنی لایەنی دەریاوانی و هونەرەکانی دەریاوانی و ناردنی فێرخوازی کورد بۆ ئەوروپا، بۆ ئەوەی بتوانن لەم بوارەدا شارەزایی پەیدا بکەن. ئەمەش وەك ئەو چاولێکەری و نەریتە بوو کە محەمەد عەلی پاشا (١٧٦٩ – ١٨٤٩)ی، لەکاتی فەرمانڕەوایەتی و یاخیبوونەکەیدا لە دەوڵەتی عوسمانی، گرتیە بەر و کۆمەڵێك لاوی ئەوکاتەی میسری نارده ئەوروپا[٥].

ئەم هەنگاوانەی کە میر بەدرخان نای، فەرمانڕەوایانی عوسمانی، بە تەواوی خستە مەترسییەوە، وای لێ کردن بە هەر نرخ و پلانێك بێ سنوورێك بۆ میر بەدرخان و دەسەڵاتەکەی دابنێن. یەکێك لەوانە نانەوەی دووبەرەکی بوو لەنێوان کورد و ڕەگەزەکانی تری وەك ئاشووری و ئەرمەنیدا، تا وایان لێ بکەن لە دەسەڵاتی میر بەدرخان یاخی بن و باجی نەدەنێ، بەڵام لە مەیاندا سەرکەوتوو نەبوون، بەوەی میر بەدرخان کەسایەتییەك بوو لەگەڵ هەموو بۆچوون و تایەفەیەکی ئاییندا دەگونجا و جیاوازی لە نێوانیاندا نەدەکرد، بۆ نموونە لە شوێنێکی وەك جەزیرەی ناوەندی دەسەڵاتەکەیدا، بەپێی لێکدانەوەی سەرچاوەکان (٥٠) خێزانی کرستیان لە هەمان کاتیشدا کڵێسەی تایبەت بە خۆیان و تەنانەت لەو فەرمانڕەوایەتییەشدا ئەرمەنەکان پێگەیەکی بەرچاویان هەبوو، لەبەر ئەوەی ئەمانە دەستێکی باڵایان هەبوو لە بازرگانی و پیشەسازیی هەمەجۆردا، بڕیاری دا کاروباری ئابووری وڵاتەکەی بخاتە ژێردەستی ئەوانەوە و لەلایەکی ترەوە ژمارەیەکی زۆر ئەرمەن لە ڕیزی سوپاکەیدا بوون، کە بە زۆری خەڵکی ناوچەی دیخ بوون(٦). هەرچەندە لەلایەکی دییەوە هەندێ سەرچاوە ئاماژە بۆ ئەوە دەکەن، هەوڵەکانی فەرمانڕەوایانی عوسمانی لە نانەوەی تۆوی دووبەرەکیی کورد و کرستیان و ئێزیدییەکاندا، بۆ ئەوە بووە، سەرنجی وڵاتانی بیانی بۆ ئەوە ڕابکێشێ، لە لەناوبردنی دەسەڵاتەکەی بەدرخاندا هاوکاریان بن. لە ئاگر خۆشکردنێکی لەم شێوەیەشدا والی مووسڵ (محەمەد پاشای قەرتەلی) ڕۆڵێکی بەرچاوی دەگێڕا و، هەموو لێکدانەوەیەکی بۆ ئەوە بوو، کوردەکان و نەستوورییەکان یەکدی لاواز بکەن و ببێتە مایەی ئەوەی ئەوان بە ئاسانی بتوانن چیاکان داگیر بکەن(٧). ئەوە بوو هەر لەساڵی ١٨٤٤ەوە سوڵتانی عوسمانی پلانی ئەوەی داڕشت بە یەکجاری (میرنشینی بۆتان) لە ناو بەرێ، بۆ ئەم مەبەستە سوپایەکی بە سەرۆکایەتی عوسمان پاشا پێك هێنا، ئەمیش بڕیاری دا، هێزەکانی بکات بەدوو بەشەوە بۆئەوەی بە ئاسانی بتوانێ دەست لە هێزەکانی کورد بوەشێنێ، بۆ ئەو مەبەستە بەشی یەکەمیانی خستە وانەوە

و ئـــەوی کەشــیانی خســـتە دیاربـــەکرەوە، فەرمانـــدەی گشـــتی لەشـــکریش بارەگاکەی خۆی لە ئەرزڕۆمەوە بۆ گواستەوە[٨].

ئەو هێزە تورکییـەی کـە لـەو دەمانـەدا لـە ناوچـەی وان بـوو، لـە سـاڵی ١٨٤٦ەوە هێرشیان کـردە سـەر هـەرێمی (هـەکاری – مـەکس) و هێزەکـانی نوورڵلاّ بەگ و خان مەحموودیان بەرەو چیاکان ڕاونا، سەربازەکانیان زۆر بێ ڕەحمانـــە کەوتنـــە قەلاّچـــۆکردنی دانیشـــتوانی ناوچـــەکە و تـــەختکردنی گونـــدەکانیان. لـــەم لایەنەشـــەوە تەنانـــەت بـــەزەییان بـــە ئەرمـــەنی و ئاشوورییەکانیشـدا نەدەهاتـەوە، دوای پێکـدادانێکی دڕندانـەی خوێنـاوی، بەرگریکردنی کوردەکان لە ناوچەکەدا دای لە کزی و تێك شکێنرا. هەرچەندە کەسێکی وەك میر بەدرخان یەکێك لە هەوڵەکانی ئەوە بوو، بتـوانێ یارمـەتی لە ئێرانی قاجاری وەربگرێـت و پـەنا بـۆ ئـەوان ببـات، بـەلاّم ڕووسـەکان لای خۆیانـــەوە وایـــان لێـــك داوەتـــەوە، هەڵوێســـتێکی لـــەم جـــۆرە:((کێشـــەی نێودەوڵـەتی لێ دەکەوێتـەوە)) بۆیـە لێپرسـراوانی ڕووس ئێرانیـان هۆشـیار کردۆتـەوە، بـەوەی خـۆی لـە بـەدرخان بـەگ نەکاتـە خـاوەن و ئێـرانیش ((دەرگاکانی خۆی بەڕووی بەرخودانی کوردا کلۆم دا))[٩]. لە لایـەکی تـرەوە هەرچەندە هێزەکانی کورد توانییان بەرگرییەکی بێ وێنە بکەن، بەلاّم بەهۆی نـەمانی چـەك و تەقەمـەنی و خـۆراکی پێویسـت و بلاّوبوونـەوەی نەخۆشـی کۆلێرا لە ڕیزەکانیاندا و تەنانەت لـەناو هێزەکـانی عوسمانیشـدا، لـە سـەروو ئەوەشەوە، بەتایبەتی لە ٢٩/٥/ ١٨٤٧ دا کەسـایەتییەکی وەك یەزدانشـێری کوڕی سەیفەدین بـەگ، کـە هـەر لـە بنەماڵـەی بـەدرخان پاشـا بـوو، لەگـەڵ نوورڵلاّ بەگی خەزووری و چەند کەسایەتی و سەرۆك هۆزێکی کـورددا، دایانـە پاڵ تورکەکان. بەسەریەکەوە هەموو ئەمانە بوونـە مایـەی ئـەوەی بـەدرخان پاشـا و هاوەڵـەکانی بـە ناچـارییەوە لـە ٢٠ی تـەمووزی ١٨٤٧ەوە، خۆیـان بدەنە دەستی تورکەکان و هێزەکانی عوسمان پاشـاوە، لـە وێشـەوە لەگـەڵ ئەندامانی خێزانەکانیاندا دوور خرایـەوە بـۆ ئەسـتەمبوڵ. هەرچـەندە پـێش ئەوەی شەڕ بەرپا ببێ، خەیرەدین پاشای والی دیاربەکر کەوتە هەوڵی ئەوەی مـیر بـەدرخان خـۆی بداتـە دەسـتەوە و، لـەڕێگای گـەلێك کەسـایەتی ئـەو

دەمانەوە کەوتە نامە ناردن و پەیوەندی پێوەکردن بەوەی ئەو دەتوانێ، لێبووردن بۆ خۆی و کەسوکاری لای سوڵتانی عوسمانی دەستەبەر بکا. بەڵام پلانەکەی سەرکەوتنێکی ئەوتۆی بەدی نەهێنا و هەریەك لە بەدرخان پاشا و مەحموود خان و هەموو ئەوانەی لە گەڵیاندا بوون بە دیل گیران(١٠). بەڕادەیەك هەموو ئەوانەی بەدیلی ڕادەستی ئەستەمبووڵ و (دەرسەعادەت) کران ژمارەیان (١٢٥) کەس بوو، لەوانە (١١)یان سەر بە مەحموود خان و (١١٤) کەسی تریان لە دەستە و تاقمی بەدرخان پاشا بوون. بەڵام خێزان و براکانی مەحموود خان دواتر ڕەوانەی ئەستەمبوڵ کران بۆیە ناویان لەگەڵ ئەمانەدا نییە و یازدە کەسەکە ئەمانەن: ((مەحموود خان، عەبدولعەزیزی کوڕی، عەبداڵ بەگی برای، میر شێخۆی برای، عەبدولڕەزاقی برای، خالید بەگی میری کیسان، مستەفا بەگی میری، مستەفا و ئەسەد و محەمەدی خزمەتکاری مەحموود خان لەگەڵ هاوڵاتی ئیبراهیم)). ئەوانەشی کە پەیوەندی نزیکیان بە بەدرخان پاشاوە هەبێ، لیستێکی زۆر درێژە، ناوی (١٣) کەس لە ئەندامانی بنەماڵەی بەدرخان پاشا لە لیستی یەکەمدا بەم جۆرەیە: ((بەدرخان بەگ، تێلی بەگی کوڕی، نەجیب بەگی کوڕی، مستەفا بەگی کوڕی، بەدر بەگی کوڕی، بەدرەدین بەگی کوڕی، ساڵح بەگی برای، ئەسەد بەگی برای، ئیبراهیم بەگی برازای، عەبدولکەریم بەگی برای و عەبدوڵڵای مامی)) هەروەها ناوی (٤) ژن و (١٠) کچ و (٩) کەنیزەك و (١٠) خزمەتکاری بەدرخان بەگ، (٣) ژنی ساڵح بەگی برای و (٤) کۆیلەی ئەوان و کچێکیان)) لە لیستی تۆمارکراوەکاندایە، شان بەشانی ئەوانە و لە لیستێکی تردا ناوی (١١) کەس تۆمار کراوە، کە بەزۆری لە بەڕێوەبردنی کاروباری فەرمانڕەوایەتیدا یاریدەدەری بەدرخان پاشا بوون، هەر لە خەزنەدار، نووسیار و هەواڵگر. لە لیستی گیراوەکانیشدا ناوی (٤٩) کەسی دی بەرچاو دەکەوێت کە هەموویان پەیوەندییان بە بەدرخان پاشاوە هەبووە(١١).

**بەدرخان پاشا و مەحموود خانی موکسی**
**لە کاتی دوورخستنەوە و دادگاییکردنیاندا:**

دوای ئـەوەی هەریـەك لـە بـەدرخان پاشـا و مـەحموود خـانی موکسـی و هەموو ئەوانەی لە گەڵیاندا بـوون، لەلایـەن سـوپای عوسمانییـەوە دەسـگیر کران و بەدرێژایی مانگی ڕەمەزانی ساڵی ١٨٤٧ لە ژێر چاودێرییەکی تونـدی سـوپاییدا کـە: دوو تـابووری پیـادە و دوو تـابووری سـوارە بـوون بـە فەرمانـدەیی محەمـەد ڕەشـید بـەگ لـەڕێگای سامسـۆنەوە ڕەوانـەی ئەستەمبووڵ کـران. لـە باڵەخانـەی زەبتیـە یـا گرتووخانـەی ئـەو سـەردەمە ڕاگـیران، لـە ڕۆژی چـوارەمی دوورخرانەوەیانـدا. فـەرمانڕەوایانی عوسمـانی کەوتوونەتە لێپرسینەوە، بە تایبەتی لەگەڵ بەدرخان پاشا و مەحموود خان و کەسـە دیارەکانیانـدا. وەك دەردەکـەوێت میرەکـانی کـورد لـە کـاتی لێکۆڵینەوەکردنیانـدا سـەرەڕای ئـەوەی زۆر پاڕاونەتـەوە و، کەوتوونەتـە ستایشکردنی سوڵتانی عوسمـانی و پەشـیمانیی خۆیـان دەربڕیـوە، هاوکـات هۆکاری هەڵگیرسانی شۆڕش و ڕاپەڕینەکانیان خستۆتە ئەسـتۆی پاشـاکانی عوسمانی لە ناوچـەکەدا بـۆ نموونـە بـەدرخان پاشـا لـە بەشـێکی وتەکانیـدا وتوویـە: ((لـە سـایەی سـوڵتانەوە لـە هـەموو لایەنێکـەوە ئاسـوودەم)) یـان سەبارەت بە هەڵسەنگاندنی تەنزیمات، دووبارە بە بێ ئاگاییەوە دەکەوێتـە ستایشـکردن و پاڕانـەوە: ((مـن چـوار پێـنج سـاڵە تـەنزیماتم بیسـتووە. نەمـدەزانی وایـە، ئەگـەر بمزانیبـا، پێـنج سـاڵ لەمەوبـەر دەهـاتم بـۆ دەرسەعادەت، هەر مرۆڤێك نەیەت بۆ دەرسەعادەت، لە ڕەگەزی مرۆڤ نییە، من بایەخپێدان و خێری سـوڵتانم دی، حـافز پاشـا پلـەی مـیر ئـاڵای بـۆ مـن وەرگـرت لـە بەرئـەوەی لـە نـاو عەشـیرەتەکاندا سـەربەرز و دیـار بـووم)) هەروەها لە قسەکانیدا باس لەو جۆرە خیلاف و لێك نەگەیشتنە دەکـات کـە کەوتۆتە نێوان خۆی و کاربەدەستانی عوسمانییەوە، لەسەر مەسەلەی پـارە و نەچوونی بۆلای عوسمان پاشای عوسمانی و بەرپابوونی ئەو کێشانەی کـە لە نێوانیاندا هاتۆتە کایەوە، کەچی دووبارە داوای لێبووردن لە سوڵتان دەکا و لەبەری دەپاڕێتەوە: ((نەمدەزانی ئەستەمبووڵ بەم جۆرەیە، ئێستا زانیم،

بەخێزان و کوڕەکانمەوە هاتم بۆ سێبەری شاهانە و پەنام هێنا)) لە بەشێکی تریشدا ئەگەر لەژێر فشاردا بووبێ یا بەهەر هۆیەك دەڵێ: ((من کۆیلەی سوڵتانم و ڕازی نابم ئازادم بکات، خێزانم کەنیزەکی سوڵتانە و کوڕەکانیشم کۆیلە زادەی وین و ئەگەر ئارەزوو دەکات با هەموومان فڕێ بداتە دەریاوە)) جگە لە هەموو ئەو خۆ بچووککردنەوەیە، شارێکی وەك ئەستەمبووڵ وا سەرنجی بەدرخان پاشا ڕادەکێشێ حەزدەکا لەوێ بمێنێتەوە و هەرگیز: ((ڕوو لە ویلایەتی خۆی نەکاتەوە))[١٢].

بەلاّم کەسێکی وەك مەحموود خان کە هاوکار و هاوپەیمانی میر بەدرخان بووە و تادوایی بەجێی نەهێشتووە و بەبرا و منداڵ و کەسوکارەوە لەگەڵیدا بووە، هەرچەندە ئەمیش بەهەمان لێکدانەوەی میر بەدرخان لە دیوان و فەرمانڕەوایانی عوسمانی دەپاڕێتەوە و دەکەوێتە ستایشکردنیان، کەچی بەشێوازێکی گشتی برا و کەسەکانی خۆی ناخاتە داوەوە و تاوانباریان ناکا. بەڵکو وای نیشان دەدات: ((تەنیا خۆی پەیوەندی لەگەڵ بەدرخان بەگدا هەبووە و هەموو تاوانەکانی تاقمەکەی دەخاتە ئەستۆی خۆی))یەوە و لەدەقی وتەکەشیدا دەڵێ: ((لە سایەی شاهانەدا ئاسوودەییمان لە هەموو ڕوویەکەوە لە جێدایە. خواردن و خواردنەوەمان لەوپەڕی تەواویدایە. ئێمە بەندەی هەژار و ئاسایی سوڵتانمانین)). بە هەمان پاڕانەوەی بەدرخان پاشا لە بەشێکی تری وتەکانیدا دەپاڕێتەوە: (حەوت هەشت کوڕی تریشم هەن. هەر هەموویان بەندە و کۆیلەی سوڵتانمانن، خۆ ئەگەر لەم ڕووەوە تاوانمان هەبێت. لەبەر سوڵتانی خاوەن نیعمەتی جیهانمان بۆ لێبووردن دەپاڕێینەوە). لە وتە نامەی دووەمیشیدا جەخت لەسەر ئەو هاوکاری و هاوپەیمانییەی خۆی دەکاتەوە کە لەگەڵ میر بەدرخاندا هەیبووە و بە هیچ جۆرێ، ئەمەیانی لە فەرمانڕەوایان و بەرپرسانی عوسمانی لە کاتی لێپرسینەوەدا نەشاردۆتەوە، بەتەواوی لە مەشیاندا برا و کوڕەکانی لە دژایەتی دەوڵەت بێبەری دەکا و بۆنموونە وتوویە:((بەپێی ئەو بڕیارەی دابووم. تەنیا خۆم بەڵێنی هاوکاریکردنم بە بەدرخان بەگ دابوو)). بەلاّم براکانم بە هیچ جۆرێك دەستیان لەم کارەدا

نییە. بەتایبەتی عەبدالْ بەگ. هەروەها جەخت دەکاتەوە و دەڵێ: ((براکانم بێ تاوانن. ناهەقی لە بەرامبەر ئەمانە کرا و بۆ ئێمە گرفتاری ئەم دۆخە بوون و پەرێشان بوون))[13].

دوا بەدوای ئەوە هەریەك لە عەبدولڕەزاق بەگی برای مەحموود خان و خالید بەگی میری کیسان وتەیان لێ وەرگیراوە و بەهەمان شێوە هەموو تۆمەتەکان دەخەنە ئەستۆی بەدرخان پاشا و مەحموود خانەوە، تەنانەت عەبدولڕەزاق بەگ بە شێوەیەك قسە لەسەر مەحموود خانی برای دەکات کە گوایە ئەوان بەردەوام ئێرەییبیان بە یەکتر بردووە و، نێوانیشیان باش نەبووە. لە ئاکامی هەموو ئەمانەدا، بەرپرسان و فەرمانڕەوایانی عوسمانی، بڕیاریان لە سەر ئەوە دا بەدرخان پاشا و تایەفەکەی بۆ شاری (قەندیە) ی دوورگەی کریت و مەحموودخان و تاقمەکەی بۆ شاری (ڕۆسچوك) واتە (ڕۆسکێ)ی ولاَتی بولگاریای ئەمڕۆ دوور بخرێنەوە[14]. بۆ ئەم مەبەستە لە (١٨٤٧/١٠/٩) ەوە دوای کۆبوونەوە و ڕاوێژکاریی پێویست فەرمانڕەوایانی عوسمانی بڕیار دەدەن کەشتی (ئەرغەلی) بۆ گواستنەوەی بەدرخان پاشا و بنەماڵەکەی، هەروەها کەشتی (سەیری بەحری) ئامادە بکرێت بۆ گواستنەوەی مەحموودخان بۆ (ڤارنا) و بۆ ئەو مەبەستە هێزی سەربازی پێویست بۆ چاودێریکردنیان ساز بکرێت. سەرەتا مەحموود خان لە (ڤارنا)وە بەرێگای وشکانیدا گەیەنرایە شاری (ڕۆسچوك). بەلاَم هەردوو میری کورد، بەر لە گوازتنەوەیان بەتەنها براونەتە (دەروازەی بالاَ) و ئەوەیان پێ وتراوە ئەو خراپەکارییەی بەرامبەرتان کراوە ئەوە: (لوتف و خێری سولَتانە بۆ ئەوان) و پێیان ڕاگەیەنراوە ئەبێ لەمە بەدوا تا کۆتایی ژیان لەوێ سەرقاڵی کاروباری خۆتان بن و پەیوەندیتان بە کوردستانەوە قەدەغەیە[15]. بەلاَم بەدرخان پاشا دوای ئەوەی لە (٢٠/ ١٠/ ١٨٤٧)ەوە بڕیاری دوورخستنەوەی بۆ ویلایەتی (کریت) دەدرێت یەکێك لە داواکارییەکانی ئەوە دەبێ سەبارەت بە داهات و سامانەکەی چاوی بە هاوسەرەکەی بکەوێ. بۆ ئەمەش کاربەدەستانی عوسمانی ڕازی دەبن و هەر لە ناو پاپۆڕەکەدا کە بۆ دوورگەی کریتی دەگوازنەوە، زانیاری ورد لەو

بارەیەوە دەداتە هاوسەرەکەی. فەرمانڕەوایانیش دوای کۆتاییهێنانی ڕاپەڕینەکەی بەدرخان پاشا و هەموو ئەم لێپێچینەوانەی، کە لەگەڵ خۆی و هاوپەیمانەکانیدا کراون، دیاری و پلەی سەربازی جۆر بەجۆر دەداتە هەموو ئەو ئەفسەر و سەرباز و بەرپرسیارە سەربازییانەی کە ڕۆڵیان هەبووە لەم پرۆسەیەدا. بەتایبەتی سەدری ئەعزەم مستەفا ڕەشید پاشا و سەرلەشکر محەمەد سەعید پاشا، شانبەشانی ئەوانە ئەو پلەی (میری میران)ەش کاتی خۆی لەلایەن حافز پاشاوە درابوو بە بەدرخان پاشا لێی سەنرایەوە[١٦]. دوای ئەوەی بەدرخان پاشا (١٠) ساڵی تەواو بە دوورخراوەیی لە دوورگەی کریت مایەوە، سولتان عەبدولمەجیدی عوسمانی (١٨٣٩–١٨٦١) بڕیاری لێخۆشبوونی بۆ دەردەکا و بە کەشتییەکی تایبەت هێنرایەوە ئەستەمبووڵ و، بۆ جارێکی دی دووبارە دەگەڕێتەوە کریت و، هەشت ساڵی دی لەوێ دەمێنێتەوە، دیسان دەگەڕێتەوە ئەستەمبووڵ و بۆ ماوەی حەوت ساڵی دی لێرەش دەمێنێتەوە و ئەو پلەی (میری میران)ەی لەکاتی دەسگیرکردنیدا لێی سەنرایەوە و نێردرا بۆ(زەربخانە) لەلایەن سولتان عەبدولعەزیزی عوسمانییەوە، بۆی دەگەڕێنرێتەوە. سەرەڕای ناونیشانی پاشایەتی، هەرچەندە بەپێی هەندێ سەرچاوەش ڕێگە بە میر بەدرخان دراوە دووسەد کەس لە پیاوەکانی بەرێتە کریت، ئەوانەی ڕۆڵێکی گەورەیان لە دامرکاندنەوەی ڕاپەڕینی ١٨٥٦ ی گریکەکاندا بینی، لەپاداشتی ئەوەدا بەدرخان پاشا هێنرایەوە ئەستەمبووڵ و ڕێگەی پێدراوە لێرە نیشتەجێ بێ[١٧]. بەڵام بە دووساڵ بەر لەمردنی ئەستەمبووڵ بەجێ دێڵێ و دێتە شام و لە دیمەشق نیشتەجێ دەبێ و لە ساڵی ١٨٦٨ دا کۆچی دوایی دەکا و لە (صالحیە) ئەسپەردەی خاك دەکرێ[١٨].

سەبارەت بە مەحموود خانی موکسی و بنەماڵەکەی کە هەر لەکاتی بەدرخان پاشادا دوور خرانەوە بۆ (ڕۆسچوك)ی وڵاتی بولگاریا، بۆ یەکەم جار تەنها خۆی و (١١) کەسی بنەماڵەکەی لە گەڵدا بوو، ئەو بەشەکەی دی لە خێزان و براکانی لە لایەن فەرمانڕەوایانی عوسمانییەوە برانە ئەستەمبووڵ و دوای سێ مانگ ئینجا لە ٢٧ی مارتی ١٨٤٨ەوە گوازرانەوە

ڕۆسچوك و شوێنی دوورخستنەوەیان. ئەم کەسایەتییەش بەپێچەوانەی بەدرخان پاشا و میر و ڕێبەرەکانی تری کوردەوە لەلایەن دەوڵەتی عوسمانییەوە تا کۆچکردنی لە تاراوگە و لەو ولاتەدا مایەوە و بڕیاری لێخۆشبوونی بۆ دەرنەکرا. بەڵکو زۆر جار بە هۆی ڕاپەڕینەکانی دواتری کوردستانەوە زیاتر چاودێری دەخرایە سەر و ڕێوشوێنی توند و تۆڵی بەرامبەر دەگیرایە بەر، تەنانەت کرێی گواستنەوەی بۆ تاراوگە و ئەو مووچەیەشی کە دواتر لە لایەن فەرمانڕەوایانی عوسمانییەوە بۆ بڕایەوە، هەمووی لە داهاتی فرۆشتنی ماڵ و موڵکە دەسبەسەردا گیراوەکانی دابین دەکرا[19]. لەو ماوەیەشدا کە لە تاراوگە و دووره ولاتی ژیاون، ڕۆژ بە ڕۆژ بە هۆی بێ دەرامەتی و ئەوەشی کە لەلایەن دەوڵەتەوە بۆیان دەستەبەر کراوە، پێداویستییەکانیانی پڕ نەکردۆتەوە. بۆیە عەبدولڕەزاق بەگی برای مەحموود خان لە ساڵی ١٨٥٨ەوە، داوای ئەوەی لە فەرمانڕەوایان کردووە مۆڵەتیان بدرێتێ: ((بۆماوەی سێ مانگ بگەڕێنەوە بۆ ولاتی خۆیان تا بتوانن پاشماوەی موڵکەکانیان بفرۆشن)). هەر کە داواکارییەکی لەم بابەتە ڕوو بەڕووی والی کوردستانی ئەوکاتە خەلیل کەمال پاشا دەکرێتەوە، بە لێکدانەوەیەکی مەترسیداری دەزانێ و داواکارییەکانیان ڕەت دەکرێتەوە. بۆیە دواتر لە ژێر چاودێری دەوڵەتدا کارێکی وا دەکرێ، کە بریکاری خۆیان بنێرنە ناوچەکەیان و لە ڕێگای موتەسەرفیەتی وانەوە دەکەونە فرۆشتنی پاشماوەی موڵکەکانیان، هەروەها بە پێی ئەو ڕاپۆرتانەی کە لەسەر مەحموود خان و بنەماڵەکەی لە تاراوگەی شاری (ڕۆسچوك)ەوە تۆمار کراون، دوای چەند ساڵێك لە دوورخستنەوەیان، خان توانیویەتی داواکاری ئەوەی لە کاربەدەستان کردووە، کە کوڕێکی خەزووری و یەکێك لە کوڕەکانی خۆی لە سوپای هەمایوندا وەربگیرێن و کوڕەکانی تری بخرێنە بەرخوێندن، کەچی دوای چاوەڕوانییەکی زۆر، بۆ لایەنی سوپا داواکەی فەرامۆش دەکرێ، بەلاّم کوڕەکانی دی لە (مەکتەبی ئەعدادیە) وەردەگیرێن[20]. سەبارەت بە پەیوەندی ئەم بنەماڵەیە بە کوردستانەوە. زۆر بەوردییەوە چاودێری کراون و تەنانەت بەمۆڵەتی کاتیش ڕێگای

گەڕانەوەیان نەدراوە. بەڕادەیەك لەو دەمانەدا، هەر ڕاپەڕین و بەرخودانێك لە کوردستاندا سەری هەڵدابێ، بە پێی ڕاپۆرتەکانی ئەرشیفی عوسمانی، ئەمانە زیاتر چاودێری کراون و لەم کاتەدا پەیوەندی نێوان والییەکانی: کوردستان و کریت و سیلسترە واتە بولگاریا چڕتر بۆتەوە، هەندێ جار وای لێ هاتووە: ((مەحموود خان و کەسوکاری لە ڕۆسچوك خراونەتە گرتووخانە)) وە. ئەم بارودۆخە وا ڕۆیشتووە، ئەم دوورخراوانە، جارێکی دی بیر لە هاتنەوەی کوردستان نەکەنەوە و تێکەڵ بە ژیانی تاراوگە بن بۆ نموونە: ((چوار لە بووکەکانی مەحموود خان خەڵکی ڕۆسچوك بوون)) و بۆ دوا کات مەحموود خان لە ئاوارەیی و لە ١٢/٤/ ١٨٦٦ دا هەر لەوێ وەفاتی کردووە و، دوای خۆی خێزانێکی (٢٨) کەسی بەجێ هێشتووە[٢١].

**نوروڵلا بەگی هەکاری لە دەسەلاتەوە بۆ ژیانی تاراوگە ١٨٤٨-١٨٦١:**

وەك هەڵکەوتەی جوگرافی هەرێمی هەکاری، دەکەوێتە نێوان دەریاچەی وان لای باکوور و زێی گەورە لای باشووریەوە، ماوەیەکیش سەر بە ویلایەتی وان بووە، بارەگای سەرەکی میرنشینەکە شاری (جۆڵە مێرگ) و، لەگەڵ ئەوەدا قەلایەکی تۆکمە و گەلێك مزگەوت و قوتابخانەی تیا بووە، کە بەدرێژایی مێژوو لەلایەن میرەکانیەوە بونیاد نراون، ئەمەش وای کردووە ببێتە مەڵبەند و شوێنی نیشتەجێبوونی زۆرێك لە زانا و دانایان، جگە لەوە دێرینترین ناوهێنان سەبارەت بەم میرنشینە، دەگەڕێتەوە بۆ سالانی سەدەی نۆیەمی زایینی و، لە سەرەتاوە چەند میرێکی دیار بەڕێوەیان بردووە. تا ئەوکاتەی لە سەرەتاکانی سەدەی نۆزدەیەمی زایینیدا، لەگەڵ فەرمانڕەوایانی قاجاری و عوسمانیدا کەوتوونەتە ململانێیەکی سەختەوە، میری هەکاری لەم ماوەیەدا، بۆ داکۆکیکردن لە دەسەلاتەکەی سوپایەکی پڕچەکی (٤٠) هەزاری پێکەوە ناوە[٢٢]. لەو کاتەشەوە کە نوورڵلا بەگ لە سییەکانی سەدەی نۆزدەدا کاروباری کەوتۆتە دەستەوە. بارەگای دەسەلاتەکەی گواستۆتەوە (باشقەلا) و سلێمان بەگی برازای وەك کەسی دووەم کاروباری میرنشینەکەی لە (جۆڵەمێرگ) لە ئەستۆ گرتووە. لەو

ماوەیەشەوە کە بەدرخان پاشا، کەوتۆتە ململانێ و شەڕی بەردەوامی عوسمانییەوە، نوورڵڵا بەگ یەکێك بووە لەو میرە چالاکانەی چۆتە ڕیزی ئەو (هاوپەیمانی پیرۆز)ەوە کە بەدرخان پاشا لەگەڵ میر و سەرۆك هۆزەکانی کوردا پێکەوەی نا، سەرەڕای ئەوە لە چوارچێوەی میرنشینەکەدا جگە لەوەی کوردەکان یەکێتییەکی هۆزایەتییان پێکەوە ناوە، شانبەشانی ئەوانیش چەندین بنەماڵەی ئەرمەنی و ئاشووری بەرچاو کەوتوون و، پێکەوە وەك برا ژیاون. بۆ نموونە لە ماوەیەکدا کە نوورڵڵا بەگ دەستەیەکی ڕاوێژکاری هەبووە و، لە کاروباری بەڕێوەبردنی میرنشینەکەیدا ڕاوێژی پێ کردوون، لە دوو کوردو ئاشوورییەك پێك هاتبوون، ئەمەش دەلالەت لەو گیانی لێك گەیشتن و پەیوەندییە دەکات کە لە نێوان کورد و ئاشووریدا هەبووە[23].

بەشێوازێکی گشتی دەسەڵاتی نوورڵڵا بەگ بە سەرکەوتوویی لە چوارچێوەی میرنشینەکەیدا مایەوە، تا ئەوکاتەی عوسمانییەکان بە سەرۆکایەتی (عوسمان پاشا) بڕیاریان دا میرنشینی بۆتان لە ساڵی ١٨٤٧ لە ناوبەرن، هاوکات بووە مایەی ئەوەی بەدرخان پاشای سەرۆکی دەسگیر بکەن و دووری بخەنەوە. بەڵام پێیان نەکرا کۆتایی بە دەسەڵاتی نوورڵڵا بەگ بهێنن. بەڵکو ئەم توانی بە بەردەوامی بەرگری لە میرنشینەکەی بکا. تا ئەوکاتەی ڕەشید پاشای عوسمانی ساڵی ١٨٤٩ بە هێزێکەوە، هێرشی کردە سەر و ئەمیش لەبەر ئەوەی بەرگری تەواوی پێ نەکرا، ناچار پاشەکشەی کردە ناو خاکی ئێرانەوە. لە هەمان ساڵیشدا عوسمانییەکان توانییان (شەریف بەگی میری بەدلیس) دەسگیر بکەن و هەواڵەی ئەستەمبووڵی بکەن[24]. لە هەمان ماوەدا ئێرانی قاجاری ئەوەی ڕاگەیاندبوو، پەنای ئەو ڕاپەڕیوانە نادا کە ڕووبەڕووی عوسمانی بوونەتەوە، چونکە بە پێی بنەماکانی ڕێکەوتنامەی ئەرزڕۆمی دووەمی ٣١ی مایسی ١٨٤٧ لێك گەیشتنێك لە نێوانیاندا هاتبووە دی، لەم ماوەیەش بەدواوە هیچ هۆز و عەشیرەتێك بۆی نەبوو شوێن و ناوچەکەی خۆی بگۆڕێ[25]. بەڵام نوورڵڵا بەگ و هاوەڵانی کە هاوپەیمانیی بەدرخان پاشا بوون، لە تاو هێرشی

عوسمانییەکان لە سنووری ناوچە کوردنشینەکانەوە، پەنایان بردبووە بەر ئێران. ئەمەش بوو بە بیانوو و بەهانەیەك، بۆ قاجارییەکان، لەشکرکێشی بکەنە سەر ناوچەکە، هاوکات کاربەدەستانی عوسمانی داوایان لە فەرمانداری ئازربایجان کرد کە بەگیراوی بیدەنە دەستیان. ئەویش فەرمانی دا بەگلەربەگی ورمێ نوروڵلا بەگ بگرێ و بیداتە دەست کاربەدەستانی سنووری عوسمانی. مەزنەکانی کورد ئامادە نەبوون نوروڵلا بەگ بە دەستەوە بدەن. هێزە نیزامییەکانی ئێرانی چوون بۆ تەمێکردنی یاخییەکان و گرتنی نوروڵلابەگ. بەلام خەڵکی مەرگەوەڕ و تەرگەوەڕ و دەشت بە کۆمەڵ ڕووبەڕووی هێزەکانی عەجەم بوون و شکاندیان[٢٦]. نوروڵلا بەگیش لای خۆیەوە بەنیازی ئەوە نەبوو لەگەڵ کاربەدەستانی عوسمانیدا بکەوێتە شەڕەوە، بەڵکو هەموو هەوڵێکی بۆ ئەوە بوو، لە ناوچەکەی خۆیدا بمێنێتەوە و، چارەنووسی وەك بەدرخان پاشا و مەحموود خانی موکسی نەبێ، لە کوردستان دوور بخرێتەوە. فەرمانڕەوایانی عوسمانیش بەردەوام لە هەوڵی ئەوەدا بوون، نوروڵلا بەگ و ئەوانەی لە گەڵیدان و لە ناوچەکە ماونەتەوە خۆیان ڕادەستی کاربەدەستان بکەن، چونکە بەمانی ئەوان بەو شێوەیە ئارامی لە ناوچەکە بەرقەرار نابێ، کە ئەمەشیان بۆ نەهاتە دی، کەوتنە ئەوەی بارودۆخەکە لە ڕێگای بەکارهێنانی هێزەوە یەکلایی بکەنەوە. هەرچەندە پێش هێرشکردنە سەر دەسەلاتی نوروڵلا بەگ، ئەسەد پاشای والی کوردستان و موشیری سوپای ئەنادۆڵی عوسمانی دوونامەی هوشیارکردنەوەیان بۆ نوروڵلابەگ نارد، بەلام ئەو گوێی نەدایە و دەستی کردە خۆسازدان بۆ بەرگری. ئەوانیش بە ماوەیەك دوای ئەمە و لە کۆتایەکانی ١٨٤٨ توانییان دەست بە سەر بنکە و دەسەلاتی نوورڵلا بەگ لە [جۆڵەمێرگ] بگرن و میریش بۆ ناوچەی (گەڤەر) ی سەر سنووری قاجاری هەلات و پەنای بردە بەر عەلی ئەشرەف بەگی بەردەسۆر و دالدەیاندا[٢٧]. بارودۆخێکی لەم جۆرە کێشەکانی نێوان ئێران و دەوڵەتی عوسمانی قووڵتر کردەوە، بە ڕادەیەك بووە مایەی ئەوەی دەوڵەتی عوسمانی، ڕووسیا و بەریتانیا لە ڕێگای کۆنسوڵخانەکانیانەوە لەو مەسەلەیە ئاگادار بکەنەوە،

بەوەی ئەوان پەیماننامەی لێکگەیشتن لە نێوانیاندا هەیە و دەیانەوێ پاڵپشتیی نێودەوڵەتی بۆ داواکارییەکەیان سەبارەت بە نووروڵڵا بەگ دەستەبەر بکەن. بەڵام وڵاتێکی وەك ئێران لەبەر ئەوەی هەژموونێکی تەواوی بەسەر ئەو ناوچانەدا نەبوو کە نووروڵڵا بەگ پەنای بۆ بردبوو و کەسێکی وەك عەلی ئەشرەف بەگی بەردەسۆر لە حکومەتی ئێران هەڵگەڕابووەوە. بە هەمان شێوە عەشیرەتی بڵباس و چەند عەشیرەتێکی دی لە کوردستانی ڕۆژهەڵاتەوە بەڵێنیان بە نووروڵڵا بەگ دا لە هەر مەترسییەك، داکۆکی لێ دەکەن. بە تایبەتی یەحیا خانی فەرمانڕەوای (خۆی) کە خەڵکی ناوچەی هەکاری و خزمی نووروڵڵا بەگ بوو. جگە لەمانە هەر هێرشێکی سەربازیش کە ئێران لەم بوارەدا کردی بۆ گرتن و ڕادەستکردنەوەی نووروڵڵا بەگ بەدوای یەکدا و لەلایەن خێڵ و هۆزەکانی ناوچەکەوە تێکشکێنران[٢٨].

ئەمەش بووە مایەی ئەوەی فەرمانڕەوایانی عوسمانی لە ڕێگای فەرماندە سەربازییەکانیانەوە کەوتنە ئەوەی فشاری زیاتر بخەنە سەر نووروڵڵا بەگ، وەك ئەوەی موشیری سوپای ئەنادۆڵ محەمەد ڕەشید پاشا لەسەرەتاکانی ١٨٤٩ توانی نووروڵڵا بەگ لای ئێران بهێنێتەوە، کارێکی وابکا ڕازی بێ بەوەی ڕادەستی ئەستەمبووڵی بکەن. بەڵام ئەم زیاتر جەختی لەسەر ئەوە دەکردەوە لە هەکاریدا بمێنێتەوە، بۆ هەمان مەبەست کەسایەتییەکی وەك سەید تەهای نەهریێ لای موشیر پاشا و کاربەدەستان تێکەوت، بەڵام سوودێکی ئەوتۆی نەبوو، ئەوان دەیانەویست بە پێی فەرمانی باڵای عوسمانی هەڵوێست وەربگرن. ئەوەبوو بە ناچارییەوە خۆی ڕادەستی فەرمانڕەوایانی باڵای عوسمانی کرد و لە ڕێگای وان، ئەرزڕۆم، تڕایزۆندەوە گەیەنرایە ئەستەمبووڵ و بە هەمان شێوازی سەرکردەکانی تر لە (زەبتیە) خرایە زیندانەوە. بەڵام ئەمیان لە بەدرخان پاشا و خان مەحمود زیاتر دەپارێتەوە و داوای لێخۆشبوون لە فەرمانڕەوایان و تەنانەت بەڕادەیەك تەنازول دەکات ڕەسەنایەتی خۆی دەباتەوە سەر خەلافەتی عەباسی و خۆی بە کورد نازانێ، داوا دەکات وەك بەدرخان پاشا و خان مەحموود مامەڵەی لەگەڵدا نەکرێ، بەڵکو لەسەر ئەو هەموو پاڕانەوە، لەلایەن (ئەنجومەنی

مەحصوصە)ی عوسمانییەوە لە ٢١/٥/ ١٨٤٩ بڕیار لەسەر دوورخستنەوەی دەدەن و بە کەشتییەکی تایبەت کە ناوی (تەیری بەحری)یە دەگوازرێتەوە بۆ(ویلایەتی کریت) و مووچەیەکی مانگانە بۆ بژێوی دەبڕدرێتەوە و دەست بە سەر ماڵ و موڵکەکانیدا دەگیرێ لە کوردستان[٢٩].

لەو ماوەیە بەدواوە جگە لە خێزان و کەسوکاری نوورڵلا بەگ، فەرمانڕەوایانی عوسمانی کەوتنە ئەوەی هەموو ئەو سەرۆك هۆز و کەسانەش بگوازرێنەوە بۆ تاراوگە کە لەڕۆژانی ڕاپەڕینی میرە کوردەکاندا و بەتایبەتی میری هەکاریدا، هاوکاریان بوون، بەجۆرێ هەموو ئەم لێپێچانەوە و دەسگیرکردنانەی تا سەرەتاکانی حوزەیرانی ١٨٤٩ یەکلایی کردەوە، تەنها ژنێکی نوورڵلا بەگ نەبێ، ئەویش لەبەر ئەوەی کچی تەیموور پاشای وانی بوو، پێش دوورخستنەوەی ڕێگای پێدرا لای کەسوکاری لە شاری وان بمێنێتەوە. بەلام سالی دواتر و دوای هەوڵێکی زۆری کاربەدەستانی عوسمانی، توانییان عەبدال بەگی موکسی و خێزان و کەسوکاری لەگەڵ ژمارەیەك لە ئاغاکانی گەڤەری ناوچەی هەکاری بە هەمان شێوە بۆ دوورگەی (ڕۆدس) دووربخەنەوە[٣٠]. نوورڵلا بەگ سەرەڕای دوورخستنەوەی خۆی و خێزان و کەسوکاری، بەهەمان تەرزی پێشوو دەکەوێتەوە پاڕانەوە و خۆ بچووککردنەوە بۆ والی کریت و فەرمانڕەوایان لە ئەستەمبوول. بە زۆری لە چوارچێوەی نامەکانیدا داوای لێخۆشبوون دەکات و میرەکانی تری کوردی وەك بەدرخان پاشا (بە ئەهلی خیانەت) و(چەتە) ناو دەبا و بۆ کاربەدەستان دەنووسێ: ((بۆ خاتری ڕەسولوڵلا ئەم داواکارییەم لە بەرچاو بگرن)) و بە ڕاشکاوییەوە باس لەوە دەکا، لەکاتی ڕاپەڕینی میر بەدرخاندا ئەو چۆتە ڕیزی سوپای ئەنادۆڵەوە و لەلایەن عوسمان پاشای موشیری ئەوکاتەی ئانادۆڵەوە: ((ڕوتبەی سالیسە)) ی پێ بەخشراوە.

ئەمەش دەلالەت لەوە دەکا، میری هەکاری سەرەڕای ئەوەی چۆتە ناو ئەو (پەیمانی پیرۆز)ەوە کە بەدرخان پاشا لە ١٨٤٧ دا بۆ داکۆکیکردن لە حکومەتەکەی و کوردستان دژی دەوڵەتی عوسمانی بەستی، کەچی لەوەیاندا پابەندی ئەو هاوپەیمانییە نەبووە و، چۆتە ڕیزی دوژمنان و سوپای

عوسمانییەوە، هەرئەمەش وای لیٚ کردووە لە شوێنی دوورخرانەوەییدا بە بەردەوامی داوای لێخۆشبوون بکا و دەیەوێ وەك بەدرخان پاشا ببەخشرێ[31]. لە کاتێکیشدا نامە و داواکارییەکانی نوورڵلا بەگ لەلایەن بەرپرسانی پەیوەندداروە لێکۆڵینەوەیان لەسەر دەکرێ. دەبێتە مایەی ئەوەی ئەو مووچەیەی، بۆی بڕاوەتەوە، لە (٥٥٠٠) قرووشەوە بۆی زیاد دەکرێت بۆ (٨٠٠٠) قرووش و بەسەر خۆی و کەسوکاریدا دابەش دەکرێ، کە ژمارەیان (٧) کەس بووە، بە ماوەیەك دواتر بڕیاری لێخۆشبوونی بۆ دەردەکرێ و نازناوی: (سەرگەورەی دەرگاوانی دەرگاهی عالی) پیٚ دەدرێ و دەگوازرێتەوە بۆ ئەستەمبوول، تا ئەوکاتەی لەساڵی ١٨٦١ لێرە وەفات دەکا و لە (تەکیەی محەمەد پاشا) ئەسپەردەی خاك دەکرێ[32]. بەلاّم کوڕەکانی: ئیبراهیم بەگ و عەبدوڵلا بەگ لەو دەمانەدا لەشاری (ڤیدن)ی عوسمانی و بولگاریای ئێستا لەگەڵ کەسە نزیکەکانی دەژیان و بەشێکی دی لە کەسوکاری بەتایبەتی محەمەد سەلیم ئەفەندی مامی لە شاری (کاندییە)ی ناوەندی کریت دەژیان[33].

**ڕا پەڕینی یەزدان شێرو پلانی دوورخستنەوەی ١٨٥٤- ١٨٧٦ دا:**

بەهۆی لەبارچوونی حکومەتەکەی بەدرخان پاشا لە ساڵی ١٨٤٧، کەسایەتییەکی وەك یەزدان شێر ڕۆڵێکی بەرچاوی بینی لە خۆبەدەستەوەدانیدا، بەرامبەر بەوە عوسمان پاشای موشیری ئەنادۆڵ، پلەی بەڕێوەبەری ئەستەبلّی ئامیرە (ئاخوڕی تایبەت) بەخشرایە یەزدان شێر، لەگەڵ بەڕێوەبردنی ناوچەی جەزیرە و، مووچەیەکی (٣٥٠٠) قرووشی بۆ بڕایەوە. بەلاّم ئەم بارودۆخە زۆری نەخایاند و دواتر کەسێکی وەك مستەفا پاشا کرایە قائمقامی جەزیرە و یەزدان شێر لە پۆستەکەی دوورخرایەوە. ئەمەش بووە هەلێك بۆ ئەوەی لە کانوونی یەکەمی ١٨٥٤ لە ناوچەی جەزیرە و بەنیازی ئازادیی کوردستان لە دەسەلاّتی تورك ڕاپەڕێ[34]. هەرچەندە فەرمانڕەوایانی عوسمانی خۆشیان لەم هەلومەرجە ترساون، بۆیە مانەوەی یەزدان شێریان بەو شێوەیە و لە ناوچەکەدا بەکارێکی نەگونجاو زانیوە، دوا

بڕیاریان ئەوە بووە بە خێزانەوە بنێردرێتە ئەستەمبووڵ و کارێکی پێ بسپێردرێ، وەك ئەوەی لە مارتی ١٨٤٩ ئەم پلانەیان خستۆتە بواری جێبەجێکردنەوە، بەڵام دواتر لە ٥ی نیسانی هەمان ساڵەوە بەهۆی ئەوەی کەسێکی نەگونجاو بووە، بۆ کاری (موڵکی) دووبارە و گەڕاندوویانەتەوە و لە مووسڵ لە ڕیزەکانی سوپادا کاری پێ سپێردراوە، لەوێشەوە کەوتۆتە پەیوەندی و هاتوچۆکردنی کۆنسوڵی بەریتانی کریستیان ڕەسام لەو شارەدا[٣٥]. لە ساڵانی (١٨٥٣-١٨٥٦) کە شەڕی قرم لە نێوان دەوڵەتی عوسمانی و ڕووسیا بەرپا بوو، یەزدان شێر ئەم ڕووداوەی، بە هەلێکی لەبار زانی بە تایبەتی لەو کاتەوە کاربەدەستانی عوسمانی سپاردیان بەوەی لە ناوچە کوردنشینەکاندا، چەکدار و سەرباز کۆبکاتەوە بۆ دژایەتیکردنی ڕووسیا. بەڵام ڕووسەکان لە جەنگەکەیاندا بەردەوام لە سەرکەوتندا بوون، بەتایبەتی لە تەمووزی ١٨٥٤ دا کە دەستیان بەسەر شاری (بایەزید)دا گرت، ئەمەش بووە مایەی ئەوەی کوردەکان زیاتر سۆزیان بەلایاندا بشکێتەوە[٣٦]. جگە لەوە ڕووسەکان لێرەوە کەوتنە ئەوەی لەڕێگای نامەی تایبەتەوە، پەیوەندی بەیەزدان شێرەوە بکەن و بەڵێنی هاوکاریکردنی بدەن، ئەوەشیان پێ ڕاگەیاندبوو خۆی لە عوسمانییەکان دوور بخاتەوە و ببێتە هاوپەیمانیی ئەوان. لەلایەکی دییەوە زۆرێك لە سەرۆك هۆز و کەسایەتییە جۆر بەجۆرەکان لە کوردستانەوە بەڵێنی پشتگیرییان بۆ دووپات کردەوە و، یەکەم هەنگاوی ئەوە بوو توانی شاری جەزیرە و دەوروبەری ئازاد بکا و، هەموو فەرمانبەرە تورکەکانی لێ بکاتە دەرەوە[٣٧]. لێرە بەدواوە ڕێگای ئەوەی بۆ خۆش بوو بتوانێ هەموو ناوچەکانی: بۆتان، جەزیرە، هەکاری و لەوێشەوە بەنزیکەی (٢٠٠٠) چەکدارەوە دەست بەسەر بەدلیسدا بگرێ و بە هاوکاری دانیشتوانەکەی قائمقامی شارەکە بکوژێ، لەولاشەوە دانیشتوانی ناوچەکانی باشووری وان و موکس بە ڕێبەرایەتی تیلی بەگ پەیوەندییان پێوەکرد، سەرەڕای پەیوەندی پێوەکردنی کوڕەکانی بەدرخان پاشا و ئاشوورییەکان، ئەمەش ترسێکی گەورەی لای تورکەکان دروست کرد بەوەی ئەم ڕاپەڕینە زیاتر تەشەنە بکا، بە ڕادەیەك یەزدان شێر لە سەرەتاکانی

١٨٥٥ەوە، بە هێزێکی (٣٠٠٠) چەکدارەوە، توانی دەست بەسەر باشووری دەریاچەی وان و مووسڵدا بگرێ. بێ ئەوەی بەرگرییەکی ئەوتۆی بەرامبەر بکرێ، لە میانی ئەم هێرشکردنەیدا، لە شاری مووسڵ توانی دەست بەسەر کارگەیەکی تۆپ و خەزینەدا بگرێ و نوێنەری دەسەڵاتی لێ بکاتە دەرەوە. هاوکات کوردە ئێزیدییەکانیش پاڵپشتییەکی گەورەیان کرد و حوسێن بەگی میری ئێزیدی، توانی هێزێکی پێنج هەزاری تورك تێك بشکێنێ و دەست بەسەر شاری سێرتدا بگرێ(٣٨).

ئەمانە لەکاتێکدا بوو بەزۆری سوپای عوسمانی لە بەرەکانی جەنگ لەگەڵ رووسیادا سەرگەرم بوون، بۆیە بە ناچارییەوە، هێزێکی خۆیان بەسەرۆکایەتی والی بەغدا مەدحەت پاشا بۆ ڕووبەڕوو بوونەوەی یەزدان شێر هێنا، بەڵام هەر لەگەڵ یەکەم پێکدادانیاندا بەرامبەر بە هێزەکانی کورد نزیك شاری سێرت تێکشکان و هەر لەم کاتەدا زۆرێك لە عەرەب و یۆنانی و ئەرمەنییەکانی ناوچەکە هاتنە پاڵ ڕاپەڕینەکەوە، بەپێی هەندێ سەرچاوە ژمارەی چەکدار و ڕاپەڕیوانی کورد لە شوباتی ١٨٥٥ بەدواوە گەیشتە (٦٠) هەزار کەس و هەندێکی دی بە (١٠٠) هەزاریان لێکداوەتەوە(٣٩). ڕاپەڕینێکی لەم جۆرەش هەرچەندە ڕۆژ بە ڕۆژ لەزیادبوون و برەودا بوو. بەڵام بەهۆی هاوکاری نەکردنی وڵاتان و، بەتایبەتی ڕووسیا کە دوژمنی سەرسەختی دەوڵەتی عوسمانی بوو. یەزدان شێریش لەم ڕووەوە چەندین نامەی ڕوو بەڕوو کردنەوە، بەڵام وەڵامێکی ئەوتۆی پێ نەگەیشت، کەچی لەگەڵ ئەوەدا بێ هەڵوێستیی فەرەنسا و بەریتانیاشی هاتە پاڵ و بە هەموویانەوە بوونە دوژمنی ڕاپەڕینەکە و، کاربەدەستانی عوسمانی بە تایبەتی والی کوردستان و قائمقامی سێرت بەردەوام لەنامە ناردندا بوون، بۆ یەزدان شێر و داوای ئەوەیان لێ دەکرد، لە بەرخودان پاشگەز بێتەوە(٤٠) فەرمانڕەوایانی بەریتانیاش هەرچەندە بەڕوونی دژایەتی ڕاپەڕینەکەیان دەکرد و هانی یەزدان شێریان دەدا لە ڕێگای گفتوگۆوە مەسەلەکان چارەسەر بکا، تەنانەت لەوەش ئاگاداریان کردەوە ئەگەر بێتو بەم شێوەیە بەردەوام بێ و دەسبەرداری ڕاپەڕین نەبێ ئەوا: ((دوایی پەشیمانیش سوودی نابێت))

هەروەها ولیام پاشای بەریتانی لەڕێگای نامەیەکەوە ڕاشکاوانە بەیەزدان شێر دەڵێ: ((دەوڵەتی عوسمانی و ئینگلیز و فەرەنسای ڕووبەڕووی خۆی کردۆتەوە)) هەروەها ئەوەشی پێ ڕادەگەیەنێ: ((ئەگەر خۆت بپارێیتەوە و دەستەو دامێنی دەوڵەت ببیت. بەناوی هەردوو دەوڵەتی ئینگلتەرا و فەرەنساوە دەبم بەکەفیل کە هیچ کەسێك دەست بۆ سامان و گیانت نەبات))[٤١]. بەجۆرێ دوای چڕبوونەوەی هەموو ئەو فشارانەی کەوتە سەر یەزدان شێر، بەریتانیاش هەڕەشەی ئەوەی دەدا ئەگەر بێتو یەزدان شێر واز لە ڕاپەڕین نەهێنێ، ئەوا ئەوان بارودۆخەکە بەزەبری هێز یەکلایی دەکەنەوە، شانبەشانی ئەوانەش (پاتریاك ئەفرام)ی کۆنسۆڵی بەریتانی لە مووسڵ کە پارەیەکی زۆری خرابووە بەردەست، کەوتە نانەوەی تۆوی دووبەرەکی لە نێوان سەرۆك هۆزە کوردەکاندا، بۆ ئەوەی لە یەزدان شێریان دابڕێ، بەڕادەیەك هەموو ئەمانە بەتەواوی یەزدان شێری بێ ئومێد کرد، بەتایبەتی دوای شکستهێنانی لە شەڕی ناوچەی (دەروونیە)، ناچار بەرەو جەزیرە بووەوە و پەنای بردە بەر چیا سەختەکانی، بەڵام لەبەرئەوەی بەردەوام هێزەکانی عوسمانی بە هاوکاری بەریتانیا لە تەنگ پێهەڵچنین و بەدوایەوە بوون، ناچار خۆی ڕادەستی بەریتانییەکان کرد و، ئەوانیش لە مووسڵ، لەژێر چاودێریی خۆیاندا هێشتیانەوە. بەم شێوەیەش فەرمانڕەوایانی عوسمانی لێی دەترسان و کەسێکی وەك محەمەد ڕەشید پاشای والی بەغدا لەکۆتایی حوزەیرانی ١٨٥٥دەنووسێ: یەزدان شێر تا ئەوکاتەی لە کۆنسۆڵخانەی بەریتانیا و لە مووسڵ بمێنێتەوە و ڕادەستی دەرسەعادەت نەکرێت، ئاژاوە لە کوردستان کۆتایی نایەت[٤٢].

دوای هەموو ئەو گۆڕانکارییە بەپەلانەی، کە بەسەر ڕەوشی یەزدان شێر و ڕاپەڕینەکەیدا هات، هیچ کام لە ولاتان و زۆرێك لە خێڵە کوردەکان لە گەڵیدا ڕاستیان نەدەکرد و، بوونە دوژمنی سەرسەختی و، لەلایەن فەرمانڕەوایانی بەریتانیاوە خۆی و ژمارەیەك لە هاوەڵانی بە دوو گرووپی جیا کە ژمارەیان (٢٨) کەس بوو، گەیەنرانە ئەستەمبووڵ و هەموو ئەو سەرۆك هۆزە کورد و کەسایەتییانەی لە دەزگاکانی عوسمانیدا کاریان دەکرد

و ڕۆڵیان لە گرتن و ڕادەستکردنەوەیدا هەبوو، حکومەتی تورك میدالیا و خەلاَتی تایبەتی پێدان، هەرچەندە ڕاپەڕینەکە بەگرتن و دوورخستنەوەی خۆی کۆتایی نەهات. بەڵکو بۆماوەیەك عومەر ئاغای برای بەهێزێکی گەورەوە، لە ناوچە شاخاوییەکاندا لە ڕوو بەڕوو بوونەوەی تورکەکاندا مایەوە و حکومەتی تورکیش لەوە دەترسا ڕووسیا پشتگیری لێ بکا[٤٣]. لە کاتی دەسگیرکردن و دوورخستنەوەیدا بۆ ئەستەمبوڵی عوسمانی. بەتایبەتی لە کۆتایی شوباتی ١٨٥٦ بڕیار لەسەر لە سێدارەدانی دراوە. بەلاَم دواتر حوکمەکەیان بۆ کردۆتە دوورخستنەوەی هەتا هەتایی و بۆ ویلایەتی (ڤیدین)ی سەر بەدەوڵەتی عوسمانی دوور خراوەتەوە، دوای دوو ساڵ لەم ڕووداوە، لە ئەستەمبووڵەوە خێزانەکەی بۆ هەمان شوێن و بۆلای خۆی دوورخراوەتەوە، کەچی لە سەرەتاکانی ١٨٥٨دا هەریەك لە یەزدان شێر و مەنسووربەگی برای توانیویانە هەڵبێن، بەلاَم دوای سێ مانگی تەواو لە (٨/٤/ ١٨٥٨) دا لە (بۆسنێ) گیراونەتەوە و دووبارە گەڕێنراونەتەوە، ویلایەتی ڤیدین. سەبارەت بە خێزانەکەشی لەبەرئەوەی کچی نووڕڵلاَ بەگی هەکاری بووە و، پێشتر باوك و بنەماڵەکەی ئەوانیش بۆ (ویلایەتی کریت) دوور خرابوونەوە، لەسەر داوای خۆی و لەگەڵ چەند کەسێك لە نزیکەکانی دەچێتە کریت و فەرمانڕەوایانی عوسمانی لەسەر ئەم داواکارییەی ڕازی دەبن[٤٤]. ئەوەبوو دوای نۆ ساڵ دوورخستنەوە لە کوردستان، عوسمانییەکان بڕیاری لێخۆشبوون، بۆ یەزدان شێر و مەنسووربەگی برای و، ئەوانەی لەگەڵیاندا بوون دەردەکەن بەلاَم ڕێگای گەڕانەوەیان بۆ کوردستان نادرێ و هەریەکەیان پیشەیەکی مەدەنییان بە مووچەوە پێ دەسپێردرێ و لە ولاَتی بولگاریا دەمێننەوە[٤٥]. یەزدان شێر دوای ئەوەی دەکرێت بە موتەسەریفی شاری (یانیە)ی ولاَتی یۆنان، نازناوی (میری میران)ی پێ دەبەخشرێ و لە ٢٥/ ٤/ ١٨٨٦ دا مووچەیەکی (٢٢٥٠) قرووشی بۆخۆی و، مەنسوور بەگی برای مانگی (١٢٥٠) قرووشی لەلایەن دەوڵەتەوە بۆ تەرخان دەکرێ، بۆدواکات لەکۆتایی فەرمانڕەوایەتی سوڵتان عەبدولعەزیزی عوسمانی (١٨٦١–١٨٧٦) دا کۆچی دوایی دەکات[٤٦].

### شێخ عوبێدوڵڵای نەهریٚ لەخەباتی سەربەخۆییەوە بۆ دووره ولاٚتی و تاراوگە ١٨٧٩-١٨٨٣:

لەو دەمانەوە دەوڵەتی عوسمانی کەوتە ئەوەی کۆتایی بە دەسەلاٚتی میرنشینە کوردییەکان بهێنێ و، دەسەلاٚتی ناوەندگەرای عوسمانی بۆ بگێڕنەوە. ڕۆژ بە ڕۆژ ڕەوشی ناوچەکە و ئەو بۆشاییەی لە ئەنجامی ئەم هەڵوێستە هاتەکایەوە ئاڵۆزتر دەبوو. چونکە لەلایەك دەوڵەتی عوسمانی بە هەنگاوگەلێکی لەو بابەتە توانای ئەوەی نەبوو ئاسایش و ئارامی دەستەبەر بکا[٤٧] هەروەها ئەو بارودۆخی برسێتی و نەدارییەی دواتر هەردوو ناوچە کوردنشینەکانی ژێر دەسەلاٚتی عوسمانی و ئێرانی قاجاری گرتەوە زیاتر هەلومەرجەکەی بەرەو هەڵدێرێکی ترسناك و زیاتر برد. بە جۆرێك تەنها لە ناوچەیەکی وەك هەکاریدا نزیکەی (١٠) هەزار کەس لەبرسا مردن و لە بەشی ڕۆژهەلاٚتی کوردستانیش، دانیشتوان کۆمەڵ کۆمەڵ بە ناچارییەوە و لەبرساندا، هێرشیان دەکردە سەر عەمبارەکانی دانەوێڵە و تالاٚنیان دەکرد[٤٨]. کەسایەتی و ڕێبەرێکی گەورەی وەك شێخ عوبێدوڵڵای کوڕی شێخ تەهای کوڕی شێخ ئەحمەد شەهابەدینی نەهریٚ (١٨٣٠–١٨٨٣)، لەم ماوەیەدا کە شەڕی نێوان ڕووسیا و دەوڵەتی عوسمانی لە ماوەی (١٨٧٧–١٨٧٨) دا بەرپابوو و لە ئەنجامی ئەو بانگەشەکردنەی جیهاد کە لە لایەن شەیخولئیسلامی عوسمانییەوە، بۆ ڕوو بەڕووبوونەوەی ڕووسیا و داکۆکیکردن لە سوڵتانی عوسمانی ڕاگەیەنرا، شێخ عوبێدوڵلاٚ کەوتە ئەوەی بە هێزێکی (٣٠٠) کەسییەوە کە بەزۆری لە موریدەکانی خۆی پێك هاتبوون، گەیشتە بەرەکانی جەنگ و بەدەنگی ئەو بانگەوازەوە چوو[٤٩]. لەلایەکی دیشەوە زۆرێك لەو سەرۆك هۆز و کەسایەتییە کوردانەی کە بەدەنگ بانگەوازەکەی فەرمانڕەوایانی عوسمانییەوە چوون، ڕۆژ بەڕۆژ بەرەکانی جەنگیان بەجێ دەهێلاٚ و بۆ ناوچەکانی خۆیان دەگەڕانەوە. شێخ عوبێدوڵلاٚش بەهەمان شێوە و پاش کۆتایی هێنانی شەڕی نێوان ڕووسیا و عوسمانی گەڕایەوە ناوچەکەی خۆی و گوندی نەهریٚ[٥٠]. هاوکات ئەو جۆرە

مامەڵە و هەڵسوکەوتە خراپەی فەرمانڕەوایانی قاجاری و عوسمانی دەبینی بەرامبەر بەکورد و ناوچە کوردنشینەکان و بەتایبەتی موریدەکانی خۆی دەکرا، وەك لە ٢٥ی ئەیلولی ١٨٨٠دا و لە میانی چەند نامەیەکیدا کە بۆ دکتۆر کۆچرانی مسیۆنێری (پەیامبەر) ئەمەریکی لە شاری ورمێ دەنووسێ و بارو دۆخەکەی بۆ ڕوون دەکاتەوە بەوەی هیچ کام لە:((عوسمانییەکان و حکومەتی ئێران نیازیان پاك نییە و هەرگیز خۆیان لە قەرەی مافەکانمان نادەن)) هەروەها لە بەشێکی تردا دەنووسێ: ((تۆ بیستووتە کە چۆن لە ساڵانی پێشوودا شوجاع ئەلدەولە بووە هۆی سەربڕینی ٥٠ کەس لە لایەنگرەکانم. بەهیچ خەتا و تاوانێك و زیاتر لە ١٠٠٠٠٠ تومەنیشی زەرەر لێدام))[٥١]. ئەمانە و دەیان هەڵوێستی دی وەك لە هەموو سەرچاوە و بەڵگەنامەکانی ئەو ڕۆژگارەدا هاتووە و پێکەوە هەموو پاڵنەرێکی بەرچاو بوون، بۆ ئەوەی وا لە شێخ عوبێدوڵلا بکەن کە لەیەك کاتدا بڕیار لەسەر ئەوە بدا ڕووبەڕووی داگیرکاریی هەریەك لە دەوڵەتی عوسمانی و ئێرانی قاجاری بێتەوە. بەڵام ئەو وای بەباش دەزانی کە لە قۆناغی یەکەمدا بۆ بەرەنگاربوونەوەی قاجارییەکان خۆی یەکلایی بکاتەوە و، یەکەم ئامانجی ئەوەبێ، سەرەتا ڕۆژهەڵاتی کوردستان ڕزگار بکرێ[٥٢]. هەڵوێستێکی لەم بابەتەش لە ئەنجامی ئەو کۆنگرە گەورەیە هاتە کایەوە کە لە گوندی نەهرێ، بۆ زۆرێك لە کەسایەتی و پیاوانی ئایین و سەرۆك هۆز و لایەنگیرانی تەریقەتی نەقشبەندی بەسترابوو، هەروەها لە زۆر شار و ناوچەی کوردستانیشەوە کۆمەڵانی خەڵك بە پیر بەستنی ئەو کۆنگرەیەوە چوون، کە تیایدا شێخ عوبێدوڵلا وتارێکی گرنگی بۆ ئامادەبووان خوێندەوە و ئەنجامەکەی هاتنە کایەوەی ڕێکخراوێك بوو بەناوی (کۆمەڵەی خێڵە کوردەکان)ەوە سەرەڕای چەندوچوون و مشتومڕێکی گەورە لە نێوان ئامادەبوواندا[٥٣]. ئەم کۆنگرەیەی کە کوردی هەموو پارچەکانی کوردستانی تیا بەشدار بوو، بەسەر یەکەوە ژمارەیان خۆی دەدا لە نزیکەی (٢٠٠) کەسایەتی لە خەڵکی: سلێمانی، ئامێدی، هەورامان، بۆتان، چیای ساسۆن، سێرت، مووش، وان، سێواس، ئوماسیە... بەجۆرێ هی وایان تیا بووە، لەگەڵ ئەوەدا بووە کە

ئـەم یەکڕیزییـەی کـورد و هێزەکـانی کـورد دژی ئەرمـەن و دیانـەکان بـەکار بهێنرێن نەك دەوڵەتی عوسمانی و ئێرانی قاجاری، بەتایبەتی ئەوانەیان کە تا ئەو دەمانەش خۆیان بە لایەنگیر و سەر بەدەسـەڵاتی عوسمـانی دەزانـی[٥٤].
بە سەریەکەوە ئەو ڕەوشە نالەبارەی کـە کوردسـتانی گرتبـووەوە و هاوکـات ئەو جۆرە یەکگرتن و یەکخستنەی کورد کە لە دەوری شـێخ عوبێـدوڵڵا کـۆی کردنەوە و، هەروەها ئەو پشتگیری و دەستەبەربوونەی کە لە لایـەن هەریـەك لە شەریفی مەککە و خدێوی میسـر و زۆرێـك لـە سـەرکردە عەرەبـەکانی ئـەو دەمانەوە لایەنگیری شێخ عوبێدوڵڵا و پاڵپشتییان دەکرد، ئەمانە و سەرەڕای هاتنە ڕیزەوەی بەشێك لەو ئەفسەرە کوردانەی کە لە ناو سوپای عوسمانیـدا بوون و دەهاتنە ڕیزی هێزەکـانی شـێخ عوبێـدوڵڵا و پاشـان ئـەو هاوکـاری و پشتگیرییەی کە زۆرێك لە ئەرمەن و مەسیحییەکان لە شۆڕشەکەیان دەکـرد، بە سەریەکەوە ژمارەی هێزەکانی لە سەرەتادا گەیاندبووە نزیکـەی (١٥-٢٠) هەزار کەس و هەموو بوونە مایەی ئەوەی ڕۆژێك زووتر دەسـت بداتـە چـەك و ڕووبـەڕووی نـەیارەکانی لـە قاجـار و دواتـر دەوڵـەتی عوسمـانی بێتـەوە[٥٥].
گردبوونەوەیـــەکی جـــەماوەری کۆمـــەڵانی خـــەڵکی کوردســـتان لـــە دەوری شۆڕشەکەی شێخ عوبێدوڵڵا نەك تەنها بووە جێی ترسێکی گەورەی دەوڵەتی عوسمـانی و ئێرانـی قاجـاری، بـەڵکو بـووە مایـەی ترسـاندنی وڵاتێکـی وەك بـەریتانیا و پەرلـەمانتارانی بـەریتانیا و هانـدانی حکومەتەکـەیان بـۆ ئـەوەی بکەوێتــە دژایــەتی کــورد[٥٦]. هەرچــەندە لــە ســەرەتاوە دەوڵــەتێکی وەك عوسمـانی کـە دەیزانـی شـێخ عوبێـدوڵڵا و لایـەنگرانی ڕوو بـەڕووی ئێرانـی قاجاری دەبنەوە. تاڕادەیەك پشتگیرییان لێ دەکرد و حەزیان دەکرد ئێرانـی دراوسێیان بکەوێتە کێشەوە و بەرەو لاوازبوون بڕوات، لەلایەکی دیشـەوە لـە سەرکەوتنەکانی کورد دەسڵەمینەوە و لای خۆیانـەوە کەوتنـە کۆکردنـەوەی هێز و دابینکردنـی هـەموو سەرچاوەیەکی داهـات، بـۆ خەرجییـەکانی شـەڕ، بەڕادەیـەك بگاتـە (٥٠) هـەزار لـیرەی پێویسـت لـە ئـەرزڕۆم، وان، سـێواس، قەستەمۆنی و تەڕابزۆند[٥٧] لەو ماوەیەشەوە کە شـێخ عوبێـدوڵڵا بڕیـار دەدا

هێرشەکانی بۆ ڕزگارکردنی ڕۆژهەلاتی کوردستان دەست پێ بکا، هێزەکانی دابەش دەکا بەسەر چەند بەرەیەکدا:

١- بەڕێبەرایەتی عەبدولقادری کوڕی و هەمزەئاغای مەنگوڕ توانییان سابلاغ و تەورێز داگیر بکەن.

٢- شێخ محەمەد سدیقی کوڕی بەڕێوەی دەبرد و توانی شاری ورمێ داگیر بکا.

٣- ئەم بەرەیەشیان بە سەرۆکایەتی خەلیفە محەمەد سەید بەڕێوە دەبرا و ئەوەی بۆ دەسنیشان کرابوو کە ناوچەکانی ڕۆژئاوای گۆلی ورمێ، کە شارەکانی سەلماس و خۆی دەگرتەوە، بخاتە ژێر دەسەلاتەوە.

بەلام شێخ عوبێدوللا خۆی سەرپەرشتی هەردوو بەرەی دوایی دەکرد و ئەو هێزەشی هەر یەك لە شێخ عەبدولقادر و هەمزە ئاغای مەنگوڕ بەڕێوەیان دەبرد، بێ ئەوەی بەرهەلستییەکی ئەوتۆیان ڕوو بەڕوو بێتەوە، توانییان لە کۆتاییەکانی ئەیلولی ١٨٨٠دا لە شاری شنۆوە بەرەو لاجان و پیران و سابلاغ بەڕێ بکەون و بەدەم ڕێگاوە خەلکێکی زۆر بە پیریانەوە دەچوون و تێکەل بە لەشکرەکەیان دەبوون، مەلبەندی موکریان بە بێ بەرەنگاریی هێزی ئێرانی ئازاد بوو. جگە لەوە هەر شارێکیان ئازاد بکردایە، بەڕێوەبەرێکی کوردیان بۆ دادەنا و بەسەریەکەوە تا ٢/١٠/ ١٨٨٠ توانییان بگەنە ناوچەی میاندواو، بەلام لە کاتی هەلکشانیاندا بۆ شوێن و ناوچەکانی دی لە لایەن هێزی دانیشتوانی ناوچەکە و لەشکری ئێرانییەوە، بەرپەرچ درانەوە و ناچار کران بەرەو شاری شنۆ بکشێنەوە[٥٨]. لە ئەنجامی ئەو هێرش و پەلاماردانەشدا شێخ عوبێدوللا کردی بۆ ئازادکردنی شار و ناوچەکانی ڕۆژهەلاتی کوردستان. بە هۆی بەخۆ کەوتنی ناسرەدین شای قاجار(١٨٤٨-١٨٩٦)ەوە و بەهاناوەهاتنی هێزەکانی قەیسەری ڕووسیا و دواتر ئەو دانیشتنانەی کە لە ئەستەمبوول، بەڕێوە چوون لە نێوان ڕووسیا و بەریتانیا و دەروازەی بالای عوسمانیدا، بووە مایەی ئەوەی ڕووسیا هێزەکانی خۆی بگەیەنێتە ناوچەی نەخچەوان و دەولەتی عوسمانیش هێزی خۆی بنێرێتە ناوچەی هەکاری و دەست بەسەر هەموو ئەو شوێن و دەروازە

گرنگانەدا بگرن کە دەبووە جێی مەترسی بۆ هەردوو فەرمانڕەوایەتی قاجاری و عوسمانی، هاوکات دوای چەندین شەڕو پێکدادانی خوێناوی شێخ عوبێدوڵڵا و شێخ عەبدولقادری کوڕی و ژمارەیەکی زۆر لە هێزەکانی کشانەوە بۆ ناوچەکانی ژێردەسەڵاتی عوسمانی و بەتایبەتی ناوچەی شەمزینان[٥٩]. لەم هەلومەرجە بەدواوە زۆربەی ئەو هۆزانەی پێشتر لەگەڵ شێخ عوبێدوڵڵادا بوون و پشتگیرییان لێ دەکرد دایانە پاڵ ئێرانەوە، تەنها هەمزە ئاغای مەنگوڕ نەبێ، دەسبەرداری بەرهەڵستی نەبوو و پەنای بردە بەر شاخە سەختەکانی سنووری ئێران و عوسمانی و لەوێوە شەڕی پارتیزانی دەست پێکرد[٦٠].

ئەوەشی پەیوەست بێ بە شێخ عوبێدوڵڵاوە، بەپێی پیلانێکی وڵاتانی ئەوروپا، بەتایبەتی بەریتانیا و ڕووسیا فشارێکی گەورە خرایە سەر دەروازەی باڵای عوسمانی بۆ ئەوەی بە دەسبەسەری بگوازرێتەوە ئەستەمبووڵ، وەك ئەوەی لە تەمووزی ١٨٨١دا گیرا و ڕەوانەی ئەستەمبووڵ کرا. هەرچەندە لەلایەن بەرپرسانەوە پێشوازییەکی گەرمی لێ کرا. بەڵام شێخ زانی ئەو میوان نییە و وەك دیلێك خۆی دەهاتە بەرچاو، کەچی دوای ساڵێك و چەند مانگێك بەشێوازێکی نهێنی هەلی ئەوەی بۆ ڕەخسا، لە ئابی ١٨٨٢ەوە لە ڕێگای کەشتییەکی فەرەنسی و بە پاسپۆرتێکی ساختە و بەجلوبەرگی بازرگانێکی تورکییەوە، لە بەندەری (بۆتی)ی جۆرجییەوە، دووبارە خۆی بگەیەنێتەوە کوردستان و بارەگاکەی لە نەهرێ، ئەم شێوازی هەڵاتنەی بە تەواوی لە بەڵگەنامەکانی ئەو دەمانەی قاجاری و وڵاتانی دیدا ڕەنگی داوەتەوە[٦١]. لە هەمان کاتدا بە تەواوی هەردوو وڵاتی ئێرانی قاجاری و دەوڵەتی عوسمانی وا لێ کردووە بکەونە ئامادەباشی و قایمکاری سنوورەکانیانەوە. سەرەڕای بەڵێندانیان بۆ یەکتر بەوەی دووبارە دەسگیری بکەنەوە و: ((بۆ جێگەیەکی زۆر دوور)) دووری بخەنەوە[٦٢]. چونکە هەردوولا بەتەواوی حیسابی ئەوەیان کردووە تا ئەو لە کوردستاندا بمێنێتەوە ئارامی لە ناوچەکەدا بەرقەرار نابێ، تەنانەت ئەوەشیان لێکداوەتەوە: ((دەبێ ئێمە

ساڵێ دوو هەزار تمەن مەسرووفاتی زیادەی قشوونی تایبەت لە سنوورەکان بکەین، ئەمەش کارێکی زۆر دژوار و سەختە))[٦٣].

لە کاتێکدا هەریەك لە دەوڵەتی عوسمانی و ئێران لە پلانی دەسگیرکردنەوە و دوورخستنەوەی شێخ عوبێدوڵلادا بوون. ئەمیش بە هاوکاری ئەوانەی دووبارە پەیوەندییان پێوە کردبوو، سەرگەرمی خۆسازکردن و دووبارە دەسپێکردنەوەی شۆڕش بوو. بەلاّم هێزەکانی عوسمانی بەردەوام لەوەدا بوون، هێزەکانی خۆیان بۆ دەوروبەری ناوچەکانی ژێر دەسەلاّتی شێخ عوبێدوڵلاّ و بەتایبەتی (نەهریّ) و (هورەمار) کە لێرەوە دەیەویست شۆڕش دەست پێ بکاتەوە، دەنارد و ئابلۆقەی زیاتریان دەدا بۆ ئەوەی:((بە زیندوویی بیّ یا مردوویی)) دەسگیری بکەنەوە. ئەمەش لە کاتێکدا بوو شێخ عەبدولقادری کوڕی شێخ عوبێدوڵلاّ توانیبووی لە ١٠/٣/ ١٨٨٢ لەگەڵ (٤٠٠) سوارەیدا دەس بەسەر (هورەمار)دا بگرن و لە هەمان کاتدا کەوتوونەتە ئەوەی لە هەموو لایەکەوە: ((دانەوێڵە و خواردەمەنی و تەقەمەنی کۆدەکەنەوە)) سەرەڕای دابینکردن و دانانی نانەواخانە: ((بۆ ئەو خەڵکەی دەرەوە و ناوەوە)) کە پەیوەندییان پێوە کردوون و لەگەڵیاندا سەرگەرمی ئامادەسازی و قایمکارین. جگە لە بونیادنانی: بورج، قولە، شوورە، قەلاّ و دروستکردنی ڕێگای هاتوچۆ[٦٤]. لە سەروو هەموو ئەوانەشەوە شێخ عوبێدوڵلاّ سەرپەرشتی کاروباری لە ناوچەی نەهریّ وە کردووە و، ناو بەناو لەلایەن کاربەدەستان و نێردراوی تایبەتی سوڵتانەوە هەوڵی ئەوەی لەگەڵ دراوە، دووبارە خۆی ڕادەست بکاتەوە، تا ئەو کاتەی توانیویانە لە ٢١/ ١٠/ ١٨٨٢ دا بیگرن و لە ژێر چاودێری هێزێکدا و لەگەڵ [١٠٠] خێزان لە کەس و لایەنگرەکانی، ڕەوانەی مووسڵ کراوە و لە وێشەوە و لەسەر داوای ناسرەدین شای قاجار، سوڵتان عەبدولحەمیدی عوسمانی، بڕیاری داوە دوور بخرێتەوە بۆ حیجاز و لە (مەدینەی منەوەرە) و هەندێ سەرچاوە لەگەڵ ئەوەدان کە لە شاری (تائیف) نیشتەجیّ کرابێتن، تا ئەوکاتەی بۆ ساڵی دواتر و لە ١٢/ ١٠/ ١٨٨٣، لە تەمەنی (٥٣) ساڵیدا، بە نەخۆشی ڕشانەوە کۆچی دوایی کردووە و هەر لەویّ ئەسپەردەی خاك

کراوە[٦٥]. شاعیرێکی گەورەی وەك میرزا عەبدلڕەحیمی سابلاغی (وەفایی) هەرچەندە ماوەیەکی زۆر ڕاوێژکار و تەنانەت مۆرهەڵگری شەخسیی شێخ بووە، زۆری لە بارەی ژیان و سەربردەی شێخ عوبێدوڵڵاوە نووسیوە کەچی دەرفەتی ئەوەی بۆ نەڕەخساوە لەسەر سەربردە و ماوەی دوورخستنەوەکەی بنووسێ، بەلاّم شێخ عەبدولقادری کوڕی و خانەوادەکەیان هەر لەوێ ماونەتەوە، تا ئەوکاتەی لە ساڵی ١٨٩٥ دا، لەلایەن سوڵتان عەبدلحەمیدی دووەمەوە ڕێگەی پێدراوە بگەڕێتەوە ئەستەمبووڵ، کەچی لە ژێر گوشاری فەرمانڕەوایانی ئێراندا، بۆ جارێکی دی دوور خراوەتەوە بۆ حیجاز و[٦٦]. لە مەدینە نیشتەجێ کراوە، لە دارایی (٣٠٠) لیرە و لە گەنجینەی تایبەتی پاشا (١٥٠) لیرەی وەکو خەرجی ڕێگا پێدراوە، تا ئەو کاتەی لە ساڵی ١٩٠٨ کاتێك مەشرووتیەت ڕادەگەیەنرێ، هەمیسان گەڕاوەتەوە ئەستەمبووڵ و بووە بە ئەندامی ئەنجومەنی ئەعیانی عوسمانی[٦٧]. هەروەها دوای چەند ساڵێك کە شۆڕشی شێخ سەعیدی پیران لە ١٩٢٥ دا بەرپا دەبێ، یەکێك دەبێ لە ڕێبەرە دیارەکانی و دوای کۆتاییهێنانی ئەو شۆڕشەو دەسگیرکردنی ڕێبەرەکانی، شێخ عەبدولقادریش دەسگیردەکرێ و لە ٢٧ی مایسی ١٩٢٥ لە دیاربەکر لەسێدارە دەدرێ[٦٨].

**عەبدولڕەزاق بەدرخان و دادگاییکردنی لە باکوری ئەفریقیا ١٩٠٤ – ١٩١٨:**

ژیانی تاراوگە لای بەدرخانییەکان و بنەماڵەی بەدرخان پاشا، دیاردەیەکی نوێ نییە، بەڵکو زیاتر دەگەڕێتەوە بۆ ئەو دەمانەی، بەدرخان پاشای باپیری عەبدولڕەزاق بەگ لە کۆتایی ڕاپەڕین و دەسەلاّتیدا و ساڵی ١٨٤٧ دوور خرایەوە بۆ دوورگەی کریت. بەلاّم کەسێکی وەك عەبدولڕەزاق بەگی کوڕی نەجیب پاشا کە لەساڵی ١٨٦٤ دا لە ئەستەمبووڵ لەدایك دەبێ و، لەو شارەدا بەشێکی زۆر لە پلەکانی خوێندنی تەواو دەکا، دواتر هەلی ئەوەی بۆ دەڕەخسێ بچێتە ئەوروپا، بۆ ئەوەی خوێندنی زیاتر و زمانی دەوڵەمەندتر فێرببێ و، دەبێتە مایەی ئەوەی بە هەنگاوێکی ئەوتۆ ڕووبەڕووی سیاسەتی عوسمانی و بەتایبەتی سوڵتان عەبدولحەمید بێتەوە،

هەرئەمەش وای کردووە خۆی ئەم بۆچوونەمان بۆ ڕاڤەبکا و بڵێ: ((فەرمانڕەوایانی عوسمانی ئەوەیان دەکرد تا هیچ یەکێکی بنەماڵەکەمان شارەزای شارستانییەتی ئەوروپا نەبێ))[٦٩]. هەندێ سەرچاوەش باس لەوە دەکەن شاعیرێکی وەك حاجی قادری کۆیی، لەو کاتەوە باشووری کوردستانی بەرەو ئەستەمبووڵ بەجێ هێشتووە، گوایە ماوەیەك لە پاڵ بنەماڵەی بەدرخانییەکاندا حەساوەتەوە و بووە بەمامۆستای تایبەتی کوڕەکانی ئەو خانەوادەیە و، پاشتر پەیوەندییەکی گیانی بە گیانی لە نێوان عەبدولڕەزاق بەگ و حاجی قادردا گەشەی کردووە، هەرچەندە سەبارەت بەو بۆچوونەی سەرەوە لە ئایندەدا لێکدانەوەی تایبەتمان دەبێ، بەوەی لەگەڵ سەرچاوە مێژووییەکاندا نایەنەوە[٧٠].

ئەوەشی زیاتر پەیوەست بێ بە کۆچپێکردن و، ئاوارەبوونی بنەماڵەی بەدرخانییەکان و بە تایبەتی کەسایەتییەکی وەك عەبدولڕەزاق بەدرخانەوە لە ساڵی ١٩٠٦ ەوە سەرچاوە دەگرێ، هەرچەندە ئەم کەسایەتییە ماوەیەکی زۆر لە کاروباری عوسمانیدا پۆست و پلەی هەستیاری دراوەتێ لەوانە: فەرمانبەر لە وەزارەتی دەرەوەی عوسمانی و، دواتر گواستراوەتەوە بۆ باڵوێزخانەی دەوڵەتی عوسمانی لە سان پیتەربورگ پایتەختی ڕووسیا و وەك سکرتێری سێیەم دەستبەکار بووە، هەر لەوێش فێری زمانی ڕووسی و تێکەڵ بەژیانی کۆمەڵایەتی و سیاسی و ڕووناکبیری ئەو وڵاتە بووە و بەرامبەر بەو تێکەڵبوون و دۆستایەتییەی خەڵاتی ڕێزلێنانی (ستانیسلاڤ)ی پێ بەخشراوە، بەڵام بە هۆی ئەو پەیوەندییەی کە لەگەڵ ڕووسەکاندا هەیبووە، کاربەدەستانی عوسمانی گواستوویانەتەوە بۆ باڵوێزخانەی عوسمانی لە تاران بە سیفەتی سکرتێری دووەم، سەرەڕای چاودێریکردنی تا ئەوکاتەی گواستوویانەتەوە بۆ ئەستەمبووڵ[٧١]. تەنانەت عەبدولڕەزاق بەگ خۆی لەم بارەیەوە دەیگێڕێتەوە، کە بۆتە جێی سەرنجی سوڵتانی عوسمانی و لە چوارچێوەی یاداشتەکانیدا وای باس کردووە: کاتێك لەوێ سەرگەرمی کارکردن بووم، تۆمەتێکی سیاسی هەڵبەستراویان بۆ دروست کردم، کە ببێتە مایەی ئەوەی بەپێی ئیرادەیەکی سوڵتانی، لە سامسۆنەوە بهێنرێمەوە

ئەستەمبوڵ، بەلاّم وەك دەردەکەوێت، عەبدولڕەزاق بەدرخان بەر لەوەی بگاتە ئەوێ، لە ئەیلولی ١٨٩٢دا بە هاوکاری فەرمانبەرانی باڵوێزخانەی ڕووسیا لە تاران خۆی گەیاندۆتە (تبلیسی) بە ئامانجی ئەوەی لەوێوە بگاتە یەریڤان و لە کوردانەوە نزیك بێ[٧٢]. لێرە بەدواوە کاربەدەستانی عوسمانی کە زانییان بوونی عەبدولڕەزاق بەگ لەو ناوچانەدا جێگای مەترسییە و لە داهاتوودا دەبێتە مایەی سەرئێشە بۆیان، بۆیە سوڵتان کەوتە ئەوەی وا لە کاربەدەستانی ڕووسیا بکات لەوە زیاتر داڵدەی نەدەن. بەلاّم خۆی زۆر ئارەزووی ئەوەی دەکرد لەو ناوچانەدا بمێنێ، سوودێکی نەبوو، ناچار ڕووی لە بەریتانیا کرد و لەوێشەوە پەیوەندی بەو ڕێکخراو و کەسایەتییانەوە کرد کە خۆیان بە نەیاری عوسمانی دەزانی، بەتایبەتی ڕێکخراوە ئەرمەنییەکان، بەلاّم سوڵتان عەبدولحەمید، توانی فشارێکی ئەوتۆ، لەسەر نەجیب پاشای باوکی دروست بکات کە ببێتە مایەی ئەوەی بۆ جارێکی تر بگەڕێتەوە ئەستەمبووڵ و لەلایەن سوڵتانەوە بخرێتە ژێر چاودێرییەوە، لە هەمان کاتدا وەك: جێگری سەرۆکی تەشریفاتی بۆ کاروباری باڵوێزەکانی، لە کۆشکەکەیدا دایمەزرێنێ، سەرەڕای ئەوە بەردەوام لە دۆخێکی پڕ مەترسیدا دەژیا[٧٣].

لە ساڵی ١٩٠٦ەوە کە بە ساڵی سزادانی بەکۆمەڵی بەدرخانییەکان ناسراوە: ژمارەیەکی زۆریان کە نزیکەی (٣٠٠٠) دەبوون، لە وڵاتی خۆیان دەرکران و بۆ تاراوگە دوورخرانەوە، کەچی لە هەمان ساڵدا کەسێکی وەك ڕیزوان پاشای دەستوپێوەندی سوڵتان و سەرۆکی شارەوانی ئەستەمبووڵ لە ٢٢ی مارتی ١٩٠٦ دا دەکوژرێ و دواتر تاوانی ڕێکخستنی ئەم هێرشە، ئاراستەی عەبدولڕەزاق بەدرخان و عەلی شامیل پاشای بەدرخان (١٨٥٥– ١٩٠٨) دەکرێ[٧٤]. بەلاّم سوڵتان لە جیاتی ئەوەی پێویستییە یاساییەکان جێبەجێ بکا، کەچی لەناو دیدی پڕ لە سەرسامی حکومەتەکەیدا، بە دوورخستنەوەی بنەماڵەی بەدرخان تاراوگە، بۆ نموونە ئەمین عالی بەدرخان (١٨٥١– ١٩٢٦) دوور خرایەوە بۆ (ئەسبارتە) و کوڕەکانی: ئەحمەد سورەیا و بەدرخان دوور خرانەوە بۆ (تەرابلوس)، بەدری پاشای کوڕی بەدرخان پاشا دوور خرایەوە بۆ(ڕۆدس)، فەرید بەگی کوڕی تاهیر بەگی بەدرخان و

حەسـەن فـەوزی بـەدرخان دوور خرانـەوە بـۆ تـەرابلوس، حوسـێن کـەنعان بەدرخان بۆ (نـابلوس) و هەریـەك لـە کامیـل بـەدرخان و یوسـف کامیـل بـۆ دوورگـەی ڕۆدس و تـەواوی ئـەو بەدرخانییانـەی لـە ئەسـتەمبووڵ بـوون و تەنانـەت هەنـدێك لـە دۆسـتە نزیکەکانیشـیان ڕەوانـەی تاراوگـە کـران[٧٥].

ئەوەشی کە عەبدولڕەزاق بەگی کردە جێی گومان لە کوشتنی ڕیزوان پاشادا: ((ئەو کێشەیەی نێوانیان بووە لەسەر چاککردنەوەی ڕێگایـەك)) لـە کاتێکدا بووە کە ڕیزوان پاشا گەڕاوەتەوە بۆ ماڵی خۆی لە (گوێزتەپـە) لەلایـەن ئـەم کەسانەوە هێرشی دەکرێتە سەر و دەکوژرێ:

١- عەبدوڵلای کوڕی محەمەدی بدلیسی تەمەن ٢٢ساڵ.
٢- محەمەدی ئەسعەدی کوڕی سەعدوڵلای وانلی تەمەن ٢٢ساڵ.
٣- ئەمین عەبدوڵلای کوڕی تاتاری هەکاری تەمەن ٣٥ ساڵ.
٤- ئەحمەدی کوڕی محەمەد تەمەن ٣٥ ساڵ.

بـەگوێرەی ناوەکـان بکوژەکـان بـە زۆری کـوردن و خـەڵکی شـارە کوردییەکانن[٧٦]، وەکتر بە پێی سەرچاوەکان ئەو کەسەی ڕۆڵـی هـەبووە لـە ڕووداوی ڕیزوان پاشـادا عـەلی شـامیل پاشـا بـووە[٧٧]. بـەڵام کەسـێکی وەك ئەحمەد ئاڵتان کە وەسفی بێدەرەتانی و دوورخستنەوەی ئـەو بەدرخانییانـە دەکـا کـە لـە بـری کوشـتنی ڕیـزوان پاشـا، شـاربەدەر و وڵات بـەدەر کـران دەنووسێ: ((ڕێك دوو هەزار کەس لە نەوەی میر بەدرخانی بەگزادەی کوردی بەناوبانگ، پەیوەندییان بەو تاوانەوە بـووبێ یـا نـەبووبێ، لـە ماڵەکانیانـەوە کۆکرانەوە و خرانە ناو کەشتییەوە و ڕەوانەی تاراوگە کران، زۆریـان تووشـی پەرێشانی هاتن، خێزانیان پـەرت و بـڵاو بوونـەوە، ژنـان لـە مێـرد، منـاڵ لـە باوکان دوور خرانەوە، زۆرێکیان یەکدییان نەدیتەوە، لە ناو هەناسەسـاردییا، لە دەشت و دەردا، لە ڕەشماڵی ڕەوەندانـدا ژیان، بێ ئەوەی دۆسـتێك هـەبێ قومە ئاوێکیان بداتە دەسـت، یـان خـزم و خوێشـێکیان لـە تـەك بـێ گـەردن ئازادییان لەگەڵ بکەن..))[٧٨]. شان بەشانی ئەوانە هەریەك لـە عەبـدولڕەزاق بەدرخان و عەلی شامیل پاشای سەرکردەی ئۆسکۆدار، بە تۆمـەتی کوشـتنی ڕیزوان پاشا، لە لایەن فەرمانڕەوایانەوە دەسگیر کران و لە ژێر چاودێرییەکی

توندا بۆ باکووری ئـەفریقیا و شـاری تەرابلوسـی لیبیـا دوور خرانـەوە، وەك ئەوەی عەبدولڕەزاق بەگ سەبارەت بەدوورخستنەوە و شێوازی مامەڵەکردنی کاربەدەسـتانی عوسمـانی، لـە یاداشـتەکانیدا دەنووسـێ: ((پەیوەنـدیمیان لەگـەڵ نووسـینگەکەمدا لـە بەشـی تەشـریفاتی کۆشـك پچـڕی و بـێ هـیچ دادگاییکردنێك خستمیانە بەندینخانـەی ناوەندییـەوە، دوای چـەند سـەعاتێك خرامـە نێـو پـاپۆڕێکی حکومییـەوە و لەگـەڵ چـەند کەسـێکی دیـدا براینـە (تەرابلوس) و خراینە بەندینخانەوە، بە بڕیاری سوڵتان کۆتی قورسیان کردە هــەردوو پــێم و فڕێیــان دامــە نێــو زینــدانێکی زۆر تەنگەبــەرەوە، دوای تێپەڕبوونی مانگێك لیژنەیەك کـە لـە گـەورە بەرپرسـانی وەزارەتـی داد پێك هـاتبوون، بـە کەشـتییەکی تایبـەت گەیشـتنە تـەرابلوس و لەگـەڵ خۆیانـدا پێشهاتی تۆمەتباری پێشتریان پێ بوو)) هـەروەها قسـە لەسـەر ئـەوە دەکا لیژنەی ناوبراو بۆ ئەوەی تۆمەت و لێپێچانەوەکەیان لەسەرم قورسـتر بکـەن، کەوتوونەتە ئەوەی هەموو ئەو بەڵگەنامانەی کە لەبارەی ئەمانەوەیە، لەگـەڵ خۆیاندا هێنابوویـان، سـاختە و تـەزویری تیـا بکـەن و پاشـان: ((دادگایـەکی نهێنییان پێك هێنا، من و سێ کەسی تریان بە سێدارە و ئەوانی کەشـیان بـە زیندانیی هەتا هەتایی حوکم دا))[٧٩]. بە پێـی قسـەکانی عەبـدولڕەزاق بـەگ، ئەو لێکۆڵینەوانەی کە لەگەڵ ئەو و تۆمەتبارەکانی دی جێبـەجێ دەکرا، بـە زۆری بـەدەم ئەشـکەنجەدانەوە دەکـران و نـاو بـەناو هـەواڵی ئەوانـەش، لـە تەرابلوس و باکوری ئەفریقیاوە، دەگەیشتە ناوەندی دەوڵەتی عوسمانی، بـۆ نموونە پەیامنێری یەکێك لە ڕۆژنامە ڕووسییەکانی ئەو ڕۆژگـارە لـەم بـارەوە دەنووسـێ: ((فـەرمانڕەوایانی تـورك، بەشـێوازێکی وەحشـیگەرییانە مامەڵـە لەگـەڵ دوورخراوەکـانی کـوردا دەکـەن و چـەپەڵترین جـۆری ئەشـکەنجەیان، لەگەڵدا بەکار دەهێنن)) سەرەڕای ئەوانە گیراوەکان بە گشتی و عەبدولڕەزاق بەگ لە بەردەم دادگادا، سازشێکیان نەکرد. بەڵکو عەبدولڕەزاق بەگ، داخـی ئەوەی دەخوارد، کەسـێکی وەك ڕیـزوان پاشـا بـە دەسـتی ئـەو نـەکوژراوە، هەڵوێستێکی لەم جۆرەش لـە چوارچـێوەی ئـەو نامەیـەدا دەردەکـەوێت کـە بۆسـولتانی عوسمـانی نووسـیوە، هـەروەها عـەلی شـامیل پاشـا کـە

ئەشــکەنجەدان و گاڵتــەجاڕی پــێ قبــووڵ نــەدەکرا. هــەوڵی خنکانــدنی نەجمــەدینی ســەرۆکی لیژنــەی لێکۆڵینەوەکــەی دەدا، بــەڵام کەسـێکی وەك محەمەد خانی باوکی ڕێبەری کورد لە ڕۆژهەڵاتی کوردستان سمکۆی شکاك (١٨٧٥–١٩٣٠) لـە ژێـر ئەشـکەنجەدا گیـانی سـپارد[٨٠]. لـە ئـەنجامی ئـەو دادگاییکردنەشدا کە هەریەك لە عەبدولڕەزاق بەدرخان و یاوەرەکانی گرتەوە، بە حوکمی لە سێدارەدان کۆتایی هات. هاوکـات سـوڵتانی عوسمـانی بـەهۆی ئـەو پشـێوییەی لـە نێـو کوردانـدا داکـەوتبوو و بـە بـەردەوامی لـە دووتـوێی ڕۆژنامەکانی ئەو کاتەدا باسی لێوە دەکرا، بووە مایەی ئەوەی بە بڕیارەکەی خۆیانـــدا بچـــنەوە، دوا بڕیاریشـــیان ئـــەوەبێ، حـــوکمی هەتاهـــەتایی و دوورخسـتنەوە، بەسـەر عەبـدولڕەزاق بـەدرخان و هـەموو گیراوەکـانی دیـدا بسەپێت، بە ڕادەیەك کەسێکی وەك عەبدولڕەزاق بـەگ نزیکـەی چـوار سـاڵی تــەواوی لــە تاراوگــە و زینداندا بەســەر بــرد. ئەمــە و لــە کاتێکیشــدا کــە هەڵگەڕانەوەی عوسمانی لە ساڵی ١٩٠٨ دا، بە ڕێبەرایەتی تورکـانی لاو هاتـە کایـەوە، یـەکێك لـە هـەنگاوەکانیان، ئـەوەبوو لێبـووردنی گشـتی بـۆ هـەموو گیراوە سیاسییەکان دەربکرێ، بـەڵام بڕیارەکـەیان عەبـدولڕەزاق بـەدرخان و عەلی شامیل پاشای نەگرتەوە و لە شوێنی دوورخراوەیی خۆیـان مانـەوە، تـا ئەوکاتەی لە ناوەنـدی شـوباتی ١٩١٠، ڕێگـا بـە عەبـدولڕەزاق بـەدرخان درا، بگەڕێتەوە ئەستەمبووڵ و عەلی شامیلیش لە تاراوگە و شوێنی دوورخراوەیـی خۆی لە تەرابلوس کۆچی دوایـی کـرد و لـە ئەسـتەمبووڵ ئەسـپەردەی خـاك کـرا[٨١]. لێـرە بـەدواوە کـە گەڕایـەوە پایتــەختی عوسمــانی و سیاســەتی ڕێکخراوی (یەکێتی و سەرکەوتن)ی بە چاوی خـۆی بینـی، کـە چـۆن مامەڵـە لەگەڵ نەتەوە و ڕەگەزە ناتورکەکاندا دەکـەن، ئـەو هەڵوێسـتەی پـێ قبـووڵ نەکرا و بۆیە کەوتە بەستنی پەیوەندی لەگەڵ ڕووسیادا، بە تایبەتی بـاڵوێزی ڕووسیا (چاریکۆف) لە ئەستەمبووڵ، بۆ ئەوەی ڕێگای بۆ خۆش بکـا، بچێتە ڕووسیا، وەك ئەوەی لە ٨ی کانوونی یەکەمی ١٩١٠، توانی خـۆی بگەیەنێتـە شاری تەبلیسی و لەلایەن گەورە بەرپرسانی ئەو وڵاتەوە بە گەرمی پێشوازی لێ کـرا و لـە سـاڵانی (١٩١٠– ١٩١٦) لـە ئەوپـەڕی چـالاکیدا بـوو، لـە پێنـاو

حوکمی ئۆتۆنۆمی بۆ کوردستان لە ژێر سەرپەرشتیاریی ڕووسیا[٨٢]. ئەمانە و گەلێك چالاکی سیاسی و ڕووناکبیریی دی چ لە ڕۆژهەلاَت و باکووری کوردستان، تا ئەو کاتەی بە پێی پلانی دەزگای هەوالگریی تورك، لە ساڵی ١٩١٨ دا توانییان لە دەوروبەری شاری ڕەواندز دەسگیری بکەن و وەك دیلی جەنگ، ڕادەستی عەلی ئیحسان پاشای فەرماندەی فەیلەقی شەشەمی سوپای عوسمانی بکەن لە بەرەی عێراق و بڕیاری لەسێدارەدانی بدەن و بە نهێنی لە مووسڵ جێبەجێی بکەن[٨٣].

# پەراوێزەکان:

(١) – بلەج شيركو، القضية الكردية، ماضي الكرد وحاضرهم، (القاهرة)، ص٤٤؛ صلاح محمد سليم هروري، الاسرة البدرخانية، نشاطها السياسي والثقافي ١٩٠٠–١٩٥٠، (دهوك: ٢٠٠٤)، ص ١٣.

(٢) – الكرد في الوثائق العثمانية، ترجمة: عثمان علي، (اربيل: ٢٠١٠)، ص ١٠١؛ ن.أ. خالفين، الصراع علي كوردستان، المسالة الكردية في العلاقات الدولية خلال القرن التاسع عشر، ت: احمد عثمان ابو بكر، (بغداد: ١٩٦٩)، ص٥٩.

(٣) –أ.ن. خالفين، الصراع، ص٦١؛ عثمان علي، دراسات في الحركة الكردية المعاصرة ١٨٣٣–١٩٤٦، (اربيل: ٢٠٠٣)، ص ٣٤.

(٤) – جەليلی جەليل، کوردەکانی ئيمپراتۆريەتی عوسمانی، وەرگێڕانی: کاوس قەفتان، (بەغدا: ١٩٨٧)، ل ٢١٤.

(٥) – بلەج شيركو، مصدر سابق، ص ٤٢؛ هيثم مزاحم، الاكراد في مصر من الايوبيين الى محمد علی باشا، الدمقراطي، ٧ كانون الاول /٢٠١٢ ؛ عەزيزی شەمزينی، جوولانەوەی ڕزگاری نيشتمانی کوردستان، و: فەريد ئەسەسەرد، (سلێمانی: ١٩٩٨)، ل ٧٦.

(٦) – أ.ن خالفين، المصدر السابق، ص ٦٠؛ جەليلی جەليل، کوردەکانی...، ل ٢١٦، کەندالْ، کورد لە ئيمپراتۆريەتی عوسمانيدا لە : گەلێکی پەژموردە و نيشتمانێکی پەرت، وەرگێڕانی: م. گۆمەيی، (سويد: ١٩٩٨)، ل ٨٨.

(٧) – ا.ن خالفين، المصدر السابق، ص ٦١.

(٨) – ا.ن خالفين، المصدر السابق، ص ٦١

(٩) – سينان هاکان، کورد و بەرخودانەکانی ١٨١٧– ١٨٦٧، لە بەڵگەنامەکانی ئەرشيفی عوسمانيدا، وەرگێڕانی لە توركييەوە: بەکر شوانی، پێشەکی و پياچوونەوەی: دکتۆر جەبار قادر، (هەولێر: ٢٠١٢)، ل ٢٢٨.

(١٠) – کامران عبدالصمد الدوسكي، كردستان في العهد العثماني في النصف الاول من القرن التاسع عشر، (بيروت: ٢٠٠٦)، ص ١٥٤؛ سينان هاکان، س.پ، ل ٢٢٨– ٢٣١.

(١١) – سينان هاکان، س.پ، ل ٢٤٦ – ٢٤٧.

(١٢) – سينان ها کان، س.پ، ل ٢٤٨–٢٤٩.

(١٣) – س.پ، ل ٢٥١–٢٥٣.

١٤– ڕۆهات ئەلاكۆم، کوردەکانی ئەستەمبوڵی کۆن ١٤٥٣– ١٩٢٥، و: ئەحمەد تاقانە، (هەولێر: ٢٠٠٥)، ل ٥٠، کەندالْ، کورد لە ئيمپراتۆر، ل ٨٩.

(١٥) – سينان هاکان، س.پ، ل ٢٥٥.

(١٦) – س.پ، ل ٢٥٥–٢٥٦.

(١٧) – کەمال مەزهەر، کورد و کوردستان لە بەڵگەنامە نهێنییەکانی حوکمەتی بەریتانیادا، ب١، ئامادەکردنی: عەبدوڵڵا زەنگەنە، شەهلا حەیدەری، (لوبنان: ٢٠٠٨)، ل ١٠٣.

(١٨) – صلاح محمد سليم الهروري، الاسرة البدر خانية، ص١٤، رۆهات ئەلەکۆم، س.پ، ل٥٠. عەبدوڵلا زەنگەنە، هەوار و شوێنی لە رۆژنامەنووسی کوردیدا، دۆسیەی تایبەت، رۆژنامەوانی، ژمارە (٥)ی ساڵی دووەم (گۆڤاری سەندیکای رۆژنامەنووسانی کوردستان) ٢٠٠١، ل٣٠١.

(١٩) – سینان هاکان، س.پ، ل ٢٥٧.

(٢٠) – س.پ، ل ٣٠٩–٣١٠.

(٢١) – س.پ، ل ٣١٣.

(٢٢) – جليلي جليل و آخرون، الحركة الكردية في العصر الحديث، دار الرازي، ط١، (بيروت:١٩٩٢)، ص ١٣–١٤؛ كامران عبدالصمد الدوسكي، كردستان في العهد العثماني، ص ١١٩؛ شەمسەدین سامی، کوردو کوردستان لە یەکەم ئەنسکلوپیدیای تورکی لە مێژوودا، و: ئەحمەد تاقانە، چ١، (هەولێر: ٢٠٠٨ )، ل ١٤٧.

(٢٣) – كامران عبدالصمد الدوسكي، المصدر السابق، ص ١٢١–١٢٢.

(٢٤) – محەمەد ڕەسول هاوار، کورد و باکوری کوردستان لە سەرەتای مێژووەوە تا شەڕی دووەمی جیهانی، ب١، (سلێمانی:٢٠٠٦)، ل ٢٨٩؛ كامران عبدالصمد الدوسكي، المصدر السابق، ص ١٥٥.

(٢٥) – انظر: دار الوطني للوثائق، التسلسل ٨٢٧/ ٣١١، رقم الوثيقة (٢)، العراق، وزارة الخارجية، قضية الحدود العراقية – الايرانية، معاهدة ارض روم الثانية ١٨٤٧، ص ٧؛ علي اصغر شميم، ایران در دوره سلطنت قاجار، چاپ یازدهم، (تهران:١٣٨٤)، ل ٢٠٦–٢٠٨، سعید نفیسي، تاریخ اجتماعي وسیاسي ایران در دورة معاصر، (تهران:١٣٨٣)، ل ٦٧٠–٦٧٣.

(٢٦) – نەوشیروان مستەفا ئەمین، کورد و عەجەم، مێژووی سیاسی کوردەکانی ئێران، چ٢، (سلێمانی: ٢٠٠٥)، ل ٥١.

(٢٧) – سینان هاکان، س. پ، ل ٢٧٠–٢٧١.

(٢٨) – نەوشیروان مستەفا ئەمین، س.پ، ل ٥١؛ سینان هاکان، س.پ، ل ٢٧٣–٢٧٤.

(٢٩) – سینان هاکان، س.پ، ل ٢٧٥–٢٧٧.

(٣٠) – س.پ، ل ٢٧٩–٢٨٤.

(٣١) – س.پ، ل ٣١٧–٣١٨.

(٣٢) – محمد علي الصويركي، معجم اعلام الكرد، ص ٧٤٥.

(٣٣)– سینان هاکان، س.پ، ل ٣١٩.

(٣٤) –جەلیلی جەلیل، کوردەکانی، ل ٢٧٧، سینان هاکان، س.پ،ل ٢٨٦، خالید موراد چەتۆیڤ، مێژووی پەیوەندییەکانی کورد و ڕووسیا، لێکۆڵینەوەو بەڵگەنامە، و: نەجاتی عەبدوڵلا، (سلێمانی: ٢٠٠٧)،ل ٤٨.

(٣٥) – عەبدوڵلا عەلیاوەیی، کوردستان لە سەردەمی دەوڵەتی عوسمانیدا لە ناوەڕاستی سەدەی نۆزدەیەمەوە تا جەنگی یەکەمی جیهانی، (سلێمانی: ٢٠٠٤ )، ل ٧٣، سینان هاکان،، س.پ، ل٢٨٨.

(٣٦) – جليلي جليل وآخرون، الحركة الكردية في العصر الحديث، ترجمة: عبدي حاجي، ط١، (بيروت:١٩٩٢ )، ص ٢٣.

٤٢– سینان هاکان، س.پ، ل ٢٩٠–٢٩١، عەبدوڵلا عەلیاوەیی، س.پ، ل ٧٤.

(٣٨) – پ.ی. ئەگیریانۆڤ، کورد لە جەنگی ڕووسیا لەگەل ئێراندا، و: ئەفراسیاو هەورامی، (سلێمانی: ٢٠٠٤)، ل ١٦٠–١٦١، جلیلی جلیل و، ص٢٣–٢٤.

(٣٩) – ا. ن. خالفين، المصدر السابق، ص ٨٠؛ پ.ی.ئەڤریانوڤ، س.پ، ل١٦٢؛ خالید موراد، س.پ، ل ٤٩.

(٤٠) – سینان هاکان، س.پ، ل ٢٩٦؛ ا.ن. خالفين، المصدر السابق، ص ٨١؛ مینورسکی، کورد تێبینی و وردبوونەوە، و: حەمە سەعید حەمە کەریم، (هەولێر: ١٩٨٤ )، ل ٥٦.

(٤١) – سینان هاکان، س.پ، ل ٢٩٨.

(٤٢) – عەبدوڵلا عەلیاوەیی، س.پ، ل٧٩ ؛ سینان هاکان، س.پ، ل ٣٠٢.

(٤٣) – ا.ن، خالفين، المصدر السابق، ص ٨٣؛ سینان هاکان، س.پ، ل ٣٠٣–٣٠٤.

(٤٤) – سینان هاکان، س.پ، ل٣٠٦ ؛ خالید موراد چەتۆییڤ، س.پ، ل ٥٠.

(٤٥) – محمد علي الصويركي، معجم اعلام الكرد في التاريخ الاسلامي والعصر الحديث في كوردستان وخارجها، (السليمانية: ٢٠٠٦ )، ص ٤٧٤.

(٤٦) – محمد علي الصويركي، المصدر السابق، ص ٤٧٤ ؛ سینان هاکان، س.پ، ل ٣٢١.

(٤٧) – جرجيس فتح الله، مبحثان على هامش ثورة شيخ عبيدالله النهري، ط٢، مطبعة التربية، (اربيل:٢٠٠١)، ص ٩٨.

(٤٨) – جليلي جليل وآخرون، المصدر السابق، ص ٣٢.

(٤٩) – جەلیلی جەلیل، ڕاپەڕینی کوردەکان ١٨٨٠، و: کاوس قەفتان، (بەغدا:١٩٨٧)،ل ٥١، محمد الصويركي، مصدر سابق، ص ٤٥٢.

(٥٠) – بڕوانە: عەرەفات کەرەم ستونی، ژیانی ئاینی لە نەهریَ بۆ بەرزان، و: ڕەفیق مەلا کەرەم هەرکی، (هەولێر: ٢٠١١)،ل١٥.

(٥١) – لە تاریکییەوە بۆ ڕووناکی، بەڵگەنامەکانی شۆڕشی ساڵی ١٨٨٠، و: جەمال میرزا، (سلێمانی: ١٩٩٩)، ل ٨٤–٨٥؛ كمال مظهر احمد، دراسات في تاريخ ايران الحديث والمعاصر، (بغداد:١٩٨٥)، ص ٢٣٧.

(٥٢) – جليلي جليل وآخرون، المصدر السابق، ص٣٤.
(٥٣) – عەزیزی شەمزینی،جوولآنەوی ڕزگاری، ل٨٢–٨٦.
(٥٤) – جليلي جليل وآخرون، المصدر السابق، ص ٣٤.
(٥٥) – كمال مظهر احمد، دراسات...، ص ٢٣٨ ؛ شۆڕشی شێخ عوبێدوڵڵای نەهریٚ لە بەڵگەنامەکانی فەرەنسیدا ١٨٧٩–١٨٨٢، وەرگێڕانی: نەجاتی عەبدوڵڵا، (سلێمانی: ٢٠٠٤)، ل ٧٢؛ جەلیلی جەلیل، ڕاپەڕینی، ل ٨٦.
(٥٦) – عەلیاوەیی، ل ١٣١.
(٥٧) – جەلیلی جەلیل، ڕاپەڕینی کوردەکان، ل ١٣٢–٢٣٣.
(٥٨) – جەلیلی جەلیل، ڕاپەڕینی کوردەکان، ل ١٢٠–١٢١ ؛ محەمەد حەمە باقی، بیرەوەرییەکانی سەید عەزیزی شەمزینی ـ زیندەگی من، بنکەی ژین، (سلێمانی:٢٠١١ )، ل ١٠.
(٥٩) – كمال مظهر احمد، دراسات في تاريخ...، ص ٢٣٩؛ محەمەد حەمە باقی، بیرەوەرییەکانی عەزیزی شەمزینی....، ل ١١.
(٦٠) – جەلیلی جەلیل، ڕاپەڕین، ل ١٤١.
(٦١) – وەدیع جویدە، شۆڕشی شێخ عوبێدوڵڵای نەهریٚ لە بەڵگەنامەکانی ئەمەریکی و بەریتانیدا، و: محەمەد حەمە باقی، (هەولێر:٢٠٠٧ )، ل٧٤؛ كمال مظهر احمد، دراسات في...، ص ٢٤٠.
(٦٢)– شۆڕشی شێخ عوبێدوڵڵای نەهریٚ لە بەڵگەنامەکانی وەزارەتی کاروباری دەرەوەی ئێراندا ١٨٨٠، و: محەمەد حەمە باقی، (هەولێر:٢٠٠٧)،ل١٤٥.
(٦٣) – س. پ، ل ١٣٧.
(٦٤) – س.پ، ل ١٤٣.
(٦٥) – محەمەد حەمە باقی، بیرەوەرییەکانی سەید عەزیزی شەمزینی..، ل ١٢؛ شۆڕشی شێخ عوبێدوڵڵای نەهریٚ لە بەڵگەنامەکانی کاروباری دەرەوەی ئێراندا، ل ١٥٠؛ كمال مظهر احمد، دراسات، ص ٢٤٠.
(٦٦) – وەفایی، بیرەوەرییەکانی وەفایی (تحفة المريدين )، و: محەمەد حەمە باقی، (سلێمانی: ٢٠١٠ )، ل ٣٥.
(٦٧) – ئیسماعیل گویڵدا ش، جەمعیەتی تەعالی کوردستان، و: زریان ڕۆژهەڵاتی، بنکەی ژین، (سلێمانی:٢٠١١)، ل ٢٠–٢١.
(٦٨) – ئیسماعیل گویڵداش، س.پ، ل ٢٤.
(٦٩) – جەلیلی جەلیل، بووژانەوەی ڕۆشنبیری و نەتەوەیی کورد، کۆتایی سەدەی نۆزدەیەم و سەرەتای سەدەی بیستەم، و: سدیق سالح،(سلێمانی: ٢٠٠٠)، ل١١٤. عبدالفتاح علي

یحیی، عبدالرزاق بدرخان البوتاني نشاطه الثقافي والسياسي، كاروان، العدد (٦٥)، حزيران ١٩٨٨، ص ١٢٧.

(٧٠) – محەمەد مەلا کەریم، دووبابەت لەبارەی بیرو شیعری حاجی قادری کۆییەوە، چ٢، (هەولێر: ١٠٠٨ )، ل ٩، جەلیلی جەلیل، بووژانەوەی، ل ١١٥، سەردار حەمید میران، کەریم شارەزا، دیوانی حاجی قادری کۆیی، (هەولێر: ١٩٨٦ )، ل ١٣، محمد علي الصويركي، مصدر سابق، ص ٤٢٧.

(٧١) –صلاح محمد هروري، الاسرة البدرخانية، ص ٣٥؛ عبد الفتاح على يحيى، مصدر سابق، ص ١٢٧؛ ڕۆهات ئەڵەکۆم،س.پ، ل ٦٢.

(٧٢)– صلاح محمد سليم هروري، المصدر السابق، ص ٣٥ ؛ جەلیلی جەلیل، بووژانەوەی..، ل ١١٥.

(٧٣) – صلاح محمد سليم هروري، المصدر السابق، ص ٣٦.

(٧٤) – ڕوهات ئەڵەکۆم، کوردەکانی، ل ٥٩– ٦١ ؛ شازادە سورەیا بەدرخان، کێشەی کورد لە ئاست تورکیادا، و: ئەحمەدی قازی، (هەولێر: ٢٠١٠)، ل٨ ؛ مالمیسانژ، جەمعیەتی تەعاون و تەرەقی کورد و ڕۆژنامەکەی، و: زریان ڕۆژهەلأتی، پ: سدیق سالح، (سلێمانی: ٢٠٠٧ )، ل ١٨.

(٧٥) – صلاح محمد سليم هروري، المصدر السابق، ص ٣٨، ڕۆهات ئەڵەکۆم، س.پ، ل ٦١.

(٧٧) – ڕوهات ئەڵەکۆم، س.پ، ل ٦١–٦٣.

(٧٨) – ڕۆهات ئەڵەکۆم،س. پ، ل ٦٥–٦٦.

(٧٩) – عبدالفتاح علي يحيى، المصدر السابق، ص ١٢٨؛ صلاح محمد سليم الهروري، المصدر السابق، ص ٣٧.

(٨٠) – عبد الفتاح علي يحيى، المصدر السابق، ص ١٢٨؛ جەلیلی جەلیل، بووژانەوەی، ل ١٢١.

(٨١) – صلاح محمد سليم هروري، المصدر السابق، ص ٣٨–٣٩.

(٨٢) – المصدر السابق، ص ٦٠.

(٨٣) – عبدالفتاح علي يحيى، المصدر السابق، ص ١٣٣؛ صلاح محمد سليم هروري، المصدر السابق، ص ٧١؛ زنار سلوبي، في سبيل كردستان (مذكرات )، ترجمة: ر. علي، (بيروت: ١٩٨٧ )، ص ١٠١–١٠٢.

## لیستی سەرچاوەکان

**بەڵگەنامەی بڵاونەکراوە:**

**یەکەم / بە زمانی عەرەبی:**

١- الوطني للوثائق، التسلسل ٨٢٧/ ٣١١، رقم الوثيقة (٢)، العراق، وزارة الخارجية، قضية الحدود العراقية - الايرانية، معاهدة ارض روم الثانية ١٨٤٧.

**کتێبی بەڵگەنامەیی و وەرگێڕدراو:**

١- خالید موراد چەتۆیڤ، مێژووی پەیوەندییەکانی کورد و ڕووسیا، لێکۆڵینەوەو بەڵگەنامە، و: نەجاتی عەبدوڵڵا، (سلێمانی: ٢٠٠٧).

٢- سینان هاکان، کورد و بەرخودانەکانی ١٨١٧- ١٨٦٧، لە بەڵگەنامەکانی ئەرشیفی عوسمانیدا، وەرگێڕانی لە تورکییەوە: بەکر شوانی، پێشەکی و پیاچوونەوەی: دکتۆر جەبار قادر، (هەولێر: ٢٠١٢).

٣- شۆڕشی شێخ عوبێدوڵڵا ی نەهریّ لە بەڵگەنامەکانی فەرەنسیدا ١٨٧٩-١٨٨٢، و: نەجاتی عەبدوڵڵا، (سلێمانی:٢٠٠٤ )

٤- شۆڕشی شێخ عوبێدوڵڵای نەهریّ لە بەڵگەنامەکانی وەزارەتی کاروباری دەرەوەی ئێراندا ١٨٨٠، و: محەمەد حەمە باقی، (هەولێر:٢٠٠٧)

٥- کەمال مەزهەر، کورد و کوردستان لە بەڵگەنامە نهێنییەکانی حوکمەتی بەریتانیادا، ب١، ئا: عەبدوڵڵا زەنگەنە، شەهلا حەیدەری، (لوبنان: ٢٠٠٨).

٦- لە تاریکییەوە بۆ ڕووناکی، بەڵگەنامەکانی شۆڕشی ساڵی ١٨٨٠، وەرگێڕانی: جەمال میرزا عەزیز، (سلێمانی: ١٩٩٩)..

٧- وەدیع جویدە، شۆڕشی شێخ عوبێدوڵڵای نەهریّ لە بەڵگەنامەکانی ئەمەریکی و بەریتانیدا، و: محەمەد حەمە باقی، (هەولێر: ٢٠٠٧).

**دووەم / بە زمانی عەرەبی:**

١- الكرد في الوثائق العثمانية، ترجمة: عثمان علي، (ا ربيل: ٢٠١٠).

٢- خليل علي مراد، مختارات من كتاب الموصل وكركوك في الوثائق العثمانية، مؤسسة ژين (السليمانية: ٢٠٠٥).

## کتێبی چاپکراو و وەرگێڕدراو

**یەکەم / بە زمانی کوردی:**

١- ئیسماعیل گویڵداش، جەمعیەتی تەعالی کوردستان، وەرگێڕانی: زریان ڕۆژ هەڵاتی، بنکەی ژین، (سلێمانی: ٢٠١١ ).

٢- پ.ی. ئەگیریانۆڤ، کورد لە جەنگی ڕووسیا لەگەڵ ئێراندا، وەرگێڕانی لە ڕووسییەوە: ئەفراسیاو هەورامی، (سلێمانی: ٢٠٠٤).

٣- جەلیلی جەلیل، ڕاپەڕینی کوردەکان ١٨٨٠، وەرگێڕانی: کاوس قەفتان، (بەغدا:١٩٨٧).

٤- جەلیلی جەلیل، کوردەکانی ئیمپراتۆریەتی عوسمانی، وەرگێڕانی: کاوس قەفتان، (بەغدا: ١٩٨٧).

٥- جەلیلی جەلیل، بووژانەوەی ڕۆشنبیری و نەتەوەیی کورد، کۆتایی سەدەی نۆزدەیەم و سەرەتای سەدەی بیست، و: سدیق سالح، (سلێمانی: ٢٠٠٠ )

٦- ڕۆهات ئەلاکۆم، کوردەکانی ئەستەمبووڵی کۆن ١٤٥٣- ١٩٢٥، وەرگێڕانی لە تورکییەوە: ئەحمەد تاقانە، (هەولێر: ٢٠٠٥).

٧- سەردار حەمید میران، کەریم شارەزا، دیوانی حاجی قادری کۆیی، (هەولێر: ١٩٨٦ ).

٨- شازادە سورەیا بەدرخان، کێشەی کورد لە ئاست تورکیادا، وەرگێڕانی لە ئینگلیزییەوە: ئەحمەدی قازی، (هەولێر: ٢٠١٠).

٩-شەمسەدین سامی، کورد و کوردستان لە یەکەم ئەنسکلوپیدیای تورکی لە مێژوودا، و: ئەحمەد تاقانە، چ١، (هەولێر: ٢٠٠٨).

١٠- عەبدولعەزیز یامولکی، کوردستان و ڕا پەڕینەکانی کورد، وەرگێڕانی: شێرزاد کەریم، چ١، (سلێمانی:١٩٩٩).

١١- عەبدوڵڵا عەلیاوەیی، کوردستان لە سەردەمی دەوڵـەتی عوسمانیـدا لـە ناوەڕاسـتی سەدەی نۆزدەیەمەوە تا جەنگی یەکەم، (سلێمانی:٢٠٠٤).

١٢- عەرەفات کەرەم ستونی، ژیانی ئاینی لە نەهریَ بـۆ بـەرزان، وەرگێڕانـی: ڕەفیـق مەلا کەرەم هەرکی، (هەولێر: ٢٠١١).

١٣- عــەزیزی شــەمزینی، جووڵانــەوەی ڕزگــاری نیشــتمانی کوردســتان، و: فەریــد ئەسەسەرد، (سلێمانی: ١٩٩٨ ).

١٤- کـەلیموڵلای تەوەحـدی، کۆچـی مێـژوویی کـورد بـۆ خۆراسـان، ب ١، وەرگێڕانـی: عەدنان بەرزنجی، (سلێمانی: ٢٠٠٥).

١٥- کۆمەڵێك نووسەر، کورد لـە ئیمپراتۆریـەتی عوسمانیـدا لـە: گـەلێکی پـەژموردە و نیشتمانێکی پەرت، و: م. گۆمەیی، (سوید: ١٩٩٨ ).

١٦- محەمەد ڕەسول هـاوار، کـورد و بـاکوری کوردسـتان لـە سـەرەتای مێـژووەوە تـا شەڕی دووەمی جیهانی، ب١، (سلێمانی: ٢٠٠٦).

١٧- محەمەد حەمە باقی، بیرەوەرییـەکانی سـەید عـەزیزی شـەمزینی، زینـدەگی مـن، بنکەی ژین، (سلێمانی: ٢٠١١).

١٨- محەمەد مەلا کەریم، دوو بابەت لەبارەی بیر و شـیعری حـاجی قـادری کۆییـەوە، چ٢،(هەولێر: ٢٠٠٨ ).

١٩- مالمیسانژ، جەمعیەتی تەعاون و تەرەقی کورد و ڕۆژنامەکەی، وەرگێڕانی: زریـان ڕۆژهەلاَتی، بنکەی ژین، (سلێمانی:٢٠٠٧).

٢٠- مینورسکی، کورد تێبینی و وردبوونەوە، وەرگێڕانی: حەمە سەعید حەمە کـەریم، (هەولێر:١٩٨٤ )

٢١- نەوشیروان مستەفا ئەمین، کورد و عەجەم، مێژووی سیاسـی کوردەکـانی ئێـران، چ٢، (سلێمانی: ٢٠٠٥ ).

٢٢- وەفایی، بیرەوەرییـەکانی وەفـایی (تحفـة المریـدین )، و: محەمـەد حەمـە بـاقی، (سلێمانی: ٢٠١٠ ).

**دووەم/ بە زمانی عەرەبی:**

١- احمد عثمان ابوبكر، الآثار الكاملة، اعداد: الدكتور آزاد عبيد صالح، ج٢، (السليمانية: ٢٠١٠).

٢- ا.ن خالفين، الصراع على كوردستان المسالة الكردية في العلاقات الدولية خلال القرن التاسع عشر، ت: احمد عثمان ابو بكر، (بغداد:١٩٦٩)

٣- بله ج شيركو، القضية الكردية، ماضي الكرد وحاضرهم، مطبعة السعادة، (القاهرة: ١٩٣٠).

٤- جرجيس فتح الله، مبحثان على هامش ثورة شيخ عبيدالله النهري، ط٢، مطبعة التربية، (اربيل:٢٠٠١ ).

٥- جليلي جليل و آخرون، الحركة الكردية في العصر الحديث، دار الرازي، ط١، (بيروت: ١٩٩٢).

٦- زنار سلوبي، في سبيل كردستان (مذكرات )، ترجمة: ر. علي، (بيروت: ١٩٨٧ ).

٧- صلاح محمد سليم هروري، الاسرة البدرخانية، نشاطها السياسي والثقافي ١٩٠٠- ١٩٥٠، (دهوك: ٢٠٠٤).

٨- عثمان علي، دراسات في الحركة الكردية المعاصرة ١٨٣٣- ١٩٤٦، (اربيل: ٢٠٠٣).

٩- كامران عبدالصمد الدوسكي، كردستان في العهد العثماني في النصف الاول من القرن التاسع عشر، (بيروت: ٢٠٠٦).

١٠- كمال مظهر احمد، دراسات في تاريخ ايران الحديث والمعاصر، (بغداد:١٩٨٥).

١١- محمد علي الصويركي، معجم اعلام الكرد في التاريخ الاسلامي والعصر الحديث في كوردستان وخارجها، (السليمانية: ٢٠٠٦ ).

**سێیەم/ بەزمانی فارسی:**

١- بابا مردوخ روحانى، تاريخ مشاهر كرد، جلد سوم، (تهران: ١٣٨٢ ).

٢- سعيد نفيسى، تاريخ اجتماعى و سياسى ايران در دورة معاصر، (تهران:١٣٨٣ ).

٣- على اصغر شميم، ايران در دوره سلطنت قاجار، چاپ يازدهم، (تهران:١٣٨٤ ).

**لێکۆڵینەوە و بابەتی بڵاوکراوە:**

**یەکەم / بەزمانی کوردی:**

١– سەرتیب هەمەوەندی، دوورخستنەوەی هەمەوەند بۆ تەرابلسی ڕۆژ ئاوا لە ئەفریقیا، کەرکووك، ژمارە (٢٧ )، ٢٠٠٦.

**دووەم/ بە زمانی عەرەبی**

١– عبدالفتاح علي يحيى، عبدالرزاق بدرخان البوتاني نشاطه الثقافي والسياسي، كاروان، العدد (٦٥)، حزيران ١٩٨٨.

٢– هيثم مزاحم، الاكراد في مصر... من الايوبيين الى محمد علي باشا، الديمقراطي، ٧/كانون الاول /٢٠١٢

## ملخص البحث

هذا البحث يسلط الضوء على ظاهرة إبعاد الشخصيات وقادة الكرد الى المنفى خصوصا في القرن الاخير من الحكم العثماني (١٨٤٧–١٩١٤). كانت عملية قمع وإخماد كل تلك الانتفاضات والحركات الكردية مدبراً من قبل الدولة العثمانية، والتي لاتزال سياستها قائمة من خلال الاتراك المتوارثين لهم. قسم البحث الى محاور يتناول الأول منها حكم الامير بدرخان باشا البوتاني وصراعه مع الدولة العثمانية، والثاني يتعلق بشخصية (نورالله بگ الهكاري) وكيفية لجوئه الى الدولة القاجارية (١٧٩٦–١٩٢٥) في ايران، لاسيما بعد انتكاسته امام العثمانيين، اما الثالث فيتعلق بانتفاضة (يزدانشير) وانقلابه على الامير بدرخان باشا البوتاني وانحيازه الى جانب العثمانيين، من ثم انقلابه وتمرده على الدولة العثمانية، خلال حرب القرم (١٨٥٣–١٨٥٦) بين الدولتين العثمانية والروسية، وأما المحور الرابع فقد تناول بشكل وجيز انتفاضة الشيخ عبيدالله النهري عام ١٨٨٠ والمخطط الدولي الذي كان وراء اجهاض ثورته واعتقاله وارساله الى الاستانة ومنها الى الطائف ووفاته هناك عام ١٨٨٣. وفيما يتعلق بالمبحث الخامس والاخير يتناول سيرة كل من عبدالرزاق بگ بدرخان وعلي شامل باشا وكيفية اعتقالهما بتهمة اغتيال رئيس بلدية إسطنبول ومسؤول الملف الامني لدى السلطان عبدالحميد الثاني (١٨٧٦–١٩٠٩) رضوان باشا عام ١٩٠٦ والتي أدت الى ابعادهما ونفيهما الى مدينة طرابلس الغرب في ليبيا ومن ثم محاكمتهما من قبل محكمة عسكرية عثمانية والحكم عليهما بالاعدام، والذي لم ينفذ اثر إنقلاب (الاتحاد والترقي) عام ١٩٠٨ وتسنمها للسلطة.

أظهر البحث أن السياسة العثمانية، بعد قرارها بالقضاء على الامارات الكردية تركزت على ضرورة إبعاد قادة وزعماء تلك الامارات والانتفاضات الكردية الى خارج كوردستان ومنعهم من الأتصال بالسكان المحليين وقطع الطريق عليهم وعلى أبنائهم وأحفادهم من العودة الى مواطنهم والأتصال مع الناس درءاً لخطر إنتفاضتهم ضد السلطة العثمانية.

## Abstract

This study sheds light on banishment of Kurdish personalities and leaders to exile in the last quarter of the Ottoman rule 1847-1914. The repression campaigns of all the uprisings and Kurdish movements were accurately planned for by the Ottoman state the policies of which still survive and are retained by the inheriting Turks nowadays.

The study falls into several topics; the first highlights prince Badirkhan pasha Botany's rule and his disputes with the Ottoman State, while the second topic is about Abdulla Beg of Hakari and his seeking refuge in the Qajari state (1796-1925) of Iran after his defeat against the Ottomans. The third topic explores YazdanSher's revolt and the coup he made on prince Badirkhan Pasha, his alignment with the Ottomans, and his subsequent revolt against the Ottomans in the Crimean war 1853-1856 between the latter and the Russians. The fourth topic, however, touches upon Sheikh UbaidullahNahri revolution in 1880 and the international conspiracy behind his defeat, arrest, and banishment to Istanbul and then to Hijaz which ended in his death in 1883. The last topic examines the biography of Abdulrazzaq Beg Badirkhan and Ali Shamil Pasha and their detention on charges of assassinating Istanbul mayor and security file director by Sultan Abdulhameed the second. This charge led to their banishment to Tripoli in Libya and then their trial by a martial court which sentenced them to death though the sentence was not implemented due to the Ittihad and Turaqqi coup in 1908.

The study has demonstrated that the Ottoman policy following the annihilation of the Kurdish emirates focused on banishing the Kurdish revolution leaders out of the state to prevent them from having contact with local people who intend to revolt against the Ottoman authorities.

# قانوندانانی تورکی و کورد*

نووسینی: پڕۆفیسۆر م. ئە. هەسراتیان
وەرگێڕانی: پرۆفیسۆر جەبار قادر

دۆزی کـورد لـەم سـالأنەی دواییـدا پـەرە دەسـێنێ و توندوتیـژی بـەخۆوە دەبینێ، گەوهەر و ناوەڕۆکی دۆزەکە لە چەوساندنەوەی کـورد و پەراوێزخسـتنی ناوچە کوردییەکان و بێبەشکردنی گەلی کورد، کە ژمارەی دەگاتە چـەندین ملیـۆن لە مافە سیاسییەکانی، وەکو گەلێکی جیاواز هـانی کـورد دەدات بـۆ خـەبات. ئـەو سیاسـەتە بووەتـە هـۆی دواکـەوتنی کۆمەڵگـەی کـوردی لـە هـەموو بوارەکانـدا سەرچاوە دەگرێ.

دۆزی کورد پێگەیەکی گرنگ لە ژیانی سیاسی و کۆمەڵایەتی تورکیا دەبینێ، چـونکە بـە شـێوازێکی تونـد کـار دەکاتـە سـەر هـەموو پرۆسـە کۆمەڵایەتییـە— ئابوورییەکان و سیاسییە— نەتەوەییـەکان لـەو وڵاتـەدا. لەگـەڵ هـەموو ئەوەشـدا بەدرێژایی تەمەنی ڕژێمی کۆماری، دەسەڵاتدارانی تورکیا تەنانەت یەك قانونیان بۆ چارەسەرکردنی عادیلانەی دۆزی کورد دەرنەکردووە. سەرباری ئـەوە بـە درێـژایی ئـەو سـەردەمە سیاسـەتێکی ڕەگەزپەرسـتانەیان بەرامبـەر بـە هاووڵاتیـانی کـورد گرتۆتەبەر. ئەو سیاسەتە بووە هۆی زنجیرەیـەك ڕاپـەڕینی یـەك لـە دوای یـەك لـە بیستەکان و سییەکانی سەدەی بیستەمدا و پەرەسـەندنی بزووتنـەوەی نەتـەوەیی ڕزگاریخوازی کورد لە دوای شەڕی دووەمی جیهـانی، بـە تایبـەتی پـاش کۆدەتـای ٢٧ ئایاری ١٩٦٠. دوای ئەو کودەتایە ژیانی سیاسی لە تورکیا هەندێ بووژایەوە و هێزە چەپ و پێشکەوتووخوازەکان چالاکانە کەوتنـە کـار و بزاڤـی کـوردیش لـە پێناوی مافە نەتەوەییەکانی گەلەکەیدا هەمان ڕێگای گرتەبەر.

زنجـیرە ڕاپەڕینـەکانی نـەبڕاوەی کـورد لـە بیسـتەکان و سـییەکانی سـەدەی بیستەمدا لە ویلایەتە ڕۆژهەڵاتییەکانی تورکیا، هەمیشە ئـەوەی دەخسـتە ڕوو کـە

فاکتـــەرە کاریگـــەرەکانی ئـــەو ڕاپەڕینانـــە، فـــرە ڕەهەنـــدن و پێویســـتییان بـــە چارەســـەری سیاســـی، قـــانونی ....هتـــد هەیـــە. بـــەڵام ناوەنـــدە کاربەدەســـتەکانی تورکیا هەوڵیان دەدا دۆزی کورد تەنها لە ڕێگای سەربازی، ئـەمنی و کارگێڕییـەوە سەرکوت بکەن، هەروەها پەنایان دەبردە بەر دەرکردنی کۆمەڵێ قـانون و بڕیـاری قـانونی، کـە بـۆ سـەرکوتکردنی بزووتنـەوەی ڕزگـاریخوازی کـورد لـەو وڵاتـە بـەکاردەهێنران. بـەو شـێوەیە دۆزی کـورد هـەر لـە دەسـتپێکی بزووتنـەوەی کەمالییەوە بووە بابەتێکی بگرەوبەردە لە کۆنگرەکانی ئەرزەڕووم و سیواس، کـە لە تەمووز و ئەیلوولی (١٩١٩) دا گیران. بەڵام لـە کۆتاییـدا بڕیـار و بانگـەوازەکانی ئەو کۆنگرانە دەریانخست کە ناسیۆنالیستە تورکەکان خۆیـان لـە دەرکردنـی هـەر بڕیارێك دەربارەی مافی کورد گێل کرد. نەك هـەر ئـەوە بەپێچـەوانەوە لـە هـەوڵی ئەوەدا بوون بڕیارێکی وا دەرکەن، کە هەموو موسڵمانەکان، بە کوردیشەوە، ناچار بکات. بەشداری لـە جەنگێکـدا بکـەن، کـە ئەنجامەکـەی بـە لـەنێوبردنی بیرۆکـەی دامەزرانـدنی دەوڵـەتی سـەربەخۆ بـۆ کـورد و ئەرمەنـەکانی دانیشـتوانی تورکیـا کۆتایی هات.

بڕیارەکانی کۆنگرەکانی ئەرزەڕووم و سیواس و هەروەها میساقی میللـی کـە لـــە کـــانوونی دووەمـــی ســـاڵی ١٩٢٠ دا لـــە لایـــەن ئەنجوومـــەنی مەبعووســـانی عوسمانییەوە بڕیاری لەسەر درا، ئەوەیان دەگەیاند کە کەمالییەکان لەگەڵ هەموو ئەو پەیمانانەی بە کوردیان دەدا، نەیاندەویست ئۆتۆنومی بە کـورد بـدەن، نـە لـە چیوارچـیوەی تورکیـادا و نـە بـە هـیچ شـێوەیەکی دی مافێکیـان پێیـان بـەڕەوا نـەدەدی و هـەوڵیان دەدا هیـوا و ئـارەزووە ڕزگاریخوازەکانیـان لـە بەرژەوەنـدی بزووتنەوەی نەتەوەیی تورکدا بەکار بێنن، بۆ ئەمەش دروشمی یـەکێتی ئـایینی و کولتووری و ئامانجی هاوبەشیان بـەرز دەکـردەوە. وەهـا سیاسـەتێك، نـەك تـەنها یارمـەتی چارەسـەرکردنی دۆزی کـوردی نـەدا، بـەڵکو بـووە یـەکێك لـە هۆیـە سەرەکییەکانی گرگرتنی ڕاپەڕینەکانی کورد لە سەردەمی هاوچەرخدا.

لـە بەرامبـەر ڕاپەڕینـە یـەك لـە دوای یەکـەکانی کـورد لـە دژی دەسـەڵاتی ئەنقـەرە، ئەنجوومـەنی مـەزنی نیشـتمانی تورکیـا (TBMM) دەسـتی کـرد بـە

دەرکردنــی زنجــیرە قــانون و بڕیارێــك، کــە دەبوایــە هــەر ســەر بــەرز کردنــەوە و هەوڵێکی کوردەکانی لە دژی کەمالییەکان دابمرکانایەتەوە.

بەم شێوەیە ئەو ئەنجوومەنە قانونی ژمارە (٢) ی لە (٢٩ نیسـانی ١٩٢٠) بـە نێوی ( قانونی تاوانکاری و خیانەتی نیشتمانی دەرکرد). لـە (١١ ئـەیلولی) هـەمان ساڵدا قانونی ژمارە (٢١) کـە لـە (قـانونی سـەربازە هـەڵهاتووەکان) پێناسـە کـرا، دەرکـرد و لـە (تـەموزی ١٩٢٢) قـانونی ژمـارە (٢٤٩) واتـە (قـانونی سـەرلەنوێ ڕێکخستنەوەی دادگاکانی سەربەخۆ) بوو و لە ئۆکتۆبەری ساڵی ١٩٢٣ (قانونی لـە نێوبردنی چەتەگەری) دەرکرد.

ئـەو قانونانـەی سـەرەوە لـە لایـەن دەسـەڵاتدارانی تورکیـاوە بـە بـەربڵاوی بەرامبەر بە بەشـدارانی بزووتنـەوەی کـوردی، واتـە کـوردە ڕاپـەڕیوەکان، کـە لـە چاپەمەنیی میری تورکیادا بە  چەتە و ڕێگر نێودەبران، پەیڕەو دەکرا. سیاسـەتی ڕەگەزپەرسـتی  و ڕەتکردنـەوەی مافــە نەتەوەییــەکانی کــورد، تورکیــا بــە شــێوەیەکی فــراوان لــە یەکــەم قــانونی بنگــەیی کۆمــاری تورکیــادا، واتــا لــە ((دەستوور)) کە لە لایەن ئەنجوومەنی مەزنی نیشتمانی تورکیاوە لە سـاڵی ١٩٢٤ دانرا بە زەقی ڕەنگی دایەوە. ئەم بەندانەی خـوارەوەی ئـەو دەسـتوورە شـایەتی ئەو وتەیەن:

بەندی ((٦٨)) ((هەموو تورکێك بە ئازادی دێتە دونیاوە.....))

بەندی ((٦٩)) (( هەموو تورکەکان بەرامبەر بە قانون یەکسانن))

ئەی ئەگەر تورك نەبی و ئەندامی یەکێ لە گەلانی تری تورکیا بی، دەبێ چۆن هەڵســوکەوتت لــە تەکــدا بکرێــت، لەگــەڵ کەمینــە نەتەوەییەکانــدا، لەگــەڵ کوردەکانا؟. وا دیارە بەندی ((٨٨)) ڕێـك وەڵامـی ئـەو پرسـیارە دەداتـەوە، لـەو بەندەدا هاتووە (( هەموو دانیشتوانی تورکیا سەر بە هەر ئاین و ڕەگـەزێك بـن بـە تورك دەژمێردرێن....))

بەڵام هەموو ئەمانە هیچیان لە مەسەلەکە نە دەگۆڕی، چـونکە ئـەو گەلانـەی لە تورکیـادا دەژیـان نـەیان دەویسـت، نەشـیان دەتـوانی ببنـە تـورك. کوردەکـان نەیاندەویست بکرێنە تورك و هـەوڵ و تەقـەڵایان دەدا و خـەباتی ئـەوەیان دەکرد

تایبەتمەندییە نەتەوەییەكانی خۆیان بپارێزن، سەربەخۆیی وەدەست بێنن و دژی چەوساندنەوەی نەتەوەیی ناوەندە سەردەستەكانی توركیا ڕادەپەڕین. ڕاپەڕینی شێخ سەعیدیش هەر لەم چوارچێوەیەدا بوو. سەركوتكردنی ئەم ڕاپەڕینە كە چواردە ویلایەتی ڕۆژهەڵاتی توركیای (باكوری كوردستان) گرتەوە، دەسەڵاتدارانی توركیا، بێجگە لە ڕێكاری سەربازی و ئەمنی، كۆمەڵێ قانون و بڕیاریانیش بۆ دامركاندنی دەركرد. ئا بەم شێوەیە لە (٢٥ شوباتی ساڵی ١٩٢٥) (TBMM) بەندی یەكەمی (( قانونی خیانەتی نیشتمانی))، واتە قانونی ژمارە (٥٥٦)، كە لە ١٥ نیسانی ١٩٢٣ دەرچووبوو، گۆڕی. بە پێی ئەم گۆڕانكارییە لەو كاتەوە ئیتر قانون ڕێگای نەدەدا بە دامەزراندنی ڕێكخراوی سیاسی لە سەر بنەمای ئایینی، هەروەها بەكارهێنانی ئایینی بۆ وەدەستهێنانی ئامانجی سیاسی قەدەغە كرد.

سەرباری ئەوە دوای مشتومڕێكی زۆر و توند لە نێوان ناسیۆنالیستە توندڕەوەكان و نەیارە لیبڕالییەكانیاندا لە (٤ مارتی ١٩٢٥) قانونی ژمارە (٥٧٨) لە بارەی ( پاراستنی هێمنی و ئاسایشەوە) قانونێك لەلایەن ئەنجوومەنەوە بڕیاری لەسەردرا. ئەم قانونە دەسەڵاتێكی یەكجار زۆری بە حكومەت دەدا بۆ سەركوتكردنی ڕاپەڕینەكان و هەر چالاكییەكی تری نەیارانی حكومەت.

هەروەها لە (٢٢ نیسانی ساڵی ١٩٢٥) قانونی ژمارە (٦٣٥) دەركرا لە بارەی گۆڕینی گەلێ لە بەند و ماددەكانی (( قانونی تاوانكاری)) ولات. بە پێی ئەم قانونە ئەو كەسانەی هەوڵ دەدەن دەستووری كۆماری بگۆڕن، یاخود بە یەكجاری لە نێوی بەرن، هەروەها ئەنجوومەنی نیشتمانی بڵاوە پێبكەن، یاخود تەگەرە بخەنە بەر جێبەجێكردنی ئەركەكانی سەر شانی، هانی میللەت دەدەن دژی میری ڕاپەڕینی چەكدارانە بەرپا بكات، یاخود بەشێك لە دانیشتوانی توركیا بكەن بەگژ بەشێكی تریدا، دەبێ فەرمانی لە سێدارەدان و مردنیان بۆ دەربكرێ.

دەركردنی ئەم قانونانە لە ڕاستیدا بووە هۆی لە نێوبردنی هەموو چالاكییەكی بەرهەڵستكاران، هەروەها هەموو ئازادییەكان سنووردار كران تەنانەت ئەوانەش،

کە لە لایەن دەستوورەوە ڕێگایان پێدرابوو، ئەم هەنگاوانە ڕێگایان خۆش کرد لەبەردەم پەیدابوونی دەسەڵاتی تاکڕەوانە و دیکتاتۆرییانەی کەمالییەکاندا.

پەرلەمانی تورکیا بۆ درێژەدان بە سیاسەتی توانەوە و بە تورککردنی دانیشتوان لە (٣١ مایسی ١٩٢٦) قانونی ژمارە ٨٨٥ لە ژێر ناوی (( قانونی ڕاگوێزانی)) دەرکرد. ئەم قانونە مافی ئەوەی دەدا بە ئەنجوومەنی وەزیران، هۆزە کۆچەرەکان رابگوێزرێ بۆ ئەو ناوچانەی دانیشتوانیان کەمە. هەروەها دانیشتوانی ئەو دێیانەی، کە گوایە لە بەر هۆی تەندروستی و نەبوونی کەرەسەکانی ژیان، ئابوورییان خراپە، جگە لەو کەسانەی کە لەسەر سنوور دەژیان و گومانی سیخوڕێتیان بۆ بێگانە لێ دەکرا دەبوایە بگوێزرێنەوە لە سنوورەکان دوور بخرابایەنەوە. وەکو پاشکۆیەکیش بۆ ئەم قانونە لە (١٠ حوزەیرانی ساڵی ١٩٢٧) ئەنجوومەنی تورکیا قانونی ژمارە (١٠٩٧) لە بارەی ڕاگوێزانی کوردەکانی لە ویلایەتە ڕۆژهەڵاتییەکانەوە بۆ ویلایەتە ڕۆژئاواییەکانی تورکیای دەرکرد. لەو قانونەدا ئەمە هاتبوو (بە هۆی کارگێڕی، سەربازی و کۆمەڵایەتییەوە میری مافی ئەوەی دراوەتێ، کە لە ویلایەتەکانی ڕۆژهەڵاتەوە کە باری نائاسایی دەیانگرێتەوە، هەروەها لە ویلایەتی بایەزیدەوە هەزار و چوارسەد کەس لەگەڵ بنەماڵەکانیاندا و (٨٠) خێزانی یاخیبوو و هەموو ئەو کەسانەی تاوانبار کراون بە تاوانکاری لەو ویلایەتانە بۆ ناوچە ڕۆژئاواییەکانی وڵات بگوێزرێنەوە. بەندی یەکەمی قانونەکە ئەگەر ئەوە لە بیر نەکەین، کە خێزانی کورد زۆر گەورەیە و وەك باوە لە دوو یا زیاتر وەچە پێکهاتووە، ئەوا بۆمان دەردەکەوێ کە ژمارەی ئەوانەی کە بەزۆر ڕاگوێزران گەلێ زۆر بوون. بە گوێرەی زانیارییەکانی ڤاسیلی نیکتین لە ساڵانی (١٩٢٦-١٩٢٧) دەسەڵاتدارانی تورکیا، نزیکەی ملیۆنێك کوردیان بەزۆر ڕاگوێزا، پیاو و ژن و منداڵ، بۆ ڕۆژئاوای ئەنادۆڵ و بە شێوەیەکی نامرۆڤانە و بێبەزەییانە، هەروەك ڕاگوێزانی ئەرمەنەکان لە کاتی جەنگی یەکەمی جیهانیدا. سیاسەتی تۆقاندن و باری نائاسایی لە ویلاتەکانی ڕۆژهەڵات کە لە ڕاستیدا بەدرێژایی ساڵانی دەسەڵاتی کەمالییەکان بەردەوام بوو، بوونە هۆی ئاڵۆزکردنی باری سیاسی وڵات و ئامانجی چاوەڕوانکراوی وەدەست نەهێنا، لەبەر

ئەوە فەرمانڕەوایانی تورك لە هاوینی ساڵی (١٩٢٧) دا بریارپیان دا پەنا بەرنە بەر میتۆدێکی نوێی بەڕێوەبردن لە ویلایەتەکانی ڕۆژهەلأت.

(٢٥ حوزیرانی ١٩٢٧) پەرلەمانی تورکیا قانونی ژمارە (١١٦٤)ی دەرکرد، کە مافی دەدا بە ئەنجوومەنی وەزیران بە پێی پێویست بەڕێوەبەرایەتی (پشکنینی گشتی)، کە هەریەکەیان چەند ویلایەتێکی هەمان ناوچەی دەخستە ژێر رکێفی خۆیەوە، دابمەزرێت. لە (٢٧ تۆڤەمبەری) هەمان ساڵدا حکومەتی تورکیا بڕیارێکی دەرکرد، کە ئەرك و مافەکانی ئەم دەزگایەی دەستنیشان دەکرد. بە پێی ئەو بڕیار و ڕێنمایییانە ویلایەتەکانی ئورفە، ئەلعەزیز، بدلیس، هەکاری، دیاربەکر، سێرت، ماردین و وان کران بە هەرێمێکی ئیداری تایبەت، کە لە دواییدا نێوی هەرێمی (یەکەمینی پشکنینی گشتی) لێ نرا.

دەسەلأتی پشکێنەری گشتی ناوچەیەکی دەگرتەوە، کە بریتی بوو لە زیاتر لە سەد و حەوت هەزار کیلۆمەتری چوارگۆشە، و بە گوێرەی (سەرژمێری) (١٩٢٧) نزیکەی ٩٠٠ هەزار کەسی لێ دەژیان.

لێکدانەوەی برگەکانی ئەم ڕێنمایییانە ئەوەمان بۆ دەردەخات، کە پشکێنەری گشتی لە ڕاستیدا دەسەلأتێکی بێ سنووری لە کوردستانی تورکیادا هەبووە. لە پەرەسەندنی بزووتنەوەی نەتەوەیی کوردیدا، بە تایبەتی لە چیاکانی ئارارات، کاربەدەستانی تورکیا هەوڵیان دەدا دەستە و توێژە سەردەستەکانی کورد بەلای خۆیاندا ڕابکێشن، بۆ ئەم مەبەستە هەندێ بڕیاریان دەرکرد بۆ گەڕانەوەی هەندێ لە دەرەبەگە کوردەکان بۆ کوردستان. لە (٧ ئایاری ١٩٢٨) ئەنجوومەنی مەزنی نیشتمانی تورکیا قانونی لێبووردنی ژمارە (١٢٣٩) دەرکرد. بە پێی ئەو قانونە ئەو کوردانەی کە بەهۆی بەشداریکردن لە ڕاپەڕینی شێخ سەعیدا سزا درابوون، بەر لێخۆشبوون کەوتن. بە پێی بەندی یەکەمی قانونەکە ئەو کردەوانەی، کە لە کاتی ڕاپەڕینەکەدا و دوای ئەوەش تاوەکو لابردنی باری نائاسایی لە ناوچەی ڕاپەڕینەکەدا کراون، واتە تا (٢٣ نۆڤەمبەری ١٩٢٧) ئیتر بە تاوان دانەندران. لە (١٢ ئایاری ١٩٢٨) ئەنجومەن پاشکۆیەکی بۆ قانونی (٧ ئایار ١٩٢٨) دەرکرد، بە پێی ئەم پاشکۆیە، ئیتر واز لە ڕاونانی ئەو کوردانە هێنرا، کە

لە پێش (٣٠ نیسانی ١٩٢٨) ئەو کردەوانەیان ئەنجام دابوو، کە لە لایەن دادگاوە تاوانبار دەکران. ئەمەش تەنها بەو مەرجە بوو، کە ئەوانەی بەو کردەوانە تاوانبار کراون خۆیان بەدەستەوە بدەن. لە دواییدا ماوەی ئەم قانونە، کە بۆ سێ مانگ بوو، بۆ (٦) مانگی تر درێژ کرایەوە. بەڵام ئەم هەموو بگرەوبەردەیە ئامانجە چاوەڕوانکراوەکانی بۆ دەسەڵاتدارانی تورکیا مەیسەر نەکرد.

کاربەدەستەکانی تورکیا، جگە لە کردەوە سەربازییەکان، هەندێ هەنگاوی تریان نا، کە بە بۆچوونی خۆیان، دەبوایە باری نالەباری ڕۆژهەڵاتی ئەنادۆڵ خامۆش و هێمن بکەنەوە. هێشتا لە بەهاری ساڵی (١٩٢٧) دا بوو، کە حکومەتی تورکیا پرۆژەی قانونێکی ئامادە کردبوو لەبارەی دابەشکردنی زەوی دەرەبەگە کوردە دوورخراوەکانەوە بۆ ناوچەکانی ڕۆژئاوای ئەنادۆڵ، بەسەر جووتیارە بێ زەوییەکاندا، یاخود ئەوانەی کە زەوییەکی کەمیان هەبوو. بەڵام تەنها دوای دوو ساڵ واتە لە (٢ حوزەیرانی ١٩٢٩) ئەنجومەن قانونی ژمارە (١٥٠٥) لە بارەی ئەو زەوییانەوە، کە دەبوایە لە نێوان جووتیارانی ویلایەتە ڕۆژهەڵاتییەکاندا دابەش بکردبایە دەرکرد. بە پێی ئەو قانونە و بە گوێرەی سەرچاوە میرییەکان (٧٠) هەزار دۆنم زەوی واتە حەوت هەزار هیکتار دابەش کرا. ئەم جۆرە ریفۆرمە ((ڕووکەشانە)) کە بەشێوەیەکی رادیکالییانە بنەما کۆمەڵایەتی و ئابوورییەکانی کۆمەڵگەی کوردەواری نەهەژاند، نەك تەنها ناڕەزایی کوردیان خامۆش نەکردەوە، بەڵکو بوونە هۆی ناڕەزایی زیاتر.

چالاکی و هەنگاوەکانی دەزگای پشکنینی گشتی هیچ یەکێ لە داخوازییەکانی کۆمەڵگەی کوردی تێر نە دەکرد و لە ڕاستیدا بەرژەوەندییەکانی هیچ توێژ و گرووپ و چینێکی ئەو کۆمەڵگەیەی لەبەرچاو نەدەگرت، نە جووتیارە جێنشینەکان و نە کۆچەرەکان، نە توێژی خوێنەوارانی کورد و نە بورژوازی بازرگانی کوردی و نە دەرەبەگ و فیۆداڵە کوردەکان، بۆیە نەیانتوانی بە هیچ شێوەیەك ناڕەزاییان بەرامبەر بە سیاسەتی دەسەڵاتدارانی ئەنقەرە هێور بکاتەوە. لە کۆتایی بیستەکاندا ئەم ناڕەزاییە بووە هۆی ڕاپەڕینێکی نوێی دژ بە دەسەڵاتی تورك لە چیاکانی ئاراراتدا. بەڵام ڕاپەڕینی ئاراراتیش وەکو

ڕاپەڕینەکانی پێشووی کوردان بە شێوەیەکی بێبەزەییانە و دڵڕەقانە لە لایەن دەسەڵاتدارانی تورکیاوە سەرکوت کرا. دوای دامرکاندنەوەی ڕاپەڕینەکە حکومەتی تورکیا لە پەیڕەوکردنی سیاسەتی دژ بە کورد بەردەوام بوو. بە بۆچوونی خۆی، دەبوایە ئەو سیاسەتە ڕێگا لە ڕاپەڕینی نوێی کوردەکان بگرێ. بۆ وەدیهێنانی ئەم بۆچوونەش هەر وەکو دوای ڕاپەڕینیساڵی (١٩٢٥) بەردەوام بوو لە ڕاگوێزانی زۆرەملێی کورد، بۆ نێوەڕاست و ڕۆژئاوای ئەنادۆڵ. قانونی ژمارە ٢٥١٠ دەربارەی ڕاگوێزان نیشانە و بەڵگەیەکی زەقی ئەو سیاسەتە بوو، کە لە (١٣ حوزەیرانی ١٩٣٤) لە لایەن پەرلەمانی تورکیاوە دەرکرا. ئەم قانونە، بە ناو بۆ تورکە ڕاگوێزراوەکان تەرخان کرابوو، بەڵام لە ڕاستیدا لە دژی کەمینە نەتەوەییەکان و بە تایبەتی دژی کورد دەرکرابوو. بە پێی ئەم قانونە تورکیا کرا بە سێ هەرێمەوە یەکەمیان: ئەو ناوچانەی دەگرتەوە کە دانیشتوانی خاوەن کولتوورێکی تەواو تورکین. دووەمیان: بۆ ئەو ڕاگوێزراوانە تەرخان کرابوو کە دەبوایە بخرانایەتە ژێر کارتێکردنی کولتووری تورکەوە. هەرێمی سێیەمیش: بریتی بوو لەو ناوچانەی کە گوایە لەبەرهۆی تەندروستی، ئابووری، کولتووری، سیاسی و سەربازییەوە ، هەروەها بۆ بەرقەرارکردنی سەروەری قانون و پاراستنی هێمنی، دەبوایە لە دانیشتوان چۆل بکرابایەن و نیشتەجێکردن و هاتوچۆیان تێدا قەدەغە بکرابایە. ئا لەم هەرێمەدا بە شێوەیەکی سەرەکی کورد دەژیا، واتە لێرەدا باس لە ڕاگوێزانی زۆرەملێی گشتی کوردەکان دەکرا.

سیاسەتی ڕەگەزپەرستانەی حکومەتی تورک باری سیاسی ناسەقامگیری کوردستانی ئاڵۆزتر دەکرد. سەرباری ئەوە چالاکی و هەڵسوکەوتی دەسەڵاتدارانی تورکیا ئەوەی نیشان دەدا کە ئەوان هەوڵی ئەوەیان دەدا ڕاپەڕینێکی تری گەورەی کورد بەرپا بێت بۆ ئەوەی بۆ هەمیشە لە دۆزی کورد ڕزگاریان بێت و لە نێوی بەرن.

لەسەر پێشنیازی موستەفا کەمال ناوچەکانی دێرسیم کران بە ویلایەتێکی تایبەت، لەگەڵ ڕژێمێکی بەڕێوەبردنی تایبەتیدا و نێوی تونجەلی لێنرا. لە (٦ حوزەیرانی ١٩٣٦) هەرێمێکی پشکنینی گشتی چوارەم پێکهێنرا و ئەم

ویلایەتانەی دەگرتەوە: ئەلیازگ (ئەلعەزیزی جاران)، تونجەلی (دێرسیم)، بینگیۆل واتە ناوچەکانی دێرسیمی جاران. لەم هەرێمەدا ڕژێمێکی بەڕێوەبردنی تایبەتی دامەزرا بە سەرۆکایەتی پشکێنەری گشتی جەنەڕاڵ عەبدوڵلا ئەلپ دۆغان.

جەنەڕاڵ عەبدوڵلا ئەلپ دۆغان فەرمانێکی بلاوکردەوە کە تێیدا باری جەنگی لە ویلایەتەکانی تونجەلی (دێرسیم) و ئەلیازگ و بینگیۆل ڕاگەیاند و داوای لە کوردەکان کرد، کە دەبێ (٢٠) هەزار چەك ڕادەستی دەزگاکانی دەوڵەت بکەن، لە حاڵەتی ملنەدان بۆ ئەو بڕیارە هەڕەشەی سزای توندی لێ دەکردن. هەموو ئەمانە کوردەکانیان تووڕە دەکرد و دەستیان کرد بە ڕاپەڕینی نوێ، کە جارێکی تر بە شێوەیەکی دڵڕەقانە دامرکێنرایەوە.

بە هەزاران ژن و منداڵ و پیری دێرسیم کوژران و بە دەیان هەزار ڕاگوێزران بۆ ویلایەتەکانی ڕۆژئاوای تورکیا. دەبێ ئەوەش بڵێین، کە ژمارەی ڕاستەوخۆی کوردە ڕاگوێزراوەکانمان لە ویلایەتەکانی ڕۆژهەڵاتەوە بۆ ڕۆژئاوا لەبەر دەستدا نییە، بەڵام دەتوانین لەبەر ڕۆشنایی کەرەستەکانی سەرژمێرییەکانی ساڵانی (١٩٣٥ و ١٩٤٠) بیان ژمێرین. ژمارەکان ئەوەمان بۆ دەردەخەن کە تەنها لە ویلایەتەکانی ئەلیازگ، ئەرزەرۆم، مووش و وان لە ساڵانی (١٩٣٥ بۆ ١٩٤٠) ژمارەی دانیشتوان (٢٨٠٣٣٨) کەس کەمی کردووە. ئەگەر ئەو ڕاستییەش لە یاد نەکەین کە دانیشتوانی تورکیا لەو ماوەیەدا بە ڕێژەی ١٠٪ زیادیان کردووە، ئەوا دەبوایە دانیشتوانی ئەو ویلایەتانە نەك تەنها کەمیان نەکردبایە، بەڵکو دەبوایە ژمارەیان ١٠٠ هەزار کەسێ زیادی بکردبایە.

بەو شێوەیە، ئەو کەمبوونەوەی دانیشتوان دەبێ بۆ ڕاگوێزانی هاوڵاتیانی کورد لەو ویلایەتانەوە بۆ ویلایەتەکانی ڕۆژئاوای ئەنادۆڵ لە لایەن حکومەتی تورکیاوە بگێڕینەوە، کە ژمارەیان خۆی لە ٣٧٠ هەزار کورد دەدا.

پرۆسە و چالاکی قانوندانانی دژ بە کورد لە تورکیا دوای شەڕی دووەمی جیهانیش هەر بەردەوام بوو، بە تایبەتی دوای کودەتای ساڵی (١٩٦٠). دەسەڵاتی تورکیا بە سەرۆکایەتی (کۆمیتەی یەکێتی نیشتیمانی)، کە لە دوای کودەتاکە پێکهێنرا، وەك پاشکۆیەکی قانونی ژمارە (٢٥١٠) قانونی ڕاگوێزان، قانونی ژمارە

(١٠٥) دەرکـرد، بـەپێی ئـەم قانونـە ئـەو خێزانـە کوردانـەی، کـە جێـی گومـانی حکومـەتی تورکیـا بـوون دەبوایـە بـە زۆر بـۆ ناوچـەکانی ڕۆژئـاوای تورکیـا ڕابگوێزرانایە.

لە سەر بناغەی ئەم قانونە وەزارەتی کاروبـاری نێوخـۆ داوای لـە والییـەکانی ویلایەتەکانی ڕۆژهەلأت (کوردستان) کرد، کە ئەو کوردانە خەریکی (چالاکی دژ بـە دەوڵەتن) دەستنیشان بکەن. هەر بە گوێرەی ئەو قانونە واتە قانونی ژمارە (١٠٥) لە (دیسەمەبەری ١٩٦١) (٥٥) کورد لە (ویلایەتەکانی ڕۆژهـەلأت) کـە لـە سـیواس زیندان کرابوون، ڕەوانەی ویلایەتەکانی ئەنتالیا، بوردور، ئیزمیڕ، موگڵە، ئـەفیون، ئیسپارتە، مەنیسە، چۆروم و دێنزلی کـران. ئەمانـە بـە شـێوەیەکی سـەرەکی ئـەو سـەرکردە کوردانـە بـوون کـە پێگەیـەکی دیاریـان لـە نێـو دانیشـتوانی کـوردا لـە کوردستانی تورکیا هەبوو. لە (٢٧ ئوکتۆبەری ١٩٦٠) کۆمیتەی یەکێتی نیشـتمانی قانونی ژمارە (١١٤)ی دەرکرد، بە گوێرەی ئەو قانونە١٤٧ پرۆفیسۆر و مامۆستای دانشگاکانی تورکیا لە کار دەرکـران. بەشـێك لەوانـە بـەوە گوناهبـار کرابـوون کـە هەوڵی دامەزراندنی کوردستانێکی سـەربەخۆیان داوە. لەگـەڵ ئـەوەی دەسـتووری سـاڵی (١٩٦١) لــە هەنــدێ لایەنــدا پێشــکەوتنی تێــدا بــوو، بــەلأم سروشــتی ڕەگەزپەرسـتێتی زۆر زەق بـوو و هـەوڵی ئـەوەی دەدا کـە مەسـەلەکە وا بخاتـە بەرچاو، کە لە تورکیا تەنها تورك دەژێن، لەبەر ئەوە دەبینین وشـەی (تـورك) زۆر بە فراوانی لێکدراوەتەوە، بێجگـە لەوانـەی کـە بـە یـەکێك لـەو زمانانـەی سـەر بـە گرووپی زمانـە تورکییـەکان قسـەدەکەن و بـە تـورك لـە قەڵـەم دران، لـە ڕاسـتیدا هەموو دانیشتوانی تورکیا بە کوردیشەوە بە تورك لە قەڵەم دران.

بەنـدی ژمـارە (٥٤) دەسـتوور بـەم شـێوەیە بـۆ مەسـەلەکە دەچـوو (هـەموو ئەوانـەی پەیوەنـدی هاوولأتێتییـان بـە دەوڵـەتی تورکیـاوە هەیـە تـورکن). لـە دەستووری (١٩٦١) گەلێ بۆچوون هەبوو، کە بە شێوەیەکی ڕاستەوخۆ یـاخود نـا ڕاستەوخۆ، دژی کەمینە نەتەوەییەکان بوون و دژی چارەسـەرکردنی دۆزی کـورد بوون. لەوێدا نووسرابوو کـە (دەوڵـەتی تـورك چ وەك نیشـتمان و چ وەك نەتـەوە، یەکە و قابیلی دابەشکردن نییە)، بەندی سێیەمیش ئەوە دەگەیەنێ، کە کورد نەك

تەنها ناتوانیّ لە تورکیا جیا ببێتەوە، بەڵکو ناتوانیّ تەنانەت ئۆتۆنۆمی نەتەوەییش لە چوارچێوەی کۆماری تورکیادا وەدەست بێنیّ.

کاربەدەستەکانی تورکیا هەوڵیان دا لە دوا دەستووری تورکیادا، فۆرمێکی قانونی بدەن بە سیاسەتی ڕەگەزپەرستانەیان بەرامبەر بە کورد، لە (٧ نۆڤەمبەری ساڵی ١٩٨٢) دا کە لە سێبەری دەسەلآتی سەربازیدا (ڕاپرسی) لەسەر ئەو دەستوورە کرا کە کودەتاچییەکان ئامادەیان کردبوو.

دەستووری (١٩٨٢) وەك لەوانەی پێشووتری خواستەکانی گەلی کوردی پشتگویّ خست و هیچ مافێکی نەتەوەیی پێیان ڕەوا نەبینی. جگە لەوە ئەم دەستوورە سیاسەتی تواندنەوەی کورد و کەمینە نەتەوەییەکانی تورکیای کرد بە قانون و کارێکی دەستووری کە لە لایەن کاربەدەستەکانی ولآتەوە پەیڕەو دەکرا. بە ناو دەستوور کە لافی یەکسانی هەموو هاوولآتیانی لە بەرامبەر قانون دەدا، بەلآم چاوخشاندنێك بە ماددەکانیدا ئەوە دەردەخات کە ئەو یەکسانییە بە هیچ شێوەیەك لە ئارادا نییە، هەروەها ئەوەمان بۆ دەردەخات کە بەندەکانی ئەو دەستوورە تا چ ڕادەیەك بە هەستێکی ڕەگەزپەرستییانەی تورکییەوە داڕێژراون.

بۆ نموونە بەندی ژمارە (٤٢)ی هەمان دەستوور دەڵیّ (هیچ زمانێکی تر، بێجگە لە زمانی تورکی، ناکریّ بخوێنریّ و وانەی پیّ بووترێتەوە لە قوتابخانە و دەزگاکانی خوێندندا وەك زمانی دایك سەیر بکرێت).

بە وتەیەکی تر مندالآنی کەمینە نەتەوەییەکان مافی ئەوەیان نییە بە زمانی زگماکی خۆیان بخوێنن، بەڵکو دەبیّ تەنها بە زمانی تورکی بخوێنن. ڕاستە لە هەمان بەندا باسی ئەوە دەکریّ کە (پێوەرەکانی پەیمانە نێودەوڵەتییەکان لەکاردا دەمێنن)، وا دیارە ئەم بڕگەیە باسی بەندەکانی پەیمانی لۆزان دەکات. وەك ئاشکرایە بەندەکانی (٣٧-٤٤) ی پەیمانی لۆزان بۆ پارێزگاری لە مافی کەمینەکان تەرخان کرابوون. لە ڕاستیدا تەنها کەمینە ناموسوڵمانەکانیان دەگرتەوە لەبەر ئەوە کوردەکان بەر پارێزگاری ئەم بەندانەی پەیمانەکەش نە دەکەوتن. بە وتەیەکی تر ئەم بەندانە بۆ دابینکردنی مافەکانی کورد نەبوون.

لـه كـاتي جيـاوازدا و لـه ناوچـهى جيـاوازى ولآتـدا نوێنـهرانى حكومـهت و كاربهدهسـتانى توركيـا فـهرمانيان دهركـردووه و دروشميـان بـهرز كردۆتـهوه و ئاگادارييان ههڵواسيوه و كۆبوونهوه و كهمپهينيان بهرپا كردووه بۆ قهدهغهكردنى قسهكردن به زمانى دى، جگه له زمانى توركى. ئهم سياسهته به پێى دهسـتوورى (١٩٨٢) فۆرمێكى دهستوورى و قانونى پێدراو كرا به بهندێكى تايبهتى دهستوور.

بهندى (٢٦) دهستوور لهم بارهيهوه دهڵێ (لهكاتى بلآوكردنـهوهى بۆچـوون و دهربڕينـى بيروبـاوهڕى خـۆ نـاكرێ يـهكێك لـه زمانـه قهدهغـهكراوهكان بـه كـار بهێنرێت). بهندێك به ناوهڕۆكێكى وا شۆڤێنييهوه، وا دهزانم له هيچ ولآتێكـى تـرى دونيادا نابينرێتهوه. ئايه قهدهغهكردنى زمان بـه زهبـرى قـانون چـى دهگـهيێنىٚ؟ زمان ئامێرى پهيوهندى و ئاڵوگۆڕى بيروباوهڕه له نێوان خهڵكدا، بىٚ زمـانيش نـه مرۆڤ و نه كۆمهڵ دهمێنێت. لهگهڵ ئهوهشـدا لێـرهدا زۆر ڕوون و ئاشـكرايه باسـى كام زمان دهكرىٚ. لێرهدا باس باسى زمانى كورديیه.

ئهگهر به وردى بڕوانينـه بڕگـهكانى دهسـتوور، ئـهوهمان بـۆ دهرئهكـهوىٚ كـه سـهرنجى نووسـهرانى دهسـتوور لـه لايـهنى سياسـييهوه دژى خـهباتى نهتـهوهيى ڕزگاريخوازى گهلى كورد و هێزه ديموكراتهكانى توركيا بووه.

شيكردنهوهى دهسـتوورى كۆمـارى توركيـا ئـهو مافـهمان دهداتـىٚ كـه بڵـێين دهسته ڕهگهزپهرستهكانى توركيا هێز و تواناى خۆيان له ڕێگاى قانونـهوه فـراوان كردووه بۆ پـهيڕهوكردنى سياسـهتى تواندنـهوهى گهلـه ناتوركـهكان، بـه تايبـهتى كورد. له ڕێگاى ئـهو دهستوورهشـهوه و بـه پشتبهسـتن بـهو دهسـتووره كهوتنـه گيانى گهلى كـورد، كـه بزووتنهوهكـهى لـه حـهفتاكان و ههشـتا و نهوهتهكانـدا بـه شـێوهيهكى ڕوون و ئاشـكرا بـهرهو پێشـهوه دهچـوو. بـارى نـا ئاسـايى لـه ويلايهتهكانى دياربهكر، سێرت، مێردين و ههكارى زياتر له (٩) ساڵ بهردهوام بـوو (١٩٧٨–١٩٨٧). له ساڵى (١٩٨٧) ئهو باره لابرا و له شوێنى ئهو بارێكى تر هاته كايهوه ئهويش به بڕيارێك كه هێزى قانونى ههبوو. بـه پێـى ئـهو بڕيـاره بهشـێكى گرنگى بـاكورى كوردسـتان بـه سـهرۆكايهتى واليیـهكى تايبـهت كـه (٨) ويلايـهتى دهگرتهوه، دياربهكر، سێرت، مێردين، ههكارى، دێرسيم، بينگوێل، وان و ئـهليازگ

